دەمێک لەگەڵ

# یاری غار


ئەدهەم شەرقاوی

وەرگێڕانی
ئازاد عەباس گڵێجەیی

ناوی کتێب: دەمێک لەگەڵ یاری غار
ناوی نووسەر: ئەدهەم شەرقاوی
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٠
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٩٠٤)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.



RENWEN

**ناوەندی ڕێنوێن**
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

**خوای گەورە منی نارد بۆ لای ئێوە**

**ئێوە وتتان: درۆ دەکەی...**

**ئەبوبەکر وتی: ڕاست دەکەی...**

**ئەبوبەکر بە ڕۆح و گیان و سەروەت و سامانەوە لە خزمەتمدا بوو...**

**ئێستا ئێوە دەتانەوێ واز لەم هاوڕێیەم بێنن و وازی لێ بێنم؟**

**پێغەمبەری خوا(ﷺ)**

❀ ❀ ❀

**من زیندوبم و لە ئایین کەم بکرێتەوە؟**

**ئەبوبەکر**

وریابــە قەڵــەم باســی ئەبوبەکــری صدیقــە
ئیــمانی کــە دەریایەکــی بێحــەدد و عەمیقــە
گوڵــزاری صەفابەخشــی دوو دونیایــە دیانــەت
صەددیقــە کــە لــەو گوڵشــەنەدا طورفــە، حەدیقــە
پیرێکــی جــەوان مــەردە لــە تەصدیقــی نەبیــدا
ئــەو عاشقە بەو عەشقە بڵێـن: عەشقی حەقیقە
بــازاڕی قیامــەت کــە بــکا وەزنی عەیــاری
دوڕی یەمەنــە، لەعــلی بەدەخشــانە، عەقیقــە
هەرکــەس کــە نەبــێ بــاوەڕی بــەم صادیقــە پیــرە
ســەد دەفعە ئەگەر ئەهــلی طەریقەت بێ طەریقە

حەمدی

❀ ❀ ❀

خصـوص خەلیفەیـی یەکەم ڕەئیسـی فیرقـەی ئیهتیدا
کـە ئەو بوو کردی گیـانی خۆی لە ڕێی صەداقەتدا فیدا
کەسێ کـە پێـی موبارەکـی بخاتـە ژاری ئەژدەهـا
لەبـەر ڕەسـولی موحتـەرەم، نـەوەک گەزەنـدە پێی بگا
یەقیـن بزانـە ئیشـی وا لـە ئیشـی یـاری غـار ئـەکا

بێخود

بَ-دا الفَ-نا ، بِ-ذا الفِنا ، بِ-ذي الفَنا　　ف-ي رَبِّ--هِ ، نبِيُنْ-ا ، ث--مَّ دنَ-ى

لي-س س-وى م--رت-ب-ةِ الت-صديقِ　　بع-د نبـووة ع-ل-ى الـت-ح-قـي-ق

م-عْ أنَّ-ه الأت-ق-ى والأتـقـى الأكـرم　　والأك--رم الأفـض-ل والمـع-ظ-م

و ذاك عــب---دالــلَ-ه وال-ع-تــي-ق　　اب-ن أب-ي ق-ح-اف-ة الص-دي-ق

ف--أيـن وصـفـي مــن حِـلاهُ ، ل-ك-ن　　في ذِكرِ م-ن صلـح فـيـض مـسـتـكـن

مەولەوی تاوەگۆزی

❀ ❀ ❀

بـە فەضڵـی حـەزرەتی ئەبوبەکـری صدیـق

کـە ئەفضڵ پاش نەبـی ئەو بوو بە تەحقیق

هەمـوو ئیـم-انی ئوممـەت ن-زم و بـەرزی

کەفـەی ئیمانی هەڵنابـڕن لـە عـەرزی

کـە دۆخـی شـیری بـۆ کوفـریێ نەبـا سـەد

کەمـی مابـوو مسوڵمان ببنـە مورتـەد

ئـەوە (ثـاني اثنيـن) ی--اری غ--ار ئ--ەو

لـە ڕێـی جـانی جیهانـدا گیـان نثـار ئـەو

هەژاری موکریانی

## فەرهەنگۆك

ئاپۆرا: پڕایی خەڵک، عاممەی خەڵک.

ئاتاج: موحتاج، هەژار.

ئاخ: زەوی، خاک.

ئافاقە: سووکبوونی نەخۆشی، سەرەتای چاکبوونەوە لە نەخۆشی.

ئاویلکە: دەمی مردن، دوادوایی ژیان.

ئۆردو: شوێنی مانەوەی سوپا و هێز و لەشکر.

ئەمەک: وەفا.

بەرپیوار: غەیب، نادیار.

تا: نەخۆشییەکە پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە.

تەتەڵە: ئەو شتە ساف و پانەی کە نووسراوی لەسەر دەنووسرێ، لەوح.

تووک: نزای شەڕ و خراپ.

پلپلە: خشڵ و زێڕ و زیو بۆ جوانی.

پەرا: خزمەت، لە پەرادام، واتە: لە خزمەتتام.

پەرجوو: کارێک کە تەنیا لە دەست پێغەمبەران دێ، موعجیزە.

پەسڵان: ڕۆژی دوایی، قیامەت.

پەسن: باسکردن بە چاکە، پێچەوانەی: خوسپ.

پەیوین: قسەکردن، گفتوگۆ.

پیرەک: پیرەژن.

جوقەوار: گیانلەبەر، زیندەوەر.

جەموجۆر: ئامادە.

جەنگە: گەرمە، وەرز، هەڕەت.

چتۆ: چۆن، چۆنچۆنی، بە کام شێوە؟

چتیر: گیسکی مێنگە کە هێشتا نەبووە بە بزن.

چۆرتم: موسیبەت، پێشهاتی ناخۆش.

چەپەڵ: پیس، ناپاک.

چێبوون: چاکبوون.

چەل: جار، ئەم چەلە واتە: ئەمجارە.

حەوسەڵە: توانا و تاقەت، پشوودرێژی.

خشڵ: زێڕ و زیوێک کە ژنان و پیاوان بۆ خۆڕازاندنەوە بەکاری دێنن.

خوسپ: باسکردن بە خراپە، لە پاشملە باسکردن، زەمکردن.

خوناوکە: ملوانکە.

خەنیم: دوژمن.

دەوار: ڕەشماڵ، کردیانە ملیان سەرکەلەی دەوار، پێوە دەگەڕان هەوار بە هەوار.

دزێو: ناشیرین، ناحەز، خراپ.

ڕەقەکار: مرۆڤی باڵابەرزی لاواز.

ڕووگە: قبلە، ئەو شوێنەی مسوڵمانان لە کاتی نوێژدا ڕووی تێدەکەن، ماڵی خوا.

زۆزان: کوێستان، پێچەوانەی گەرمیان.

زەنگین: دەوڵەمەند، دارا.

سڵسڵە: بڕوانە: پلپڵە.

سوو: ڕیبا، ئەو ماڵە زیادەیەی کە خاوەن قەرز لە قەرزاری دەسێنێ.

سەرگەشتە: وڕ و کاس، حەپەساو.

سەکەت: کوژراوی دوژمن، مردنی ئەوانەی کە بە ناهەق کوشت و کوشتار دەکەن، پێچەوانەی شەهید.
سەرخەوشکاندن: کەمێک خەوتن بۆ پشوودان.
شەوەق: شەبەق، بەری بەیانی.
شێردڵ: پیاوی زیرەک و چاونەترس.
فاتەڕەش: تاڵگ، سپڵ.
فوو لە دۆ نەکردن: بریتییە لە کردنی کارێک بەبێ ئەوەی بیری لێ بکەیتەوە و لێکی بدەیتەوە.
فەرامۆش: لەبیرچوون.
قامی قیامەت: کۆتایی دونیا، هاتنی پەسڵان، هەتا قامی قیامەت ئاە و واوەیلا نەکەم چ بکەم؟- مەحوی.
قرم خۆشکردن: تەماکردن لە شتێ.
کلبوون: لادان لە ڕێگا، گومڕابوون.
کەوا: جببە، باڵاپۆشی ئاودامانی پیاوانە.
گت: وەستانێکی کەم و کورت و لەناکاو.
گوێڵ: دومشت لە شتێک، گوێڵێ گەنم: دوو مشت گەنم.
مکوڕ: سووربوون لەسەر کارێک.
ناحەز: دزێو، خراپ، ناشیرین.
نەخاسمە: نەخوازە، بەتایبەت.
نەفرەت: بڕوانە: تووک.
هەتیتە: پارچە پۆلایەکی کون کونە، زێڕینگەران تاڵە زێڕی پێ دەگوشن و پێی ڕاست دەکەنەوە.

## به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

**وریابە قەڵەم باسی ئەبوبەکری صدیقە**

**ئیمانی کە دەریایەکی بێحەد و عەمیقە**

حەمدی گەورە شاعیری کورد زۆر ڕاستی فەرمووە، ئەگەر مرۆڤ بیەوێ چەند دێڕێک لەسەر حەزرەتی ئەبوبەکر بنووسێ، دەبێ هەم خۆی و هەم قەڵەمەکەی تەواو وریا بن...

بۆیە کاتێ ئەم دێڕانە دەنووسم دەستم دەلەرزێت...

ئاخر چۆن دەست و قەڵەم نەلەرزن کاتێ بیانەوێ باسی کەسێک بکەن کە خۆی بە تەنیا چینێک بووە لە مرۆڤایەتی... لەنێوان پێغەمبەران و خەڵکی ئاساییدا بووە... کەمێک لە خوار پێغەمبەرانەوە و زۆرێک لە سەرووی مرۆڤەکانی ترەوە...

خوێنەری ئازیز... ئەم کتێبەش دیسان بەرهەمێکی نوێی نووسەری لاو (ئەدهەم شەرقاوی)یە... ئەمجارە باس لە زاتێکی گەورە و مەزنە... ڕێک وەک کتێبی (ئەو دەمەی گەشتم بە عومەر)، ئەو کتێبەش نووسراوە... بۆیە چێژێکی تایبەتی هەیە و مرۆڤ کاتێ دەست بە خوێندنەوەی دەکات حەز دەکات هەتا کۆتایی کتێبەکە وازی لێ نەهێنێ...

لەوانەیە کوڕێک، یان کچێکی لاو دەستی بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە کرد، دایکی دوو سێ جار بانگی بکات و بڵێ: ڕۆڵە زووبە خواردنەکەت سارد بووەوە... ئەویش نەتوانێ واز لە کتێبەکە بێنێ و بڵێ: دایە گیان برسیم نییە، ئێوە نانی خۆتان بخۆن...

بەڵێ... ئەم کتێبە شیاوی ئەوەیە مرۆڤ بۆ خوێندنەوەی واز لە نانخواردن و قسە کردن و هەموو کارێکی تر بێنێ، چونکە باس باسی حەزرەتی ئەبوبەکرە... باسی ئەو گەورە پیاوە کە پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو بووە هۆکاری ئەوەی ئەم ئایینە وەک خۆی بمێنێتەوە و هیچی لێ بەسەر نەیەت...

لەم کتێبەدا ژیانێکی پوختی ئەو کەڵە پیاوە دەخوێنیتەوە...

وەڵامی درۆودەلەسەی ئەو کەسانە وەردەگریتەوە کە چاویان بەرایی نادا ئایینی ئیسلام ببینن، بۆیە تۆمەت و درۆیان بۆ ئەم زاتە هەڵواسیوە...

نازانم چی بڵێم و چی بنووسم...

قەڵەم کۆڵە...

دەست لەرزۆکە...

هەموو وشەکان هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەموویان دەیانەوێ بە یەک پژمە بێنە دەرەوە و هیچ وشەیەک ڕازی نابێ لە دواوە بێت...

نووسین لەسەر زاتێکی وا کەرامەتێکی دەوێ وەک پەرجوو وابێ...

بۆیە تەنیا ئەوەندە دەڵێم: یاخوا دەستت خۆشبێ کاک ئەدهەم... خامەت ڕەنگین... خەرمان بەرەکەت...

بە تۆی خوێنەریش دەڵێم: زۆر بە جوانی بیخوێنەوە و لێی ورد بەوە... نزایەکی خێریش بۆ ئەو وەرگێڕەی براتان بکەن...

براتان: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی

گوندی قەرەگۆل- شارەزوور

٢١- ٩ - ٢٠٢٠

پێش هەموو شت...

لە دوورڕا هات... بۆن و بەرامەی بارانی سەرەتای پاییزی دەدا...

عارەبێکی پاک و پوخت بوو...

ڕەقەکارێکی بالآبەرز... دەتگوت لاسکی گوڵەگەنمە...

لاقەکانی باریک و ڕێک... دەتگوت لاقی پیاوی خێرا و کۆڵنەدەرە...

بەڵام هەستت بەوە دەکرد ئەم پیاوە هێندە خێرایە، کەس ناتوانێ پێشیکەوێ...

پشتی کەمێک چەماوە بوو... دەتگوت بە درێژایی ژیانی کۆڵێکی قورسی پێبووە. دەموچاوی خڕ و سپی... دەتگوت مانگی شەوی چواردەی نیوە شەوی دەشت و سەحرا و بیابانە...

لە نیگایڕا وا دەردەکەوت هیچ کەسێ ئەو کۆڵەی ئەوی پێ نابزوێ...

ڕیشێکی جوان... خەنە و وسمەی تێگرتبوو... ڕەنگێکی ئاڵی جوانی بوو... دەتگوت تیشکی زەردەپەڕە...

جلوبەرگێکی کۆنی بوو، بەڵام پیاوێکی بەسام بوو...

ویستم بچم لێی بپرسم: قوربان تۆ کێی؟

بەڵام هێندە بەهەیبەت بوو، وشەکانم لا قەتیس بوون...

زۆر لێم ڕوانی... بێدەنگییەکەم ئازاری دام... حەزی ناسینی ئەو پیاوە بوو بە مۆکلە و گیانی گوشیم...

لێم هاتە پێش... خەم و مۆکلەی لێ ڕەواندم... ڕووی تێکردم، فەرمووی: سڵاو...

پیتەکانی هێندە بە جوانی دەربڕی دەتگوت دەنگی ئیسماعیلە...
دەنگێکی خۆش... هێندە نەرم و پڕ ئەوین بوو، وەک دەنگی دایکێکی بەسۆز...
وەکو دەنگی مەنشاوی بوو، کاتێ سورەتی ئەلرەحمان بە دەنگێکی خۆش دەخوێنێ...
بە خێرایی دەنگم بەربوو... لە وەلامدا وتم: سلاو...
فەرمووی: کوڕم تۆ چ کەسی؟
وتم: قوربان من عەرەبم... ئەی جەنابت؟
+ ئەبوبەکرم...
- ئەبوبەکری تۆڵەئەستێن؟ ئەوەی دوای وەفاتی حەزرەت تەمێی ئەو کەسانەی دادا کە لە ئایین وەرگەڕابوون؟
+ ئەبوبەکر... دووهەمینی دوو کەسەکەی نێو ئەشکەوتم... هیچم هێندەی ئەو نازناوە پێخۆش نییە، کە خوا پێیدام...
بەڵێ ئەمە ئەبوبەکرە... ئەو کەسەیە لە پێشبڕکێی بەرەو خواچوون هیچ کەسێک پێشی ناکەوێ... ئەو کەسەیە کە ئیسلامی لەسەر کۆڵ نا... ئەو کەسەیە کە هیچ کەسێ پێی نەگەیی... پێی ناگەیێ...
لە خزمەتی ئەبوبەکردام، پیاو نازانێ چ پەسنێکی ئەو باس بکات؟
من لە خزمەت پەرجوویەک بووم... لە گۆشت و خوێن چێ کرابوو...
هەموو ڕۆژێک مرۆڤ پەرجوو نابینێت و بە خزمەتی پیاوی ئاوا گەورە و هێژا شاد نابێت و قسەی لە خزمەتدا ناکا...
لە پاش ئەمە...
دوای ئەوەی پێغەمبەران کۆتاییان پێ دێ، ئیتر ئەبوبەکر دەست پێ دەکا...

کاتێکیش ئەبوبەکر تەواو دەبێ، ئیتر خەڵک دەست پێ دەکا...
بەڵێ... ئەبوبەکر بەو جۆرەیە... خۆی بە تەنیا چینێکی سەربەخۆیە...
هەمیشە لە پێشەوەیە... هیچ کەسێک ناتوانێ لە خواپەرستیدا کێبڕکێی لەگەڵدا بکات...
کاتێ کار گەیشتە ئەوەی پیاو دڵاوایی و سەخاوەتی خۆی دەربخا، حەزرەتی عومەر (ﷺ) نیوەی سەروەت و سامانەکەی خۆی هێنا و پێی وابوو ئەمجارە پێش حەزرەتی ئەبوبەکر دەکەوێ... کەچی دوایی بۆی دەرکەوت کە حەزرەتی ئەبوبەکر پێش ئەو هەموو سەروەت و سامانەکەی خۆی هێناوە...
کاتێکیش کار دێتە سەر دلێری و چاونەترسان و گیانبەخشین لە ڕای خوادا، دیسان حەزرەتی ئەبوبەکر(ﷺ) وەک هەموو جارەکانی تر لە پێشی پێشەوەیە...
کاتێ ناوی حەزرەتی ئەبوبەکر دەهێنرێ، هەموومان یەکسەر پیاوێکی زۆر نەرمونیان و بەسۆزمان بیر دێتەوە... ئەمە ڕاستە، چونکە بە شایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزرەتی ئەبوبەکر بەسۆزترین کەسە بۆ مسوڵمانان...
کاتێکیش باسی دلێری و گورجوگۆڵی و توندی دێتە ناو باسان، یەکسەر بیرمان بۆ لای حەزرەتی عومەر دەچێ... ئەمەش هەر دروستە، بەڵام زۆر جار حەزرەتی ئەبوبەکر لە هەموو هاوەڵان بە حەزرەتی عومەریشەوە بەهێزتر و دلێرتر و خۆڕاگرتر بووە...
حەزرەتی ئەبوبەکر هێزێکی نەرمونیان بوو... ئەوەندە نەرم بوو، مرۆڤ وایدەزانی هەرگیز توند نابێ... هەرگیز تووڕە نابێ، بەڵام کاتێ کار دەگەیشتە ئەوەی کە توندی پێویست بایە ئەو نەرمونیانییە هەمووی دەبوو بە توندی... ئیتر کەسی بەرامبەر دۆست بایە، یان دوژمن ئەو

**قسەی خۆی هەبوو... بە کورتی حەزرەتی ئەبوبەکر ئەو ئاسکە ناسکە بوو کە لە کاتی پێویستدا سەد شێری شەرزە پێیان نەدەوێرا...**

**دەڵێی گەورە شاعیری کورد (مەلا خدری نالی) ئەم شیعرەی بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر نووسیوە:**

**ئەلا ئای ئاسکی ناسک بە باسک**

**شکاندت گەردنی سەد شێری شەرزە!**

بۆ ئەوەی قسەکەمان بێ بەڵگە نەبێ و هەروا تفەنگ بە تاریکییەوە نەنێین، با تەماشایەکی حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر بکەین...

(پەنا بە خوا) مەبەستمان سوکایەتیکردن بە حەزرەتی عومەر نییە، حەزرەتی عومەر حەزرەتی عومەرە... سەری من و هەزارانی وەک من بۆ ئەوە باشە ببێ بە بەردەبازی بەرپێی حەزرەتی عومەر، بەڵام هەموومان دەزانین کە حەزرەتی عومەر چەندێ توندوتۆڵ بووە... کەچی هێشتا نەگەیشتووە بە حەزرەتی ئەبوبەکر... من بۆیە باسی ئەو دوانەتان بۆ دەکەم مەبەستمان ئەوەیە ئەو هێزە نەرمونیانەتان پێ بناسێنم... تا بزانین حەزرەتی ئەبوبەکر چەندێ نەرمونیان بووە هێندەش توندوتۆڵ بووە...

حەزرەتی ئەبوبەکر وەکو گوڵ نەرمونیان بوو، بەڵام دڕکی زۆر بەهێزیشی هەبوو...

با بزانین چۆن؟

لە جەنگی (حودەیبیبە)دا هاوەڵان هەموویان تووڕە ببوون... ئەوەش لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بوو، چونکە خاڵەکانی ئەو ڕێکەوتنەیان بە لاوە شکستخواردن بوو... تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە بە قسەی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) نەکرد... کەس هەڵنەسا بۆ ئەوەی سەری خۆی چاک بکات و ئەو ئاژەڵەی کردویەتی بە

دیاری سـەربڕی و ئیحـرام بشـکێنێ...

پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی بردەوە نێو چادرەکەی... بە دایکی ئیماندارانی (ئومـو سـەلەمە)-ی فەرمـوو: ئوممو سـەلەمە ئەوانـە بـۆ وادەکـەن؟

ئوممو سـەلەمە فەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! دەی ئـەوە دەکـەن کـە دەیبینی، تـۆ خـۆت قسـە لەگـەڵ هیـچ کەسـێکیاندا مەکـە و هەسـتە ئـەو ئاژەڵـەی کردووتـە بـە دیـار سـەری ببڕە و سـەرت چـاک بکـە... ئەگـەر تـۆ خـۆت واتکـرد، ئەوانیـش هەڵدەسـتن و وا دەکـەن...

پێغەمبـەر(ﷺ) هەسـتا و قسـەی لەگـەڵ هیـچ هاوەڵێکدا نەکـرد و ئاژەڵەکـەی خـۆی سـەربڕی و سـەری چـاک کـرد...

کاتێ هـاوەڵان پێغەمبەریـان(ﷺ) بینـی، ئیتـر ئەوانیـش هەسـتان و ئاژەڵـی خۆیـان سـەربڕی و سـەری خۆیـان چـاک کـرد...

حەزرەتـی عومەریـش وەک هەمـوو هاوەڵەکانـی تـر، لەبـەر ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە. ئـەوێ ڕۆژێ زۆر تـووڕە بـوو، بـەڵام حەزرەتـی ئەبوبەکـر خـۆی بـە تەنیـا دەسـتەیەک بـوو...

حەزرەتـی عومـەر هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) هەمـوو گیانـی پڕ بـوو لـە خۆشەویسـتی بـۆ خـوا و پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)... لەبـەر ئـەوەی (بـە ڕواڵـەت) ئـەوان دۆڕابـوون تـەواو تـووڕە بـوو... بـە پێغەمبـەری وت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! مەگـەر ئێمـە لەسـەر هـەق نیـن؟ مەگـەر ئـەوان ناهـەق نیـن؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: با...

حەزرەتـی عومـەر وتـی: مەگـەر کوژراوەکانی ئێمە ناچنە بەهەشت؟ کوژراوەکانی ئەوان ناچنە دۆزەخ؟

فەرمووی: با...

حەزرەتی عومەر وتی: دەی بۆ ئێمە سەر کز بکەین و بگەڕێینەوە؟ خۆ لەنێوان خۆمان و ئەواندا خوای گەورە هیچ بڕیارێکی نەداوە...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: کوڕی خەتتاب گوێ بگرە! من پێغەمبەری خوام... خوای گەورە تەفروتونام ناکات... سەرکزم ناکا...

حەزرەتی عومەر خۆی پێ ڕانەگیرا و بە تووڕەییەوە ڕۆیشت... گەیشت بە حەزرەتی [ئەبوبەکر و پێی وت: ئەبوبەکر! مەگەر خۆمان لەسەر هەق نین؟ مەگەر ئەو کافرانە ناهەق نین؟

حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: با...

حەزرەتی عومەر وتی: مەگەر کوژراوەکانی ئێمە ناچنە بەهەشت؟ کوژراوەکانی ئەوان ناچنە دۆزەخ؟

حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: با...

حەزرەتی عومەر فەرمووی: دەی بۆ سەری خۆمان کز بکەین؟

حەزرەتی ئەبوبەکر وتی: کوڕی خەتتاب! ئەو پیاوە پێغەمبەری خوایە... خوای گەورە لەناوی نابات، خۆت ڕابگرە و ئارامبە...

ئەمە یەکێک بوو لە خاڵە بەهێزەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر... (خۆتەسلیمکردن بە فرمانی خوا و پێغەمبەری خوا بەبێ لێکۆڵینەوە و پرس و وەلام...

بەڵێ خۆتەسلیمکردن زۆر جار هێزێکی زۆر مەزنی دەوێ. هێزێک زیاتر بێ لە هێزی لێپرسینەوە و گفتوگۆکردن...)

ڕۆژگار سوڕا... هەمووان بۆیان دەرکەوت ئەو ئاشتەواییەی کە بە سەرکزییان دەزانی بوو بە سەربەرزییەک و سەرکەوتنێکی زۆر مەزن...

هێزە نەرمونیانەکەی ئەبوبەکر ئاوا سەرکەوت...

ئەو دەمە کە دایە عایشە لە ژوورەکەی درەنگ هاتە دەرەوە و دوایی پڕخەمترین وشەی سەرزەوی لە دەم هاتە دەرێ... وتی: پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد...

حەزرەتی عومەر بڕوای پێ نەکرد... ئاگای لە خۆی نەما... لەناو مزگەوتدا دەسووڕایەوە و هاواری دەکرد و دەیگوت: پێغەمبەری خوا وەفاتی نەکردووە، بەڵکوو وەکو حەزرەتی موسا بۆ گفتوگۆ ڕۆیشتووە...

دوایی شمشێرەکەی هەڵکێشا و دەیگوت: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگەڕێتەوە... جا هەر کەسێ پێی وابێ وەفاتی کردووە دەست و لاقەکانی دەبڕێتەوە...

بەخوا حەزرەتی عومەر ناهەقی نەبوو... ئەوەتا من دوای هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵ دوای وەفاتی پێغەمبەر ئەم وشانە دەنووسم ئازاری وەفاتی پێغەمبەر خەریکە مەستم دەکا... خەریکە بیر و هۆشم لە سەردا ناهێڵێ... دڵم خەریکە لە قەفەسی سینگم دێتە دەرێ...

من دوای هەزار و چوارسەد ساڵ هێشتا ناتوانم بە خۆمی بسەلمێنم کە پێغەمبەر(ﷺ) لەناو گۆڕدایە... بە خۆڵ داپۆشۆراوە...

ئەی ئەگەر ئەوێ ڕۆژێ لەوێدابام و کتوپڕ ئەو هەواڵەم ببیستایە؟

بەڵام ئەبوبەکر کەسێکی تر بوو... ئەو جۆرێکی تر بوو... کات کاتی ئەوە نەبوو نەرمونیانی کارەکە چارەسەر بکات، بەڵکوو کات کاتی ئەوە بوو توند بێ...

ئەبوبەکر هەمیشە وابوو... ئەگەر کات کاتی نەرمونیانی بووایە، ئەو نەرمونیان بوو... ئەگەر توندی پێویست بایە، ئەو توند بوو...

حەزرەتی ئەبوبەکر هاتە نێو مزگەوتەوە... دەبینێ عومەر لەوپەڕی تووڕەییدایە و زۆر خەمبارە و هەر خەریکی هەڕەشەکردنە...

حەزرەتی ئەبوبەکر قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکرد... یەکسەر بەرەو ژوورەکەی دایە عایشە ڕۆیشت... لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزیک بوویەوە... داپۆشرا بوو... چەرچەفەکەی لەسەر

ڕوومەتی پیرۆزی لادا و ماچی کرد و وتی: خۆم و دایک و بابم بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا... بە زیندویی و بە مردووییش چەندێ پاک و بێگەردی... ئەو مردنەی کە خوای گەورە لە چارەی نووسیبوویت چەشتت... ئیتر هەتا هەتایە جارێکی تر نامری...

دوایی چەرچەفەکەی دایەوە بەسەر ڕوومەتی پێغەمبەردا(ﷺ) و ڕۆیشتە ناو مزگەوتەوە...

حەزرەتی عومەر هەروا هاواری دەکرد و هەرەشەی دەکرد...

حەزەرتی ئەبوبەکر فەرمووی: عومەر هێمن بە... بێدەنگ بە...

حەزرەتی عومەر گوێی بۆ نەگرت و درێژەی بە قسەکانی دەدا...

حەزرەتی ئەبوبەکر زانی بێدەنگ نابێ گوێی نەدایە و ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی:

(هۆ خەڵکینە... ئەو کەسەی محەمەدی(ﷺ) دەپەرست، ئەوا موحەممەد وەفاتی کرد... هەر کەسێکیش خوای گەورە دەپەرستێ، ئەوا خوای گەورە زیندووە و هەرگیز نامرێ...)

دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمـران: ١٤٤

واتە: (محەمەد(ﷺ) تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە)، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد، یان کوژرا و شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟ (لەو دین و ئاینەی کە پێی ڕاگەیاندوون؟) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەز بێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بە خوا ناگەیەنێت، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە.

ئیتر خەڵکەکە بۆیان دەرکەوت کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە...

ئەگەر حەزرەتی ئەبوبەکر کەسێکی نەرمونیان بووایە و هیچ توندییەکی تێدا نەبووایە، دەبوو ئەو پێش هەموو کەسێ بەو کارەساتە بڕوخێ و ئاگای لە خۆی نەمێنێ... ئەوەتا عومەری توندوتۆڵ ئاگای لە خۆی نەما...

بەڵام ئەبوبەکر هێزێکی پۆڵایین و نەرم بوو...لە کاتی نەرمیدا نەرم و لە کاتی توندیدا پۆڵا بوو... بۆیە سەیر نەبوو کە ئەو لە هەموو هاوەڵێک نەرمونیانتر و پۆڵایینتر بێ...

بەڵێ ئەو ئەبوبەکر بوو... خۆی بە تاق و تەنیا وێنەیەکی جیاواز بوو...

ئەو ڕۆژەش کە حەزرەتی ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە و جێگەداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەشێکی زۆر لە عەرەب لە ئایینی ئیسلام پاشگەز بوونەوە، دیسان هێزە پۆڵایینە نەرمەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر دەرکەوتەوە...

کۆڕێکی گەورەی هاوەڵان خڕ بوونەوە تا بزانن چی بکەن بەو کەسانەی کە پاشگەز بوونەوتەوە؟

هەموو ژەنەڕاڵەکانی یەکتاپەرستی فەرموویان: با گفتۆگۆیان لەگەڵدا بکەین...

بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر بە تاک و تەنیا بڕیاری جەنگی دەرکرد...

ئەو پیاوە دڵنەرمەی کە هەمیشە قورئانخوێندنەوە دەیگریاند، ئەوێ ڕۆژێ بڕیاری دەرکرد مسوڵمانان زری بپۆشن و سواری ئەسپەکانیان ببن و تیر و شیر بگرنە دەستەوە و لەپێناو خودای مەزن بجەنگن...

حەزرەتی عومەر فەرمووی: تۆ چۆن لەگەڵ کەسانێکدا دەجەنگی کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویێتی: فرمانم پێ کراوە جەنگ لەگەڵ خەڵکدا بکەم هەتا ئەو دەمەی دەڵێن: لا الە الا اللە... ئەگەر وشەی شادەیان بە زاردا هات ئیتر خوێن و ماڵی خۆیان لە من حەرام کردووە مەگەر بە هەقی خۆی نەبێ...

حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: سوێند بە خوا لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەجەنگم کە جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژ و زەکاتەوە... سوێند بە خوا هەرکەسێ لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ڕەشۆی وشترێکی دابێ بە زەکاتدا و ئێستا نەیدا لەگەڵیدا دەجەنگم...

حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا! کەمێک دڵت نەرم بێ و نەرمی بنوێنە...

حەزرەتی ئەبوبەکر یەخەی حەزرەتی عومەری گرت و فەرمووی: عومەر! چۆن دەبێ کەسێک لە سەردەمی نەفامیدا سەربەرز و توند بێ، کەچی لە سەردەمی ئیسلامدا سەرکز و سەرنەوی بێ؟ تازە ئیتر سروش و وەحی تەواو بوو... ئایین کامڵ بوو... من زیندوو بم و لە ئایین کەم بکرێتەوە؟ شتی وا مەحاڵە و نابێ و ناکرێ...

پشتیان بە خوای گەورە بەست و ڕۆیشتن... تەمێی هەموو ئەوانەیان کرد کە پاشگەز ببوونەوە... هەموو تیرە و هۆزەکانیان هێنایەوە ژێر ڕکێفی ئایینی ئیسلام... ئەوێ ڕۆژێ ئەبوبەکر ئەوەی سەلماند کە لەژێر ڕۆشنایی تیشکێکی خوداییدا شت دەبینێ...

بەڵێ ڕاستە ئەو چەندێ لە گوڵ نەرمترە، بەڵام لە بەردیش ڕەقتر و سەختترە...

ئۆی بمبوورن نەمزانی... خۆ حەزرەتی ئەبوبەکر خۆی تەشریفی لێرەیە... خۆی دەتوانێ لە خۆی بدوێ و باسی خۆی بۆ ئێوە بکات...

هیچ ئەوەندەی ئەوە خۆش نییە چیرۆک لە دەمی کەسێک ببیستی کە خۆی خاوەنی ئەو چیرۆکە بێت... ئیتر بۆ من قسان بکەم؟ با من هەر لێی بپرسم... وا ڕوو لە خۆی دەکەم و لێی دەپرسم:

- ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا! سەرەتا کەی و چۆن گوێت لە ئایین بوو؟

+ بەڵێ کورم... یەکەمجار کە گوێم لەم ئایینە بوو، ڕۆژێک بوو لە پەنا کەعبەدا دانیشتبووم... کەمێک لەولای منیشەوە زەیدی کوڕی عەمری نوفەیلی دانیشتبوو... ئومەیەی کوڕی باوکی صەڵت پێی وت: کاکی چاکەخواز چۆنی؟

وتی: باشم...

ئومەیە وتی: دەستت کەوت؟

وتی: نەخێر... بەردەوام دەچم بە دوایدا...

کە گوێم لە قسەکانیان بوو هەستام و چووم بەدوای (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)دا گەڕام... وەرەقە زۆر سەیری ئاسمانی دەکرد... زۆر بیری دەکردەوە و لەگەڵ دڵی خۆیدا وتووێژی دەکرد...

وەرەقەم بینییەوە... وتووێژەکەی نێوان زەید و ئومەیەم بۆ گێڕایەوە...

وەرەقە فەرمووی: بەڵێ برازا... پێغەمبەرێک لە بنەماڵەیەکی ڕەسەنی عەرەب پەیدا دەبێ... من زانستی نەسەب دەزانم... بنەماڵەکەی تۆ ڕەسەنترین بنەماڵەی عەرەبە... ئەو کەسە لە بنەماڵەکەی ئێوەیە...

- باشە هۆکار چی بوو کە زەید و ئومەیە ئاوا باسی پێغەمبەرێکیان دەکرد؟ پێم سەیرە دوو پیاوی قورەیشی بتپەرست لەنێوان خۆیاندا باس و خواسی کوتا پێغەمبەر بوروژێنن...

+ ئەو دوو پیاوە لەسەر ئایینی قورەیش نەبوون...

- چۆن؟ ئەی لەسەر چ ئایینێک بوون؟

+ زەیدی کوڕی نوفەیل ڕقی لە ئایینی قوڕەیش بوو... ئەو پەرستشەی ئەوانی بە پەرستش نەدەزانی، بەڵکوو بە شیرک و خراپی دەزانی... بۆیە پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کۆچی کرد بۆ شام... بەدوای ئایینی ڕاستەقینەدا دەگەڕا... لەوێ چاوی بە زانایەکی جوولەکە کەوتبوو... پێی وتبوو: باسێکی ئایینەکەی خۆتانم بۆ بکە، بەڵکوو شوێنی بکەوم...

جوولەکەکە وتبووی: هەتا بەشە سزایەکی خوا وەرنەگری ناتوانی بێیتە سەر ئایینی ئێمە...

زەید وتبووی: جا خۆ من بۆیە هاتووم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی لە دەست سزای خوا ڕابکەم... من بەرگەی سزای خوا ناگرم... دەی شتێکی ترم پێ نیشان بدە...

جوولەکەکە وتبووی: جگە لە ئایینی حەنیفی نەبێ، هیچ ئایینێکی تر شک نابەم...

زەید وتبووی: ئایینی حەنیفی چییە؟

جوولەکەکە وتبووی: ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم... ئەو نە جوولەکە بوو، نە مەسیحی... ئەو تەنیا خوای دەپەرست...

زەید جوولەکەکەی بەجێهێشت و گەیشت بە زانایەکی مەسیحی پێی وت: باسێکی ئایینی خۆتانم بۆ بکە، بەڵکوو بەڕاستی بزانم و شوێنی بکەوم...

کابرای مەسیحی وتبووی: هەتا هەندێ لە نەفرەتی خوات بەرنەکەوێ ناتوانی بێیتە سەر ئایینی ئێمە...

زەید وتبووی: جا خۆ من خۆم لە نەفرەتی خوا دەشارمەوە، بۆیە هاتووم بۆ ئێرە... ئەگەر بەرگەی نەفرەتی خوداش بگرم، دیسان ئامادە نیم خۆم بخەمە بەر نەفرەتی خوا... دەکرێ ئایینێکی ترم پێ پیشان بدەی؟

**کابرای مەسیحی وتبووی: تەنیا ئاییینی حەنیفی شک دەبەم...**
**زەید گوتی: ئاییینی حەنیفی چ ئاییینێکە؟**
**وتبووی: ئاییینی حەزرەتی ئیبراهیم، ئەو نە جوولەکە بوو، نە فەلە و گاور... جگە لە خوای گەورەش هیچ شتێکی تری نەدەپەرست...**

زەید بۆی دەرکەوت کە ئاییینی حەزرەتی ئیبراهیم ئاییینێکی پاک و بێگەردە... بۆیە بەرەو مەککە هاتەوە و وتی: خوایە! تۆ شایەتبە کە من لەسەر ئاییینی حەزرەتی ئیبراهیمم...

زەید ئەو کەسە بوو کە ئاییینی حەنیفی حەزرەتی ئیبراهیمی هێنایە مەککە... ئەو ڕۆژە کە گەیشتەوە مەککە ڕۆیشتە لای کەعبە و پشتی نا بە دیواری کەعبەوە و بە خەڵکی گوت: هۆ هۆزی قورەیش! بەخوا جگە لە من هیچ کەسێکتان لەسەر ئاییینی حەزرەتی ئیبراهیم نییە...

زەید پیاوێکی نەرم و خۆشڕەفتار بوو... سەردانی خزم و دۆست و برادەری دەکرد... یارمەتی هەژارانی دەدا... هەرگیز کچی زیندەبەچاڵ نەکردبوو... تەنانەت بیزانیبایە پیاوێک دەیەوێ کچەکەی زیندەبەچاڵ بکات، دەڕۆیشت و پێی دەگوت: مەیکوژە هەموو پێداویستی و بەخێوکردنی لەسەر من... ئیتر بەو جۆرە کچەکەی لەو کەسە وەردەگرت و خۆی بەخێوی دەکرد... دوای گەورەبوونی کچە دەڕۆیشت و بە باوکی کچەکەی دەگوت: ئەگەر کچەکەت دەوێتەوە با بتدەمەوە... ئەگەرنا با هەر لای خۆم بێ و خۆم بە خێوی دەکەم...

زەید هەرگیز گۆشتی سەربڕاوی دەستی قورەیشیەکانی نەدەخوارد، چونکە زەید یەکتاپەرست بوو، ئەو دەیزانی کە دەبێ ئاژەڵ لە کاتی سەربڕیندا تەنیا ناوی خوای لێ بهێنرێت نەک ناوی بت و پەیکەر...

پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ببێ بە پێغەمبەر، ڕۆژێک لەگەڵ زەیددا لەسەر یەک سفرە و خوان دانیشتبوون... ئەو کاتە زەید پیاوێکی پیر و بەتەمەن بوو... دوای ئەوەی خواردن دانرا، پێغەمبەر(ﷺ) لە گۆشتەکەی نەخوارد، چونکە پێغەمبەریش(ﷺ) گۆشتی سەربڕاوی دەستی قورەیشی نەدەخوارد... ئەویش دەیزانی ئەو خەڵکە بتپەرستن و ناوی بت و پەیکەر لەسەر ئاژەڵەکان دێنن، بۆیە لێی نەدەخوارد... زەیدیش لێی نەخوارد... زەید بە خەڵکەکەی وت: من لە گۆشتی ئاژەڵی سەربڕاوی دەستی ئێوە ناخۆم... هەر ئاژەڵێک لە کاتی سەربڕیندا ناوی جگە لە خوای لێ هێنرابێ من لێی ناخۆم...

زەید ڕەخنەی لەو خەڵکە دەگرت و دەیگوت: باشە یانی چی خوای گەورە ئاژەڵ دروست دەکات، لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێ و لە زەوییەوە ڕووەک دەڕوێنێ، ئەو ئاژەڵە ئاو و گژوگیای خوای گەورە دەخوا، کەچی لە کاتی سەربڕیندا ناوی جگە لە خوای لێ دەهێنن؟

- ئای خوایە گیان... قوربان زەید چ پیاوێکی مەزن بووە... ئەو ئەو هەمووە گەڕا تەنیا بۆ ئەوەی هەق بدۆزێتەوە و خۆی لە ئاینێکی ناهەق بەری بکات؟

+ بەڵێ کوڕم... زەید پیاوێکی مەزن بوو... ئەو کارێکی کرد بۆ خەڵکی سەلماند کە هەر کەسێ بەڕاست خوای گەورەی بوێ، ئەوا خوای گەورە ڕێگای خواناسی بۆ تەخت و بێ کلۆ و ئاسان دەکات...

- ئەی قوربان دوای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر زەید چی کرد؟

+ زەید نەگەیشتە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، ئەو پێنج ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ببێ بە پێغەمبەر، وەفاتی کرد... ئەو

نەیدەزانی ئەو کەسەی کە کاتی خۆی لەگەڵیدا دانیشت و لەسەر یەک سفرە و خوان بوون، دەبێ بە کۆتا پێغەمبەری خوای گەورە و مەزن... ئەو کەسەی کە وەک ئەو گۆشتی سەربڕاوی دەستی قورەیشی نەدەخوارد...

- ئەی باشە قوربان پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوەی بوو بە پێغەمبەر هیچ باسی زەیدی نەکرد؟

+ با... باسێکی وای کرد کە شیاوی پیاوێکی مسوڵمانی ڕاستگۆ بێت...

- قوربان چی فەرمووی؟

+ زەیدی کوڕی عەمر هاوڕێی عامری کوڕی ڕەبیعە بوو، ڕۆژێک پێی وت: عامر! من بە پێچەوانەی گەل و هۆزەکەی خۆم لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلم، ئەوان چۆن خواپەرستییان دەکرد منیش بەو جۆرەی ئەوان... ئەوان لە کاتی نوێژدا ڕوویان لەم ڕووگەیە (کەعبە) دەکرد... من چاوەڕێم لە نەوەکانی ئیسماعیل یەکێک ببێت بە پێغەمبەر، بەلام وا دەزانم لەبەر پیری و نزیکبوونەوەم لە مردن چاوم بەو پێغەمبەرە نەکەوێ... من هەر لە ئێستاوە شایەتی دەدەم کە ئەو کەسە پێغەمبەرە، بڕوای پێ دەکەم، ئەگەر تۆ گەیشتی بە سەردەمی ئەو پێغەمبەرە و بینیت، ئەوا سەلامی منی پێ بگەیەنە...

- ئای خوایە گیان... ئای لەو بیروباوەڕە چەندێ مەزن بووە! زۆر پێی سەرسامم...

+ بەڵێ وایە، ناهەقت نییە پێی سەرسام بیت...

- ئەی باشە قوربان عامر سەلامەکەی زەیدی گەیاند بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

+ بەڵێ... خوای گەورە ویستی وابوو عامر مسوڵمان ببێ... دوای ئەوەی مسوڵمان بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوەی لەنێوان

ئـەو و زەیـددا ڕوویدابـوو هەمـووی بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) گێڕایـەوە و سـەلامەکەی زەیدی بـە پێغەمبـەر(ﷺ) گەیاند...

پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامـی سـەلامەکەی دایـەوە و نـزای خێری بـۆ کـرد و دواییـش فەرمـووی: بەڕاسـتی مـن زەیـدم لـە بەهەشـتدا بینـی، دامێنـی جلوبەرگەکـەی دەخشـا بـە سـەر زەوی بەهەشـتدا... (یانـی شـانازی بـە خۆیـەوە دەکـرد)...

- ئەی قوربان زەید منالی هەبوو؟

+ بەڵـێ کـوڕم... سـەعیدی کـوڕی زەیـد، یەکێـک لـەو دە کەسـەی کـە لـە دونیـادا مزگێنی بەهەشـتیان پـێ درا، کـوڕی ئـەو بـوو، گیـا لەسـەر بنجـی خـۆی دەڕوێتـەوە، ئەویش وەکـو باوکـی پیاوێکی پـاک و چـاک و مـەزن بـوو...

- باشـە قوربـان پێغەمبـەر(ﷺ) هیـچ شـتێکی لـە بـارەی زەیـدەوە بـۆ سـەعید باس کـردووە؟

+ بەڵـێ... ڕۆژێـک بـە سـەعیدی فەرمـوو: باوکـی تـۆ لـە ڕۆژی پەسـڵاندا خـۆی بـە تـاک و تەنیـا ئوممەتێکـە، لەنێوان مـن و عیسـادایە...

- باشـە قوربـان، ئەمـە لـە بـارەی زەیـدەوە، ئـەی لـە بـارەی ئومەیـەی کـوڕی صەڵتـەوە چیم بۆ بـاس دەکـەی؟

+ ئـەوە چیرۆکێکـی تـرە... سـەرەتاکەی ڕۆشـنە و کۆتاییەکـەی تاریـک...

- چۆن قوربان، مەبەستت چییە؟

+ ئومەیـەی کـوڕی صەڵـت، شـاعیرێکی سـەردەمی نەفامـی بـوو... باوکـی سـەقیفی بـوو، دایکیشـی قوڕەیشـی... ئـەو لـە تائیـف دادەنیشـت، صەڵتی باوکیشـی هـەر شـاعیر بـوو، ئـەو دەمـە تائیـف شـاعیری زۆری تیـا نەبـوو، چونکـە شـاعیر زیاتر لـەو تیـرە و گـەل و هۆزانـەی عەرەبدا هەڵکەوتبـوو کـە زۆر دەجەنـگان... وەک ئـەوس و خـەزرەج... یـان ئـەو

**تیرە و هۆزانەی کە دەدرا بە سەریاندا، یان دەیاندا بەسەر تیرە و هۆزی تردا... هەر بۆیە لەناو تائیفدا شاعیر کەمبوو... ئەوان زۆر بێوەی و بێ کێشە و ئاژاوە بوون... قورەیشیش چونکە خاوەن ڕێزێکی تایبەت بوون لەناو عەرەبدا کەمتر دەجەنگان و کەمتر هێرشیان دەکرایە سەر، بۆیە ئەوانیش شاعیریان کەم بوو، بەڵام هەرچۆنێک بێ لەناو تائیفدا شاعیری وەک ئومەیە نەبوو...**

- ئەی باسی ئەوەم بۆ بکە ئەو هاوڕێی زەید بوو، چۆن چاوەڕێی هاتنی کۆتا پێغەمبەری دەکرد؟

- ئومەیە لە سەردەمی نەفامیدا زوو زوو پەیوەندی بە جوولەکە و گاورەکانەوە دەکرد... گوێی لە دەنگوباس و بەسەرهاتی ئەوان دەگرت... لە تەورات و ئینجیل شارەزا ببوو... دەیزانی بەو زووانە خوای گەورە کۆتا پێغەمبەری خۆی ڕەوانە دەکات بۆ لای مرۆڤایەتی و ئەو پێغەمبەرە بانگەشەی یەکتاپەرستی دەکات و بە هەموو دونیادا بڵاوی دەکاتەوە... هەر بۆیە ئومەیە لە سەردەمی نەفامیدا بتپەرست نەبوو... لەنێو شیعرەکانیشدا ئەوەندەی ئەو باسی یەکتاپەرستی کردووە هیچ شاعیرێکی سەردەمی نەفامی ئەوەندە باسی یەکتاپەرستی نەکردووە... ئەو باسی بەهەشت و دۆزەخ، فریشتە، حەشر، لێپرسینەوە و چەند بابەتێکی تری ئایینی لە شیعرەکانیدا کردووە...

- دەی قوربان ئومەیە گەیشتە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) یان ئەویش وەک زەید پێشتر مردووە؟

+ کوڕی خۆم! ئومەیە گەیشتە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام سەد حەیف و مەخابن مسوڵمان نەبوو...

- زۆر سەیرە... ئەو کە ئەوەندە پەرۆشی بینینی کۆتا پێغەمبەر بوو، چۆن بڕوای بە پێغەمبەر(ﷺ) نەهێنا؟

+ ئەوە ڕاستییەکە... ئەوەیە کە ڕوویدا... کاتێ زانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە بە پێغەمبەر ئەو ئیمانی پێ نەهێنا... دەیانگوت: ئەو چاوەڕێ بووە خۆی ببێ بە پێغەمبەر...

– ئەی کەی مرد؟ مەبەستم ئەوەیە ئەوەندە نەژیا تا هەق و ڕاستی قەبووڵ بکات و ئیمان بە پێغەمبەر(ﷺ) بهێنێ؟

+ با، بەرەوەڵلا... لەوەش زیاتر ژیا... تەنانەت تا ساڵێک پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا...

– ئەی باشە قوربان پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئومەیەی نەکردووە؟

+ با! باسی کردووە... پێغەمبەر(ﷺ) سەرسام بوو بە شیعرەکانی ئومەیە، چونکە مانای یەکتاپەرستییان تێدا بوو... هەرجارێک گوێی لە شیعری ئومەیە بوایە دەیفەرموو: شیعرەکانی ئیمانیان هێناوە و دڵی نەیهێنا...

جارێک شیعرێکی ئومەیەی بیست و فەرمووی:
وەختە ئومەیە مسوڵمان ببێ...

❀ ❀ ❀

– قوربان ڕێگەم پێ دەدەی ئاوڕێک بەرەو ڕابردوویەکی دوورتر بدەمەوە و شتێکم بیستووە پرسیاری ئەو شتەت لێ بکەم؟

+ دەتەوێ بۆ چ سەردەمێک بگەڕێیتەوە با بزانم؟ پرسیاری چ شتێکیش دەکەی؟

– قوربان بیستوومە جەنابتان لە سەردەمی نەفامیشدا سەجدەت بۆ بت و پەیکەر نەبردووە... ئەوە تا چەندێ ڕاستە؟

+ بەڵێ کوڕم... ئەوەش فەزڵ و میهرەبانی خوای گەورەیە کە ناوچەوانی کەسێک بپارێزێ و نەهێڵێ سەجدە بۆ بت و پەیکەر ببا...

**ئەو سەردەمە هەرچەند من نەمدەزانی بیروباوەڕ و ئیمان چییە، بەڵام خوای گەورە خۆی پاراستمی و سەجدەم بۆ بت و پەیکەر نەبرد... کاتێ خەریک بوو تەمەنم بگا بە کاتی باڵغبوون باوکم بردمی بۆ شوێنێکی پڕ لە بت و پەیکەر... دوایی پێی وتم: کوڕم! ئەمە خوداکانی تۆن... خودا پایە بەرزەکان...**

ئیتر باوکم لەوێ منی بەجێهێشت و خۆی ڕۆیی... منیش لە بتێک نزیک بوومەوە و وتم: برسیمە تێرم بکە... وەڵامی نەدامەوە... وتم: ڕووتوقوتم پۆشتەم بکەرەوە... دیسان وەڵامی نەدامەوە... بەردێکم هەڵگرت و لێمدا... بتەکە کەوت بە لادا...

- قوربان وای نابینی کە ئەمە سەرەتای هەڵبژاردنی جەنابت بوو لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ ئەوەی بتکا بە خەلیفە و جێگری پێغەمبەرەکەی خۆی؟

+ کوڕم نابێ مرۆڤ خۆی پەسنی خۆی بدات و پاکانە بۆ خۆی بکات، بەڵام من زۆر سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە یەکێکم لەو کەمینانەی کە هەرگیز سەجدەیان بۆ هیچ بتێک نەبردووە... هەرچەند خوای گەورەشمان نەدەپەرست، بەڵام ئەوەندە بوو ئێمە نە ئایینی ئیسلام هەبوو، نە پێغەمبەرێک هەبوو...

- بەڵام قوربان ئێوە خۆتان بیڵێن و نەیڵێن من هەر خۆم وادەزانم کە خوای گەورە ئەوەی وەک پێشەکییەک بۆ جەنابتان کردووە، بۆ ئەوەی هەڵبژاردەیەک بن بۆ ئەوەی ببن بە جێگر و خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... کەسێک ببێ بە خەلیفەی پێغەمبەر دەبێ لە کاتی نەفامیشدا ئەو فامدار بووبێت و پاک بووبێت و ناوچەوانی خۆی بۆ هیچ بتێک نەنابێتە سەر زەوی... پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی هەڵبژاردە بوو، دەبێ خەلیفەی پێغەمبەری خوداش(ﷺ) هەڵبژاردە بێت... تەنیا بە جەنابت دەگوترێ: خەلیفەی پێغەمبەری خوا...

ئەوانەی دوای تۆ بوون بە خەلیفە، خۆ خەلیفەی پێغەمبەر نین، ئەوان خەلیفەی تۆ و خەلیفەی خەلیفەکانی دوای تۆن... کەوابوو نازناوی (خەلیفەی پێغەمبەری خوا) تەنیا و تەنیا بە تۆ دراوە، ئێ دەبێ تاکە خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵبژاردەیەک بێ و تایبەتمەندی خۆی هەبێ...

+ کوڕم من ئەو قسانەی تۆ وەک گومان باشییەک حسێب دەکەم، بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم: هەمیشە سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە لە سەردەمی نەفامیشدا سەجدەم بۆ بت و پەیکەر نەبردووە... خوای گەورە منی لە شیرک پاراست... ئەوەش وەک خۆهەڵکێشان و بەخۆدانازین نالێم، بەڵکوو وەک نیعمەتێکی خوا باسی دەکەم، ئەگەر خوا خۆی منی نەپاراستایە من چیم لە دەست دەهات؟ لەوانەبوو منیش وەک ئەو هەمووە خەڵکە موشریکێک بوومایە!

– ئای قوربان ئێوە چەندێ خاکی و سادەن...

+ کوڕم مرۆڤی ژیر دەبێ تاوانەکانی بخاتە ئەستۆی خۆی و چاکەکانیشی لە خواوە بزانێ... من تەنیا دەڵێم: سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی لە شیرک پاراست...

– باشە قوربان... ئەی لە بارەی ئارەقەوە چی؟

+ مەبەستت چییە؟

– قوربان جەنابتان لە سەردەمی نەفامیدا مەیخۆر بوون؟

+ نا بە خوا هەرگیز دەمم لە مەی نەداوە و نازانم تامی چۆنە... سوپاس بۆ خوای گەورە هەر لە سەرەتای فامپەیداکردنمەوە ڕقم لە مەیخواردن بووە...

– باشە قوربان چۆن ڕقتان لێی بوو؟ چۆن تامت نەکرد؟

+ کوڕم مرۆڤی ژیر دەبێ پەند لە خەڵکیتر وەربگرێ... مرۆڤی گێل و دەبەنگیش خۆی دەبێ بە پەند... من سوپاسی خوای گەورە

دەکەم کە نەیکردووم بە پەند، بەڵکوو پەندم لە خەڵک وەرگرتووە...

- قوربان بۆم ڕوون بکەرەوە... لەمەڕ مەیخواردنەوەوە چ پەندێکت وەرگرتووە؟

+ باشە گوێ بگرە با بۆت باس بکەم...

- دڵ و گیانم لە لاتە... فەرموو...

+ لە سەردەمی نەفامیدا کاتێ گەنج بووم، جارێک بە لای پیاوێکی سەرخۆشدا تێپەڕیم... پیاوەکە چنگێ پشقلی هەڵدەگرت و لە دەمی خۆی نزیک دەکردەوە و دەیەویست بیخوا... کاتێ لە دەم و لووتی نزیک دەبوویەوە و بۆنی ناخۆشی پشقلەکە دەچوو بە لووتیدا فڕێی دەدا... بە چاوی خۆم بینیم چەند جارێ ئەو کارەی دووبارە کردەوە... بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم: سوێند بە خوا نابێ هەرگیز ئارەق بخۆمەوە، چونکە مەیخواردن ژیری و ئاوەز لە مرۆڤ دوور دەخاتەوە و مرۆڤ بێئاگا و گێل و شێت دەکات... مرۆڤی بێئاوەزیش ناتوانێ ڕێز و کەسایەتی خۆی بپارێزێ... منیش ڕێز و کەسایەتی خۆم لە هەموو شتێک بە لاوە گرنگتر بوو، بۆیە سوێندم خوارد هەرگیز دەم لە ئارەق نەدەم...

- دەی قوربان هێشتا سووری لەسەر ئەوەی کە هەڵبژاردەی خوای گەورە نیت بۆ ئەوەی ببی بە خەلیفە و جێگەداری پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

+ هێشتا سوورم لەسەر ئەوەی تەنیا سوپاسی خوای گەورە بکەم لەسەر ئەو هەمووە ناز و نیعمەتانەی کە پێی بەخشیوم و لەوە زیاتر پاکانە بۆ خۆم ناکەم...

- ئەی قوربان باسی دۆستایەتی نێوان خۆت و پێغەمبەری خوام(ﷺ) بۆ بکە... ئێوە لە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتیدا چۆن بوون؟

+ من و پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوڕێی گیانی بە گیانی بووین... ئەو دوو ساڵ و هێندێ لە من گەورەتر بوو... پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشڕەفتارترین کەسی قورەیش بوو... ڕاستگۆترین مرۆڤ بوو... دەستپاکترین کەس بوو... ئێمەش وەک هەموو دوو گەنجێکی هۆزەکانی تر هاوڕێی یەکتر بووین... برایەتی و هاوڕێیەتیمان زۆر تۆخ بوو... من زۆر ئەوم خۆش دەویست و ئەویش منی زۆر خۆش دەویست... من هیچ شتێکم پێش هاوڕێیەتی ئەو نەدەخست، ئەویش بۆ من وابوو... مرۆڤ خۆی دەزانێ تا چەندێ لە دڵی هاوڕێکەیدا جێگەی گرتووە...

- دەی پیرۆزت بێ قوربان...

+ هەزار جار پیرۆزم بێ... هیچ شتێک وەک هاوڕێیەتی پێغەمبەر شیاوی پیرۆزباییلێکردن نییە...

- ئەی قوربان جەنابتان لە سەردەمی نەفامیدا چیتان دەکرد؟

+ منیش وەک زۆربەی پیاوەکانی قورەیش بازرگان بووم... منیش لەو دوو جارەی کە بە مەبەستی بازرگانی دەچوون بۆ زۆزان و گەرمیان بەشدار بووم... زستانان دەچووین بۆ یەمەن و هاوینان بۆ شام... لەو دوو وڵاتە کڕین و فرۆشتنم دەکرد... لە بازرگانیدا ڕاستگۆ و دەستپاک بووم و هیچ کەسێکم نەدەخەڵەتاند، بۆیە خوای گەورە قازانجی زۆر و بە پیت و فەڕی پێ دەبەخشیم... لە سەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا(ﷺ) دەسمایەکەم چل هەزار دیرهەم بوو...

- یانی تۆ پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێک بووی لە دارا و زەنگینەکانی مەککە؟

+ بەڵێ من بە سەروەت و سامان زەنگین و دارا بووم، بەڵام لە ڕووی بیروباوەڕەوە هەژار و ئاتاج بووم... کاتێ پێغەمبەر(ﷺ)

**بوو بە پێغەمبەر شایەتومانم هێنا ئیتر بووم بە زەنگینترین و دەوڵەمەندترین کەسی سەر زەوی...**

- مەبەستتان لە ڕووی ئیمان و بیروباوەڕەوەیە؟

+ کوڕم... خوای گەورە سەروەت و سامان دەدا بە ئەوانەی خۆشی دەوێن و ئەوانەشی کە خۆشی ناوێن، بەڵام ئیمان تەنیا بە نسیبی ئەوانە دەکا کە خۆشی دەوێن... ئەوەتا خوای گەورە دونیای بە حەزرەتی سولەیمان بەخشی... بە نەمروودیشی هەر بەخشی... ئەگەر سەروەت و سامان پێوەر بێ، ئەوا نەیدەبەخشی بە دوو کەسی زۆر لە یەکتر جیاواز... دۆستێک و دوژمنێکی خۆی!

- ڕاست دەفەرمووی قوربان... پێم وایە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە جەنابت باسی مسوڵمانبوونی خۆتمان بۆ بکەیت، با لە زاری خۆتەوە ئەو چیرۆکە مەزنە ببیستین...

+ خۆ پێموتی: من و پێغەمبەر(ﷺ) هاوڕێی گیانی بە گیانی بووین... من باش ئەوم دەناسی... دەمزانی ئەو بە ناوی خەڵکەوە درۆ ناکات چ جای ئەوەی بە ناوی خواوە درۆ بکات... ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە پێغەمبەر من لەناو کۆڕ و کۆمەڵی پیاوانی قورەیشدا دانیشتبووم... باسی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) کرد... گلەییان لێ دەکرد، وتیان: محەمەد بە خراپە باسی بتەکانمانی دەکرد، بە تایبەتی ئەمڕۆ... ڕێزیان لێ ناگرێ... دەڵێ: من ئایینێکم هێناوە لەوەی ئێوە باشترە...

هەر کە گوێم لەو قسانە بوو ڕامکرد و دەستم کرد بە گەڕان بەدوای پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بۆ ئەوەی ئەو دەنگوباسە لە زاری خۆیەوە ببیستم... پێی گەیشتنم... پێم گوت: باوکی قاسم! ئەوە چییە ئەمڕۆ لەناو کۆڕ و کۆمەڵی پیاواندا چاوم پێت نەکەوت؟ ئەوە چییە ئەوانە باسی تۆیان دەکرد و دەیانگوت گوایە تۆ باسی بتەکانی

ئەوانت بە خراپە کردووە؟ باسی باپیرە و داپیرەی ئەوانت کردووە گوایە بتپەرست بوون و باوەڕیان نەبووە؟

پێغەمبەر(ﷺ) بە منی فەرموو: ئەی باوکی بەکر! من پێغەمبەری خوام... وا بانگت دەکەم بۆ ئەوەی خوای تاک و تەنیا بپەرستی... ئەو خوایەی کە بێ نیاز و جێ نیازە... لە کەس نەبووە و کەسیشی لێ نەبووە و نابێ...

منیش وتم: أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أنک یا محمد رسول الله... وا شایەتی دەدەم کە جگە لە زاتی الله هیچ خودایەک نییە و شایەتی دەدەم کە تۆ ئەی محەمەد نێردراو و پێغەمبەری خودای...

- قوربان هەروا بە ئاسانی بەبێ هیچ لێکۆڵینەوە و پرس و ڕایەک مسوڵمان بووی؟

+ کوڕم! هەندێ جار هەندێ قسە هەیە یەکسەر دەچێتە ناو چەقی دڵی مرۆڤەوە... سوپاس بۆ خوای گەورە کە منی کرد بە یەکەم کەسێ کە باوەڕم بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا و بووم بە یەکەم مسوڵمانی ئەم ئایینە پیرۆزە... من ئەوەندەم بەسە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێکم بانگ کردبێ بۆ سەر ئایینی ئیسلام گێتێکی کردووە، بیرێکی لێ کردووەتەوە... جگە لە ئەبوبەکر، کاتێ ئەوم بانگ کرد، بەبێ ئەوەی گت بکا، یەکسەر ئیمانی پێ هێنام...

- دەک یاخوا پیرۆزت بێ قوربان! ئەو شایەتیدانەی پێغەمبەرت پیرۆز...

+ خوا بتپارێزێ کوڕم...

- دەی قوربان پاش مسوڵمانبوون یەکەم کار چیت کرد؟

+ دوای ئەوەی مسوڵمان بووم یەکسەر بیرم کردەوە بزانم کێ باشە و کێ جێگای متمانەیە بۆ ئەوەی بانگی بکەم و مسوڵمان ببێ...

- دەی قوربان کێ جێ متمانەی جەنابت بوو؟ کێت بانگ کرد؟

+ چینێکی کەمی پڕ پیت و بەرکەت بە فەڕ... خوای گەورە ئەوانەی هەڵبژارد و کردنی بە بەردی بناغەی ئەم ئایینە... ئەوانەش بریتی بوون لە:

زوبەیری کوڕی عەوام

عوسمانی کوڕی عەففان

طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا

سەعدی کوڕی ئەبووەقاص

عوسمانی کوڕی مەزعون

ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف

ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد و

ئەرقەمی کوڕی ئەبوئەڕقەم...

دانە دانە و بە نهێنی ئەوانەم بانگ کرد بۆ سەر ئایینی ئیسلام... دەمبردن بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانیش مسوڵمان دەبوون...

- یانی قوربان ئەوانە هەموویان لەنێو لاپەڕەی چاکەکانی جەنابتن؟

+ کوڕی خۆم! ئەمە زێدە خەڵاتێکە لە خوداوە، بە هەر کەسێ خۆی حەز بکا پێی دەبەخشێ...

- ئەی قوربان ئەمە خەڵک، ئەی ماڵ و مناڵ و کەسوکاری نزیکت؟

+ خۆ نابێ من خەڵک بانگ بکەم بۆ خێر و چاکە و ماڵ و مناڵ و کەسوکاری نزیکی خۆم لەبیر بچێ... ئەوانەی لە مرۆڤەوە نزیکن، زیاتر شیاوی چاکە لەگەڵداکردنن، من ژن و مناڵەکانی خۆیشم بانگهێشت کرد، ئوممو ڕوومانی ژنم مسوڵمان بوو... عەبدوڵڵای

**کوڕم، عایشـەی کچـم، ئەسـمای کچـم، عامـری کـوڕی فەهیـرەش کـە خزمەتکارمـان بـوو، هەمـووان مسـوڵمان بـوون...**

**- خۆزگـەم پێت قوربـان! ئـەو مەزنانـەش دیسـان لەنێو لاپـەڕەی چاکەکانـی جەنابتـان؟**

**+ پێشـتر پێم وتـی: ئەمـە زێدە خەڵاتێکە لـە خـوداوە، بـە هـەرکەسـێ خـۆی حـەز بکا، پێی دەبەخشـێ...**

**- ئەی قوربان باوک و دایکت چی؟**

+ باوکـم درەنـگ مسـوڵمان بـوو، هەتـا ئازادکردنـی مەککـە نەهاتـە ڕیـزی مسـوڵمانانەوە، بـەڵام سـوپاس بـۆ خـوا دوای ئازادبوونـی مەککە ئەویش مسـوڵمان بوو، بەڵام دایکم ئەویش هـەر لـە سـەرەتای دەرکەوتنـی خـۆری ئیسـلامەوە بـاوەڕی بـە پێغەمبـەر(ﷺ) هێنـا و مسـوڵمان بـوو...

- قوربـان ئەگـەر پێـت گـران نەبـێ پێـم خۆشـە باسـێکی مسـوڵمانبوونی دایکتـم بـۆ بکـەی، چـۆن مسـوڵمان بـوو؟

+ باشـە کـوڕی خـۆم... سـەرەتای ئـەو ڕۆژەی دایکـم مسـوڵمان بـوو، سـەرەتایەکی پـڕ لـە زەحمـەت و نارەحەتـی بـوو، بـەڵام خـوای گـەورە ئـەو منەتـەی بەسـەر بەنـدەی خۆیدا کـرد و کۆتاییەکـەی پـڕ بـوو لـە بەختـەوەری... ئـەو ڕۆژە ئێمـە سیوهەشـت پیـاوی مسـوڵمان بوویـن، هەموومـان لـە ماڵـی ئەرقەمـی کـوڕی باوکـی ئەرقـەم کـۆ ببووینـەوە... جگـە لـەو چەنـد کەسـە نەبـێ ئیتـر لـەم سـەرزەوییەدا کەسـێکی خوانـاس و مسـوڵمانی تیـا نەبـوو... مـن ئـەو ڕۆژە زۆر لـە پێغەمبـەر(ﷺ) پاڕامـەوە بـۆ ئـەوەی بانگەشـەکەی خۆمـان ئاشـکرا بکەیـن و بـە دیـار چـاو و گوێـی سـەرانی قورەیشـەوە بانگـەوازی خۆمـان بکەیـن...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبوبەکر ئێمە زۆر کەمین...

منیش بەردەوام هەر لێی دەپاڕامەوە تا ئیزنی داین... ئیتر ئێمە ڕۆیشتین بۆ کەعبە... منیش دەستم کرد بە وتاردان، دوای پێغەمبەر(ﷺ) من یەکەم کەسم لە ئیسلامدا کە وتارم دابێت و بە ئاشکرا خەڵکم بانگ کردبێ بۆ سەر ئیسلام...

- ئەی قوڕەیش هێشتیان بە ئاشکرا و بەبێ پێچ و پەنا و لە پەنای کەعبەدا قسەی خۆت بکەی؟

+ بۆ تۆ وادەزانی قوڕەیش ئاوا بە ئاسانی ڕێگەیان بە ئێمە دابێ؟

- ئەی چی قەوما؟

+ ئەوە من خەریک بووم قسەت بۆ بکەم، بەڵام تۆ پێت بڕیم...

- داوای لێبووردن دەکەم قوربان... بەخوا ئەوە ئەوەندە بە پەرۆشم بزانم چی قەوماوە، ئاگام لە خۆم نەما و قسەکەم پێ بڕیت، دیسان داوای لێبووردن دەکەم...

+ باشە کوڕم کێشە نییە... من وتارم دەدا... هەندێ لە پیاوانی قوڕەیش هەستان و دەستیان کرد بە لێدانی من... زۆریان لێدام... عوتبەی کوڕی ڕەبیعە لێم نزیک بوویەوە و جووتێک نەعلی زۆر ڕەق و ئەستووری لە پێدابوو... بە شەق هات بە سەر و چاومدا... دەموچاوم هەمووی ئاوسا... بوورامەوە... کۆمەڵێک منیان هەڵگرتبوو بۆماڵیان بردبوومەوە... لە ماڵەوە کەس گومانی ئەوەی نەبوو کە من دەمرم... بنەماڵەکەم (بەنوتەیم) هەموویان کۆ بوونەوە و هەڕەشەیان لە هۆزی قوڕەیش کرد و وتیان: بەخوا ئەگەر ئەبوبەکر بمرێ ئێمە لە تۆڵەی ئەبوبەکردا عوتبە دەکوژین...

دوایی هاتبوونەوە بۆ لای من و قسەیان لەگەڵدا کردبووم... منیش نەمتوانیبوو وەڵامیان بدەمەوە... تا کەمێک پێش خۆرئاوابوون هۆشم هاتەوە و یەکەم قسە کردم ئەوەبوو وتم: پێغەمبەر(ﷺ) چی

**بەسەر هات؟**

**- قوربان خۆتت لە بیر چوویەوە و هەواڵی پێغەمبەرت(ﷺ) پرسی؟**

**+ ئەی چۆن؟ ئەی مەگەر من مسوڵمان نەبووم؟ تاکێک نەبووم لە ئیسلام؟ مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بریتی نەبوو لە تەواوی ئیسلام؟ بەخوا پێم خۆش بوو من هێندەی تر بریندار بکرێم، بە مەرجێ درکێک نەچێ بە قاچی پێغەمبەردا(ﷺ)...**

- ئێستا تێگەیشتم... ئا قوربان لەبەر ئەمەیە کە تۆ پێش هەموو کەسێ کەوتووی...

+ کوڕم ئایین بەرپرسیارێتییە، نەک خۆهەڵکێشان و لاف و گەزاف لێدان... مرۆڤ چۆن سەیری خۆی بکا، ئاوا دەبێ بە بەرپرس، ئەگەر تۆ وابزانی تۆ تەنیا مسوڵمانێکی نوێژ و ڕۆژووت لەسەر فەرزە و هیچی تر، ئەوە هیچ بەرپرسیارێتییەکت نەخستووەتە ئەستۆی خۆت، بەڵام ئەگەر واتزانی کە بەشێکی ئەم ئایینە لەسەر شانی تۆیە، ئەو کاتە هەم کاتی خۆت و هەم سەروەت و سامانی خۆت و تەنانەت خوێنی خۆت لەپێناوی ئاییندا دەبەخشی...

- قوربان بەم بیروباوەڕەوە تۆ پێشکەوتووی... ئەی دوایی چی ڕوویدا؟

+ بە دایکی منیان گوت: ئاگات لێبێ... بزانە ناتوانی هەندێ خواردن، یان کەمێک ئاوی پێ بدەی؟ منیش مانم گرتبوو، دەمگوت: هەتا نەزانم پێغەمبەر(ﷺ) چی بەسەر هاتووە نە تامی خواردن دەکەم، نە ئاویش دەخۆمەوە...

بەوجۆرە نائومێد بوون و وازیان لە من هێنا و ڕۆیشتنە دەرەوە... من و دایکم بە تەنیا ماینەوە... پێمگوت: دایکە پێغەمبەر(ﷺ) چی بەسەر هات؟

وتی: بەخوا نازانم...

وتم: دەی بڕۆ بۆ لای دایکی جەمیلی کچی خەتتاب، لەو بپرسە بزانە چی بەسەر هاتووە؟

- باشە قوربان بۆ دایکت بۆ لای دایکی جەمیلی کچی خەتتاب نارد؟

+ چونکە ئەو یەکێک بوو لەو ژنانەی کە هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە مسوڵمان ببوو... خۆی و مێردەکەی کە سەعیدی کوڕی زەید بوو، دایکی جەمیل خوشکی هاوڕێ و خۆشەویسم عومەری کوڕی خەتتابە... ئەوێ ڕۆژێ عومەر هێشتا مسوڵمان نەبووبوو... لەنێو بنەماڵەی بەنو عەدی هەرکەسێ مسوڵمان ببووایە لە ترسی عومەر دەیشاردەوە و نەیدەوێرا ئاشکرای بکا... پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە سەرسەختترین دوژمنی ئایین دەکات بە بەهێزترین پەنا و پاڵپشتی ئایین...

- باشە قوربان دوایی لەنێوان دایکت و دایکی جەمیل چی گوزەرا؟

+ دایکم ڕۆیشت بۆ لای دایکی جەمیل... پێی وتبوو: ئەبوبەکری کوڕم هەواڵی هاوڕێکەی لە تۆ دەپرسێ، تکایە چی بەسەر هاتووە پێم بڵێ با ئاگاداری بکەمەوە؟

دایکی جەمیل پێی وتبوو: من نە کوڕی تۆ دەناسم و نە محەمەد... ئەگەر پێت خۆشبێت من خۆم دێم بۆ لای ئەبوبەکر...

دایکم وتبووی: باشە وەرە...

دایکم دایکی جەمیلی هێنا بۆ لای من... کاتێ منی بەو جۆرە بینی وتی: بەخوا ئەوانەی تۆیان بەم ڕۆژە گەیاندوە هەموویان خراپەکار و بەدڕەوشتن، خوا تۆڵەی تۆیان لێ بکاتەوە...

پێموت: پێم بڵێ پێغەمبەر(ﷺ) چی بەسەر هاتووە؟

وتی: ئاخر دایکت لێرەیە ناتوانم هیچ بڵێم...

منیش وتم: قەیناکا... لە دایکم مەترسە...

دایکی جەمیل وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ساغ و سەلامەتە و هیچی لێ نەهاتووە...

وتم: ئەی لە کوێیە؟

وتی: لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی باوکی ئەرقەمە...

منیش وتم: بەخوا تامی خواردن و خواردنەوە ناکەم هەتا بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبینم...

چاوەڕێمان کرد تا خەڵک چوونە نێو ماڵەوە و کەمێک دونیا کشومات بوو... خۆم بە پێوە ڕانەدەگرت... دایکم و دایکی جەمیل هاتنە بنباڵم و منیان برد بۆ ماڵی ئەرقەم... لەوێ گەشامەوە و چاوم بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوت و تێر ماچم کرد... پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەزەیی بە مندا هاتەوە... پێمگوت: خۆم و دایک و باوکم بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا... هیچم نییە تەنیا ئەو بەدڕەوشتە ئاوای لە دەموچاوم کردووە... ئەمە دایکمە... زۆر ژنێکی باشە بۆ منالەکانی... تۆش پیاوێکی پیرۆزی، توخوا بۆی بپاڕێوە و بانگی بکە بۆ مسوڵمانبوون، بەڵکوو خوای گەورە لە ئاگری بپارێزێ...

پێغەمبەر(ﷺ) نزای خێری بۆ دایکم کرد و پاشان داوەتی کرد بۆ ئەوەی مسوڵمان ببێت... دایکم بەبێ یەک و دوو مسوڵمان بوو... ئەوەندە دڵم خۆشبوو کە هەموو ئێش و ئازارێکی خۆمم لە بیر چوویەوە...

- قوربان دوو شتم بە لاوە سەیرە... مۆڵەتم دەدەی لە بارەی ئەو دوو شتەوە پرسیارت لێ بکەم...

+ بەڵێ کوڕم... بڵێ بزانم چییە؟

- باشە قوربان بۆ بنەماڵەکەت هەڕەشەی کوشتنیان لە عوتبە کرد، مەگەر ئەوان مسوڵمان بوون؟

- نەخێر ئەوان مسولمان نەبوون... تەنانەت زۆربەی زۆریان لەسەر دینی قورەیش بوون، ئەوانیش هاودینی عوتبە بوون، بەلام ئیتر ئەوە دەمارگیری بنەماڵەیی و خزم خزمێنە بوو... عادەتی عەرەب وابوو کە هەرگیز و لەسەر هیچ شتێ پشت نەکەنە خزمی خۆیان... هەرکەسێ پشتی بکردایەتە خزمی خۆی، خەڵک بە چاوێکی سووکەوە سەیریان دەکرد و بە ترسنۆک و لاوازیان دەزانی...

- باشە قوربان تێگەیشتم... با پرسیاری دووەمت لێ بکەم... بۆچی دایکی جەمیل خۆی نەناس کرد و وتی: نە ئەبوبەکر دەناسم و نە محەمەد... ئەو لە گیانی خۆی دەترسا؟

+ نەبەخوا ئەوەندەی خەمی پێغەمبەری خوای بوو، نیو نیو ئەوەندە خەمی گیانی خۆی نەبوو... ئەگەر ئەو خەمی گیانی خۆی بووایە داوای لە دایکم نەدەکرد کە بیهێنێ بۆ لای من... ئێمە ئەو کاتە فێر ببووین هەموو شتێکمان بە نهێنی دەکرد... فاتیمەی کچی خەتتاب (دایکی جەمیل) ژنێکی زۆر ژیر و زانا بوو... مەگەر لە بیرت چوو کاتێ پرسیاری پێغەمبەرم لێ کرد وتی: ئاخر دایکت گوێی لێیە؟

ئەو تەنانەت متمانەی بە دایکی منیش نەبوو... هەتا من پێم نەگوت: قەیناکا لە دایکم مەترسە... ئەو هیچی نەگوت... کورم... مرۆڤی مسولمان ژیر و زیرەک و دانایە... دەزانێ بەرە لە کوێوە دەدرێ... دەزانێ چ قسەیەک بکات... دەزانێ چی بکات... دەزانێ چۆن وەلامی خەڵک بداتەوە... خۆ ئایین تەنیا بەرنامە نییە و بەس، بەڵکوو پیادەکردنی بەرنامەکەیشە... پەیڕەو و پرۆگرامی ژیانە... جاری وا هەیە خۆهەڵکێشان و توندوتیژی لەبەر ئایین، هێندەی زیانی بۆ ئایین هەیە، نیو هێندە قازانجی نییە... دەبێ مرۆڤی ژیر و وریا ڕەچاوی بارودۆخەکە بکات... فاتمەی کچی خەتتاب زۆر لەوە ژیرتر بوو تێبکەوێ...

**- قوربان قسە قسە ڕادەکێشی... شتێکم بیستووە، گوایە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب پرسیاری لە دانیشتوانی دەوروبەری خۆی کردووە و فەرموویەتی: کامیان زیرەکترن مسوڵمانەکەی نێو کۆشکی فیرعەون، یان ئەبوبەکر؟ خەڵکەکە بێدەنگ بوون، دوایی خۆی فەرموویەتی: بەخوا چرکەیەک لە ژیانی ئەبوبەکر هێژاتر و باشترە لە پڕی سەرزەوی لە ژیانی ئەو پیاوە مسوڵمانەی نێو کۆشکی فیرعەون... ئەوەی کۆشکەکەی فیرعەون مسوڵمانبوونی خۆی شاردبوویەوە، بەڵام ئەبوبەکر ئاشکرای کرد...**

+ سڵاوی خوا لە عەلی بێ... ئەو پیاوێکی زۆر خواناس و ژیر و تێکۆشەر بوو... ئێمە لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەومان خۆشویست... ئەویش هەر لەبەر ڕەزامەندی خوا ئێمەی خۆشویست... ئەو قسانەی لە گومانباشی خۆیەوە کردووە...

- باشە قوربان قسەکەی لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

+ ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە بەردەم کەعبە لە حیجری ئیسماعیلدا نوێژی دەکرد... لەو کاتەدا عوقبەی کوڕی باوکی موعەیت هاتبوو، چاکە کەواکەی لە گەردنی پێغەمبەر(ﷺ) توند کردبوو... خەریک بوو بیخنکێنێ... منیش بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕامکرد و لە دواوە عوقبەم گرت و پاڵێکم پێوە نا و لە پێغەمبەرم(ﷺ) دوور خستەوە و وتم: باشە ئێوە پیاوێک دەکوژن کە دەڵێ: الله خوای منە؟

- ئەی لەو کاتەدا قورەیش چییان کرد؟

+ وازیان لە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا و بە هەموانەوە هاتن بەرەو ڕووی من و دەستیان کرد بە لێدانی من... بەخوا پێم خۆشبوو... زۆرم پێ خۆشبوو وازیان لە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا و بەرەو ڕووی من هاتن... خوا منی کرد بە قوربانی پێغەمبەر(ﷺ)... ئای کە خۆش بوو...

- دەی بەخوا حەزرەتی عەلی زۆر ڕاستی فەرمووە تۆ زۆر لە پیاوە مسوڵمانەکەی نێو کۆشکی فێرعەون باشتری...

+ خوا لێت ببووریٚ کوڕم... تۆش وەک عەلی گومانی باشم پیٚ دەبەی...

- ئەی قوربان ئەگەر گومانی باش بە تۆ نەبریٚ، ئیتر کیٚ شایستەی ئەوەیە گومانی باشی پیٚ ببریٚ؟

+ دەی کوڕم واز لە پیاهەڵدانی من بێنە، من لە هەموو کەسێک باشتر خۆم دەناسم...

- بەخوا قوربان مرۆڤ ناتوانیٚ قسەی نێو دڵی خۆی بشارێتەوە و نەیکا... وەستاندنی زمانی سەر ئاسانە، بەڵام وەستاندی زمانی دڵ قورسە، بەڵام با بە دڵی جەنابت بیٚ...

❀ ❀ ❀

- قوربان بیستوومە گوایە حەزرەتی عومەر هەر جاریٚ بیلالی حەبەشی دیبیٚ فەرموویەتی: بیلال گەورەی ئێمەیە و گەورەی ئێمە ئەوی ئازاد کردووە... مەبەستی تۆیە، چونکە هەمووان دەزانن کە جەنابت بیلالت کڕییەوە و ئازادت کرد... چیرۆکی کڕینەوەی بیلال چۆنە؟

+ مسوڵمانانی مەککە سیٚ بەش بوون:

یەکەم: ئەوانەی کە لە بنەماڵە گەورەکانی قوڕەیش بوون... وەک: حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە...

ئەمانە چونکە بنەماڵەیان بەهێز بوو، کەس نەیدەوێرا لێیان نزیک بکەوێتەوە...

دووەم: مسوڵمانە بێکەسەکان... ئەمانە هەرچەند ئازاد بوون و کۆیلەی کەس نەبوون، بەڵام چونکە بنەماڵەدار نەبوون و

خزموخوێشیان کەم بوو، یان هەر نەیانبوو، کەسێک نەبوو پەنایان بدا، وەک ماڵی یاسر، ئەمانە ڕووبەڕووی چەرمەسەری و لێدان و ئازار دەبوونەوە...

سێیەم: ئەو کۆیلانەی کە کۆیلەی کەسێک بوون و مسوڵمان ببوون... ئەوانە لەناو بازاڕەکانی عەرەبدا کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرا... بە هەموو پێوەرێکی سەردەمی نەفامی دەبوو کۆیلە لەسەر ئایینی گەورەکەی خۆی بێ... ئەگەر کەسێک کۆیلەیەکی خۆی سەربڕیبایە کەس بۆی نەبوو قسە بکا، کەسیش قسەی نەدەکرد... بە کورتی لە سەردەمی نەفامیدا کۆیلە وەک مرۆڤ چاوی لێ نەدەکرا، بەڵکوو وەک ئاژەڵ کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا، سەریان دەبڕێ، کاریان پێ دەکرد، لێیان دەدا... بیلالی کوڕی ڕیباح یەکێک بوو لەو کۆیلانە... کاتێ بیلال مسوڵمان بوو، ئومەیەی کوڕی خەڵەف کە خاوەنی بیلال بوو، زۆر زۆر تووڕە بوو... سوێندی خوارد ئەوەندە لە بیلال بدا تا پاشگەز دەبێتەوە، یان لەژێر ئازاردا دەمرێ... هەموو نیوەڕۆیەک لە جەنگەی گەرمای هاویندا بیلالی دەبرد لەو دەرودەشتە لەسەر گازی پشت پاڵی دەخست و فەرمانی دەدا بە چەند کەسێکی بەردەستی تاشە بەردی قورس و گەرمیان لەسەر سینگی دادەنا... بیلال لەژێر ئێش و ئازاردا دەبوو... ئەویش پێی دەگوت: یان پاشگەزبوونەوە و جوێندان بە موحەممەد... یان پەرستنی بتەکانی لات و عوززا...

بیلالیش هەر دەیگوت: أحد أحد...

وەرەقەی کوری نەوفەل دەیدا بە لای بیلالدا... بیلال لەژێر ئازاردا هەر دەیگوت: أحد أحد... یانی: خوا تاکە خوا تاکە...

وەرەقەش دەیگوت: بەڵێ بیلال سوێند بە خوا خوا تاکە... خوا تاکە...

دوایی لای دەکردەوە بە لای ئومەیە و ئەوانەی کە بیلالیان ئازار دەدا و دەیگوت: بەخوا ئەگەر لەسەر ئەم قسەیە ئەم کابرایە بکوژن من قەبرەکەی دەکەم بە جێ نزرگە و بەردەوام سەردانی دەکەم و نزای خێری بۆ دەکەم...

منیش هەموو جارێک دەمدا بە لای بیلالدا... زۆرم بەزەیی بە بیلالدا دەهاتەوە... زۆر لەبەر دڵگران بوو ئاوا ئازاریان دەدا... بۆیە ڕۆژێک بە ئومەیەی کوڕی خەڵەفم وت: کورە ئەوە بەزەییت بەم داماوەدا نایەتەوە؟ ئەوە تا کەی ئاوای لێ دەکەی؟

ئومەیە وتی: تۆ خۆت بەم ڕۆژەت گەیاندووە و خۆشت ڕزگاری بکە...

منیش وتم: بێگومان ڕزگاری دەکەم... من کۆیلەیەکی ڕەشپێستم هەیە زۆر لە بیلال بەهێزتر و کاراترە... وەک تۆ بتپەرستە، وەرە با بیانگۆڕینەوە...

ئومەیە وتی: بە دڵمە...

کۆیلەکەی خۆمم دا بە ئومەیە و بیلالم وەرگرت و دەسبەجێ ئازادم کرد...

- باشە قوربان تۆ تەنیا بیلالت ئازاد کردووە، یانی کەسی تریشت ئازاد کردووە؟

+ سوپاس بۆ خوا توانیومە حەوت کەس ئازاد بکەم... هەر حەوتیان مسوڵمان بوون و ئازاریان دەدان...

- ئەوانی تر کێ بوون؟

جگە لە بیلال

عامری کوڕی فوهەیرە...

دایکی عوبەیس...

زننیرە...

**نەهدیە...**

**کچەکەی نەهدیە...**

**کەنیزەکی کوڕەکەی عەمری کوڕی موئمیل.**

**-ئەی قوربان ئازادکردنی هیچ یەکێک لەوانە چیرۆکێکی تایبەتی هەیە؟**

**+ هەندێکیان هەر بە کڕین دەمکڕین و ئازادم دەکردن...**

**هەندێکیشیان چیرۆکی تایبەتییان هەیە...**

- قوربان ئەگەر ئەزیەت نەبێ پێم خۆشە لەو چیرۆکانەم بۆ باس بکەی...

+ باشە کوڕم با بە دڵی تۆبێ... با باسی زننیرەی ڕۆمیت بۆ بکەم... زننیرە کەنیزەکی عومەری کوڕی خەتتاب بوو... پێش عومەر مسوڵمان بوو... عومەر ئەوەندەی لێدا تا کوێر بوو... کەچی قوڕەیشییەکان گوتیان: لات و عوززا زننیرەیان کوێر کرد...

ئەویش بە چاوی کوێرەوە گوتی: بەخوا وا نییە... لات و عوززا هەر ئاگایان لەوانەش نییە کە دەیپەرستن... خوای گەورە دەتوانی بینایی بۆ من بگێڕێتەوە...

بەیانی ئەو شەوە خوای گەورە بینایی بۆ زننیرە گێڕایەوە... کەچی قوڕەیش کردیان بە دەنگوباس و وتیان: محەمەد جادووی کردووە و زننیرەی چاک کردووەتەوە...

قوڕەیشییەکان دەیانگوت: ئەگەر ئەم ئایینە ئایینێکی چاک بووایە زننیرە پێش ئێمە نەدەکەوت و ئێمە پێش ئەو مسوڵمان دەبووین...

خوای گەورە لە وەڵامی ئەو قسانەدا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە و فەرمووی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ﴾ الأحقاف: ١١

واتە: ئەوانەی خودا نەناسن بە خاوەن باوەڕان ئێژن: ئەگەر هیچ شتێکی باشی تێدا هەبا، بەر لە ئێمە بۆی نەدەچوون...

بە بیستنی ئەم ئایەتە کتوپڕ ڕۆیشتم و زننیرەم کڕی و ئازادم کرد...

با بێمە سەر باسی نەهدییە و کچەکەی...

نەهدییە و کچەکەی کەنیزەی ژنێک بوون... ژنەکە لە تیرەی عەبددار بوو... ژنە هەردووکیانی ناردبوو بۆ ئاش... منیش دام بە لای ژنەکەدا، سوێندی دەخوارد و دەیگوت: بەخوا هەرگیز ئازادتان ناکەم...

منیش وتم: کەفارەتی سوێندەکەت بدە...

وتی: کەفارەتی چی... تاوانی تۆیە ئەوانە سەریان لێ تێک چووە... تۆ خۆشت چارەیەکیان بۆ بدۆزەرەوە و ئازادیان بکە...

پێموت: هەردووکیان بە چەند دەفرۆشی؟

وتی: بە ئەوەندە و ئەوەندە دیرهەم...

منیش وتم: وا هەردووکیانم کڕی و هەردووکیانم لەبەر خوا ئازاد کرد... دوایی بە نەهدیە و کچەکەی نەهدییەم وت: ئێوەم کڕیوە و لەبەر خوا ئێوە ئازادن... گەنمەکە ببەنەوە بۆ ژنەکە و بڕۆن بۆ خۆتان بژین...

وتیان: قەینا با گەنمەکەی بۆ بکەین بە ئارد...

وتم: ئیتر ئەوە کەیفی خۆتانە و خۆتان دەزانن...

با بێمە سەر باسی کەنیزەکی کوڕەکەی عەمری کوڕی موئمیل... ئەو کەنیزەکە مسوڵمان ببوو... بنەماڵەی عەمری کوڕی موئمیل لە بەرەی عەدی و لەگەڵ عومەردا ئامۆزا بوون... بەو پێیە عومەر ئازاری ئەو کەنیزەکەی دەدا... ئەوێ ڕۆژێ عومەر هێشتا موشریک بوو... هەموو ڕۆژێ ئەوەندەی لەو کەنیزەکە دەدا خۆی ماندوو دەبوو... دوای ئەوەی ماندوو دەبوو دەیگوت: ببوورە وازت لێ ناهێنم...

ئەویش هەر توورک و نزای شەڕی لە عومەر دەکرد...

کە دەنگوباسی ئەو کەنیزەکەم بیست ڕۆیشتم و ئەویشم کڕی و ئازادم کرد...

- ئای قوربان سڵاوی خوات لێبێ چەندێ تێکۆشەری... بە گیان و بە سەروەت و سامان لە پەرای ئاییندا بووی...

+ کورم! هەرکەسێ بزانێ کە بەندەی خوایە، هەموو کارێکی خێری لەپێناو خوادا لا ئاسان دەبێ...

- قوربان دەزانی زۆر بە پەرۆشم بۆ ئەوەی بگەینە باسی کۆچکردنت لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ)؟ بەڵام مۆڵەتم پێ دەدەی پێش ئەوە پرسیاری دوو شتت لێ بکەم کە پێش کۆچ ڕوویداون؟

+ چییە کورم؟ بپرسە...

- دەمەوێ باسی بارمتەکەی خۆت لەگەڵ ئوبەیی کوڕی خەڵەف و باسی ڕێکنەکەوتنی کۆچ بۆ وڵاتی حەبەشەم بۆ بکەی...

+ باشە بەسەر چاو، جوان گوێم بۆ بگرە...

- قوربان بە گیان و دڵ گوێت بۆ دەگرم... فەرموو...

+ با سەرەتا باسی بارمتەکەی نێوان خۆم و ئوبەیی کوڕی خەڵەف بکەم...

ئەوە وەک خۆت ئاماژەت پێ دا پێش کۆچکردن بوو... دواتریش بارمتەدانان لە ئایینی ئیسلامدا قەدەغە و حەرام نەکرا... چیرۆکەکەش ئەمەیە:

ڕۆم و فارس پێکەوە دەجەنگان... ئێمە لە مەککە بیستمان کە فارسەکان ڕۆمەکانیان شکست داوە... ئێمە ئەوەمان زۆر بە لاوە گران بوو، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) زۆری پێ ناخۆش بوو ئاگرپەرستەکان بەسەر مەسیحیەکاندا سەرکەون... کەچی موشریکەکانی قورەیش بە پێچەوانەی ئێمەوە، زۆریان پێخۆش بوو... لە خۆشیدا ئاهەنگیان

دەگێڕا... دەیانگوت: ئەو گاور و مەسیحیانە ئەهلی کیتابن... خوێنەوارن... ئێمەش نەخوێنەوارین... ئەوەتا برا فارسەکانمان سەرکەوتن بە سەر برا ڕۆمانییەکانی ئێوەدا... ئەگەر ئێوەش لەگەڵ ئێمەدا بجەنگن، بێگومان ئێمە وەک فارسەکان سەر دەکەوین و ئێوەش وەک ڕۆمەکان شکست دەخۆن...

خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ الروم: ١ – ٤

واتە: ئەلیف، لام، میم... ڕۆم شکێنرا... لە نزیکترین کەوشەنی ئەم سەرزەمینە، لە دوای ئەم ژێرکەوتنەیان جارێکی تر سەردەکەونەوە... لە ماوەی کەمتر لە دە ساڵدا.

منیش بەپەلە ڕۆیشتم بۆ لای کافرەکان و پێمگوتن: ئەوە ئێوە بەوە دڵخۆشن کە براکانتان سەرکەوتوون بەسەر براکانماندا؟ نەخێر دەڵخۆش مەبن... بەخوا ئەو دڵخۆشییەتان تا سەر نییە... بەخوا ڕۆمەکان سەردەکەون بەسەر فارسەکاندا... پێغەمبەرەکەمان وای پێ فەرمووین...

ئوبەی کوڕی خەڵەف هەستا و وتی: درۆ دەکەی باوکی وشتر...

منیش وتم: بەخوا تۆ خۆت درۆزنی دوژمنی خوا...

ئوبەی وتی: با گرەو بکەین... تۆ دە لۆک بە بارمتە دابنێ و منیش دە لۆک بە بارمتە دادەنێم... ئەگەر ڕۆم بەسەر فارسدا سەرکەوت تۆ دە لۆکەکەی من ببە بۆ خۆت... ئەگەریش فارسەکان سەرکەوتن من دە لۆکەکەی تۆ دەبەم بۆ خۆم...

بەڵام دەبێ ماوەی بارمتەکە سێ ساڵ بێ...

- قوربان لۆک چییە؟

+ لۆک جۆرێکە لە وشتر، بە وشتری نێریش دەڵێن...

- باشە قوربان تێگەیشتم... ئەی دوایی چی ڕوویدا؟

+ دوایی ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خۆ من نەمگوتووە لە ماوەی سێ ساڵدا... لە ئایەتەکەدا وشەی (في بضع سنين) هاتووە... (بضع) واتە کەمتر لە دە ساڵ -ئیتر لە سێ ساڵەوە تا کۆتایی نۆ ساڵە- بڕۆ ماوەی بارمتەکە زیاد بکە و لەگەڵ ماوەکەشدا ژمارەی وشترەکان زیاد بکە...

منیش ڕۆیشتم و بە ئوبەی گەیشتم... ئوبەی بە منی وت: دەڵێی پەشیمان بوویتەوە؟

منیش وتم: نەخێر... سوورترم، وەرە با ماوەکەیش و وشترەکانیش زیاد بکەین... با بیکەین بە سەد لۆک و ماوەی نۆ ساڵ...

ئوبەی وتی: زۆر باشە ڕازیم...

دوای ئەوەی ئوبەی زانی مسوڵمانان لە مەککەوە کۆچ دەکەن بەرەو مەدینە، ترسا منیش کۆچ بکەم و هات بۆ لام و پێی وتم: من دەترسم تۆش بڕۆی بۆ مەککە و لەوێ ماوەی بارمتەکە تەواو ببێ و وشترەکانم نەدەیتێ... وەرە کەسێک بکە بە کەفیل...

- ئەی دوایی چی ڕوویدا؟

+ ئوبەی لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد... لەو جەنگەدا ڕووبەڕووی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوویەوە... پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی جەنگدا ئەوی بەزاند و برینداری کرد... ئوبەی گەڕایەوە بۆ مەککە، بەڵام زۆری نەبرد بە هۆی ئەو برینەوە ئوبەی مرد...

دوایی ڕۆمەکان و فارسەکان بوو بە جەنگیان... ڕۆمەکان ئەمجارە زاڵ بوون بە سەر فارسەکاندا... ئەمەش حەوت ساڵ دوای ئەو گرەوەی من و ئوبەی بوو... من بردمەوە... عەبدوڵلای کوڕم لە مەککە ڕۆیشتبوو بەرۆکی میراتبەرەکانی ئوبەیی گرتبوو... سەد

وشترەی لێ سەندن و ناردی بۆ مەدینە بۆ من... منیش وشترەکانم بردە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: چی لێ بکەم قوربان؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیانکە بە خێر...

- باشە قوربان بۆ چرکەیەکیش بێ نەترسای ئەو گرەوە بدۆڕێنی؟

+ نا سوێند بە خوا بۆ یەک چرکەش دوودڵ نەبووم، چونکە ئەوە بەڵێنی خوا و پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ)... ئیتر چۆن دوودڵ بم؟ من دڵنیا بووم کە دەیبەمەوە، خۆ من بۆ دەسکەوتنی چەند وشترێک ئەو گرەوەم نەکردبوو، بەڵکوو من گرەوی ئەوەم کردبوو کە بەڵێنی خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕاستە و دەیتە دی...

- ئای شیری دایکت بە نۆشی گیانت بێ...

+ باشە کوڕم پێم بڵێ: ئەم باسە تەواو، یان ماویەتی؟

- بەڵێ قوربان تەواو... ئێستا دەتوانی باسی کۆچکردن بۆ حەبەشە بکەی؟ تۆ چۆن کۆچەکەت بۆ ڕێک نەکەوت؟

+ باشە کوڕم بۆت باس دەکەم...

- دەی فەرموو قوربان، بە گوێ، بە دڵ، بە گوێچکەی دڵ، گوێت بۆ دەگرم...

+ قورەیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئێمەی زیاتر ئازار دەدا... منیش بە مەبەستی کۆچکردن بۆ حەبەشە و گەیشتن بە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب لە مەککە دەرچووم... گەیشتمە شوێنێک پێی دەڵێن: (برک الغماد)... ئەو شوێنە ماوەی پێنج ڕۆژە ڕێ لە مەککەوە دوورە... لەوێ گەیشتم بە ڕەبیعەی کوڕی ئیبنولددەغنە... خۆی ناوی ڕەبیعەی کوڕی فەهیم بوو، لە تیرەی (قارە) بوو، دایکی ناوی دەغنە بوو، ژنێکی زۆر بەناوبانگ بوو، بۆیەش منداڵەکانی بە ناوی ئەوەوە ناویان دەرکردبوو...

ڕەبیعە پێی وتم: ئەبوبەکر ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

منیش وتم: گەلو هۆزەکەم ڕاویان ناوم، دەمەوێ بڕۆم بۆ شوێنێک و بە سەربەستی و ئازادی خواپەرستی خۆم بکەم...

ڕەبیعە وتی: کورە ئەوە چی دەڵێی؟ پیاوی وەک تۆ نابێ دەربکرێ و نابێ بڕوا... تۆ کەسێکی سیلەی ڕەحم جێبەجێ دەکەی، یارمەتی هەژاران دەدەی، کەسێکی ماڵدار و میوانداری، پشتگیری لە هەق دەکەی، من دەبمە پەنا و پارێزەری تۆ... بگەڕێوە بە کەیفی خۆت خواپەرستی خۆت بکە و کەس بۆی نییە دەستت بۆ درێژ بکات، تۆ لە ئەمڕۆوە لە پەنای منذای...

بەوجۆرە من و ڕەبیعە پێکەوە گەڕاینەوە بۆ مەککە... کاتێ گەیشتینە مەککە ڕەبیعە تەوافێکی عەکبەی کرد... دوایی ڕۆیشتە دارولنەدوە و بە پیاوماقوڵانی قورەیشی وت: ئەبوبەکر نە دەڕوا و نە دەردەکرێ... باشە ئێوە چ جۆرە مرۆڤێکن؟ پیاوێک دەردەکەن کە سیلەی ڕەحم جێبەجێ دەکا... یارمەتی هەژاران دەدا... ماڵدار و میواندارە... پشتگیری لە هەق دەکات؟

پیاوماقوڵەکان ماوەیەک مات و بێدەنگ بوون، چونکە دەیانزانی قسەکانی ڕەبیعە هەمووی ڕاستە... دوایی وتیان: دەی بە ئەبوبەکر بڵێ لە ماڵی خۆیدا خواپەرستی خۆی بکا... لە ماڵی خۆیدا چەندەی پێخۆشە نوێژ بکا... قورئان بخوێنێ... ئازاری ئێمەش نەدا... ئێمە پێمان ناخۆشە ببێتە بایسی ئەوەی ژن و کوڕوکاڵمان لە ئایینی باب و باپیرانمان لا بدەن و شوێن ئەو و هاوڕێکەی بکەون...

ڕەبیعە وتی: باشە با بە دڵی ئێوە بێ...

منیش ماوەیەک بەو جۆرە بووم... دوایی لە تەنیشت ماڵی خۆمانەوە مزگەوتێکی بچکۆلەم دروست کرد... لەو مزگەوتەدا بۆ خۆم نوێژی خۆم دەکرد... قورئانم دەخوێند... کاتێ قورەیشییەکان

بەوێدا تێدەپەڕین لای مزگەوتەکەی مندا ڕادەوەستان و گوێیان لە نوێژ و قورئانخوێندنەوەی من دەگرت... سەرانی قوڕەیش ئەوەیان پێ ناخۆش بوو... ڕۆیشتن بۆ لای ئیبنولدەغنە و ئاگاداریان کردەوە و پێیان وت: ئێمە ئەبوبەکرمان دایە پەنای تۆ و دەیپارێزین، بەو مەرجەی لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژ و خواپەرستی خۆی جێبەجێ بکات... ئێستا ئەو زێدەڕەوی دەکات و لە پەنا ماڵەکەی خۆیدا مزگەوتێکی دروست کردووە، ئێمە دەترسین ژن و کوڕوکاڵمان لە خشتە ببا... بڕۆ پێی بڵێ واز لەو کارە بێنێ... ئەگەر پێی خۆشە لە ماڵەوە بە نهێنی خواپەرستی خۆی بکا ئەوە باشە، ئەگەریش پێی خۆشە بەمجۆرەی ئێستای بە ئاشکرا خواپەرستی بکات با پەناکەی بۆ تۆ بگێڕێتەوە، ئێمە پێمان ناخۆشە ئەو لە پەنای تۆدا بێ و شتێکی لێ بەسەر بێنین... ئێمە ڕازی نابین بە دەنگی بەرز قورئان بخوێنێ و نوێژ بکات...

دوای ئەوە ڕەبیعە هات بۆ لای من، وتی: ئەبوبەکر! تۆ خۆت دەزانی کە لە پەنای مندای... یان بە نهێنی خواپەرستی خۆت بکە، یان پەناکەم بۆ بگێڕەوە... من پێمخۆش نییە پیاوێک لەنێو عەرەبدا لە پەنای مندا بێ و شتێکی لێ بەسەر بێ...

منیش پێمگوت: زۆر سوپاست دەکەم ئەوا پەناکەم بۆت گێڕایەوە و خۆم دەهاوێژمە پەنای خوای گەورە...

- قوربان وا دیارە ئیبنولدەغنە پیاوێکی پیاوانە بووە...

+ بەڵێ! سوێند بە خوا پیاوێکی پیاوانە و ماقوڵ بوو... ئاکار و ڕەفتاری عەرەبی سەردەمی نەفامی وابوو، ئەوان هەرچەند بتپەرست و موشریک بوون، بەڵام هەندێ ئاکار و ڕەفتاری زۆر مەزن و گەورەیان هەبوو... پێغەمبەریش(ﷺ) دانی بەوەدا ناوە کە عەرەب ئاکار و ڕەفتاری باشی هەبووە، خۆی فەرموویەتی: من

بۆیە نێردراوم بۆ ئەوەی ببمە تەواوکەری هەموو ئاکار و ڕەفتارە جوانەکان...

ئەمەش خۆی لە خۆیدا دانپیانانێکە کە عەرەب ئاکار و ڕەفتاری جوانیان هەبووە... زۆر سەیرە! لەگەڵ ئەوەی کە ئاکار و ڕەفتاری جوانیان زۆر بوو، کەچی هەندێ ئاکار و ڕەفتاریشیان هەبوو زۆر ناشیرین بوو... خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی نارد بۆ ئەوەی خەڵکی بانگ بکات بۆ سەر ئایینی یەکتاپەرستی و لەسەر ئاکار و ڕەفتارە جوانەکانی خۆیان بمێننەوە و هەرچی ئاکار و ڕەفتاری خراپیش هەیە وازی لێ بینن و لێی دوور بکەونەوە و لەجیاتی ئەوانە ئەو ئاکار و ڕەفتارانە جێبەجێ بکەن کە ئایینی ئیسلام فێریان دەکات...

- بەخوا ڕاست دەکەی قوربان...

+ باشە کوڕم... وەڵامی خۆت وەرگرت؟

- بەڵێ قوربان، وەڵامی خۆمم وەرگت، بەڵام هێشتا لە بینینی تۆ تێر نەبووم، زۆرم ماوە... قسە و پرسیاری زۆرم پێیە...

❀ ❀ ❀

- قوربان ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لەمەڕ شتێک پرسیارت لێ بکەم، کە هەموو تاکێکی مسوڵمان سەبارەت بەو شتە خۆزگەت پێ دەخوازێ... هەتا قامی قیامەتیش مسوڵمانان خۆزگەت پێ دەخوازن...

+ ئەو شتە چییە کوڕم؟

- قوربان کۆچی جەنابت لە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەوە بۆ مەدینە...

+ بە خوا ئەو دەمانە جوانترین ڕۆژەکانی ژیانی منن... هەرچەندە کۆچەکە پڕ بوو لە زەحمەت... ڕێگا ترسناک بوو... ئێمە پەرێشان بووین... من جگە لە ترسی گیانی خۆم، زیاتر خەمی گیانی پێغەمبەری خوام بوو(ﷺ)... هەردووکمان خەمی ئەم ئایینەمان بوو... بە هەموو ئەوانەشەوە هیچ شتێک هێندە گەورە نییە لەگەڵ ئەو کۆچەدا باس بکرێ، چونکە من لەو کۆچەدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووم... ئەو کۆچە بوو کە بوو بە خاڵی وەرچەرخانی ئەم ئەستێرەی زەوییە... ئایینی ئیسلامی لە تەنگوچەڵەمەوە کەوتە نێو خێر و خۆشی... ئایینێک کە قەدەغە بوو، دوای ئەو کۆچە بوو بە خاوەنی دەوڵەت... توخوا چی هێندەی ئەوە خۆشە مرۆڤ لە خزمەت پێغەمبەری خوادابێت(ﷺ)... دووبەدوو پێکەوە بووین... ئای ئەو ڕۆژانە چەندێ جوان بوون... بەڵێ تۆ ڕاست دەکەی کوڕم، ئەو ڕۆژانە هێندە مەزن بوون بۆ ئەوە دەشێ هەموو کەسێ خۆزگەی پێ بخوازێ...

- دەی قوربان مادەم وایە زۆر بە تاسەوە گوێت بۆ دەگرم و تۆش وردە وردە باسی ئەو ڕۆژانەم بۆ بگێڕەوە...

+ باشە کوڕم... دەی گوێ بگرە با بۆت باس بکەم...

- پێش گوێ دڵم لە لاتە قوربان... فەرموو...

+ من زۆر زوو زوو دەچوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و داوام لێ دەکرد مۆڵەتم پێ بدا کۆچ بکەم... ئەویش دەیفەرموو: پەلە مەکە، بەڵکوو خوای گەورە هاوڕێیەکت بۆ بگەیەنێ... منیش بە گوێی پێغەمبەرم(ﷺ) دەکرد و چاوەڕوانی هاوڕێیەکی باشم دەکرد... بە دڵ ئاواتم ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو شەرەفە بە من بدات و مەبەستی لەو هاوڕێیە خۆی بێ...

عادەتی پێغەمبەر(ﷺ) وابوو یان بەیانیان یان ئێواران دەهات بۆ

ماڵی من... کەچی ڕۆژێک نیوەڕۆ خۆی کرد بە ماڵی ئێمەدا... منیش وتم: قوربان هەرچی سەیر دەکەم پێغەمبەری خوا بۆ کارێکی گرنگ تەشریفی هێناوە... ئەگینا هەرگیز ئا لەم کاتانەدا تەشریف ناهێنێ بۆ ئێرە... هەرچۆنێ بێ پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە و منیش جێگام بۆ ڕاخست... سەرینێکم بۆ دانا... تەنیا من و عایشە و ئەسما لەو ژوورەدا بووین...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوانە بکە دەرەوە...

منیش وتم: قوربان ئەوانە کچەکانی خۆمن... چی بووە خۆم و دایک و باوکم بە قوربانت بین؟

فەرمووی: خوای گەورە مۆڵەتی کۆچی پێ داوم...

منیش وتم: دەی قوربان بمکە بە هاوڕێی خۆت...

فەرمووی: هاوڕێی من بە...

هەمیشە دڵم دەیگوت: پێغەمبەری خوا لەگەڵ تۆدا کۆچ دەکات... بۆیە دوو وشتری باشم بۆ کۆچ ئامادە کردبوو... پێموت: قوربان جوتێ وشتری باشم ئامادە کردووە... یەکێکیان بۆ تۆ یەکێکیان بۆ خۆم...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە کڕین نەبێ نامەوێ...

منیش وتم: قوربان با بە دڵی جەنابت بێ...

- باشە گەورەم! خۆ لەنێوان تۆ و پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ئەو شتانە نەبوو، بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە کڕین نەبێ نامەوێ؟ سەیرە... مەگەر هەر خۆی نەیفەرمووە: باشترین کەس کە بە ماڵ و بە گیان لە خزمەت مندا بووبێ ئەبوبەکر بووە؟

+ با کوڕم وای فەرموو... ئەو شتانەش لەنێوان من و پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نەبوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئەو وشترەی بە کڕین لە من وەرگرت، مەبەستیشی ئەوەبوو بە گیان و سەروەت و سامانەوە

بە مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە کۆچ بکات... هەر بۆ ئەوەش بوو من زۆر لەسەری نەڕۆیشتم، چونکە دەمزانی مەبەستی چییە...

- باشە قوربان... ئەی دوایی چی ڕوویدا؟

+ پێغەمبەر(ﷺ) و من نەخشەی کۆچمان کێشا... وامان بە باش زانی کە بە پێ هەتا ئەشکەوتی (سەور) بڕۆین... لەوێ سێ ڕۆژ بمێنینەوە، چونکە بێگومان بووین لەوەی کە قورەیش بەدوای ئێمەدا دەگەڕێ... ئەگەر ئێمە سێ ڕۆژ لەوێ بمێنینەوە، ئیتر وا دەزانن کە ئێمە ڕۆیشتووین و تازە لە دەست دەرچووین، بەو جۆرە ئەوانیش کۆڵ دەدەن و بەدوای ئێمەدا ناگەڕێن...

ئێمە پیاوێکی زۆر وریا و شارەزای بیابانمان بە کرێ گرتبوو... پیاوەکە ناوی عەبدوڵلای کوڕی ئورەیقط بوو... بۆیەش بە کریمان گرت تا ببێ بە ڕێنیشاندەرمان و بمانگەیەنێ بە شاری مەدینە... ڕێگایەکم بۆ هەڵبژێری هیچ کەسێ پیا نەڕوا و کەس گومانی بۆ ئەو ڕێگایە نەچێ... بۆیە وا ڕێکەوتین کە دوای سێ ڕۆژ لەگەڵ عامری خزمەتکارمدا وشترەکان بێنن و بێن بۆ لای ئەشکەوتە... ئەگەر هەموو شت بە ڕێکوپێکی بەڕێوە چوو، ئیتر بە ناوی خوای گەورەوە و پشت بە خوا درێژە بە کۆچەکەمان دەدەین...

پێغەمبەر(ﷺ) وەسیەتی بۆ عەلی کوڕی ئەبوتالیب کرد کە ئەو شەوەی ئێمە شاری مەککە بەجێ دەهێڵین ئەو لە جێگاکەی پێغەمبەردا(ﷺ) بخەوێ با قورەیش وا بزانن کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵە و خەوتووە... وەسیەتیشی بۆ کرد دوای کۆچ بڕوا هەموو ئەو شتانەی کە بە ئەمانەت لای دانرابوو بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، چونکە لەناو قورەیشدا هەرکەسێ شتێکی گرنگی هەبووایە و متمانەی بە هیچ کەس نەبووایە لای دایبنێ، ئەوا دەیهێنایە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لای ئەو بە ئەمانەت دایدەنا، چونکە هەمووان دەیانزانی

**هیچ کەسێ هێندەی پێغەمبەر(ﷺ) دەستپاک و ئەمانەتپارێز نییە...**

ئێمە ڕۆیشتین... جگە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب و ماڵ و منداڵی من و عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقط و عامر نەبێ هیچ کەس نەیدەزانی ئێمە لە کوێین و بۆ کوێ چووین...

کاتێ خەریک بوو لە کۆتا خاڵی بەرزاییەکانی مەککە ئاودیو ببین، پێغەمبەر(ﷺ) بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە وەستا و ڕووی کردە مەککە و فەرمووی: بەخوا خۆشەویستترین شوێنی سەر زەویت بە لای منەوە... ئەگەر خەڵکەکەت منیان دەرنەکردایە هەرگیز بەجێم نەدەهێشتی...

ئێمە بەرەو ئەشکەوتی سەور بە ڕێگاوە بووین، من جارێک لە لای ڕاستی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕێم دەکرد... جارێک لە لای چەپیەوە... جارێک لە پێشیەوە و جارێک لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ)...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بۆ وا دەکەی ئەوبەکر؟

منیش وتم: قوربان دەترسم لە پێشەوە پێت بزانن و تیرێکت پێوە بنێن، بۆیە دێمە پێشتەوە... دوایی دەترسم لە پاشەوە یەکێک شاڵاوت بۆ بێنێ، بۆیە دەچمە دواوە... ترسی تۆم لە دڵایە...

هەرچۆنێک بێ گەیشتینە ئەشکەوتی سەور... ڕۆیشتینە ژوورەوە... خۆمان پەنا دا... قورەیش بە دواماندا دەگەڕان... ئەبوجەهل ڕۆیشتبووە ماڵی من و پرسیاری منی لە ئەسما کردبوو... وتبووی: کوا باوکت؟

ئەسما وتبووی: نازانم باوکم لە کوێیە؟

ئەبوجەهل دەستی لێ بەرز کردبوویەوە و زللەیەکی توندی لێدابوو... ئەوەندە توند لێیدابوو نەرمەی گوێی تلیشابوو گوارەکەی لە گوێ کەوتبوویە خوارەوە...

- ئای قوربان... ئێوە هەر بە خاوخێزانەوە لەپێناو ئەم ئایینەدا تووشی نارەحەتی و چەرمەسەری زۆر بوونەوە...

+ سوپاس بۆ ئەو خوایە کە ئێمەی کرد بە سەربازی خۆی بۆ ئەوەی ببین بە کۆچەری ئەم کۆچە پیرۆزە و یارمەتیدەری کۆچەر...

- دەی قوربان دواییدا چی قەوما؟

+ قورەیشیەکان شوێنپێی ئێمەیان هەلگرت... هاتنە بەردەم ئەشکەوتەکە، بەڵام خوای گەورە سەری لێ تێک دان و ئەشکەوتەکەیان بەجێهێشت و بەرەو لووتکەی کێوەکە سەرکەوتن... کەمێک پێش ئەوەی بگەنە بەردەم ئەشکەوتەکە خوای گەورە جاڵجاڵۆکەیەکی هەنارد و دەرگای ئەشکەوتەکەی تەنی... ئەوانیش چاویان بە تۆڕی جاڵجاڵۆکەکە کەوت و وتیان: ئێرە چۆڵە... ئەگەر کەسێ لێرەوە بڕۆشتایەتە ژوورەوە ئەم تۆڕە دەدڕا...

پێغەمبەر(ﷺ) و من لە ژوورەوە بووین... ترسم لێ نیشت، لەبەر خۆم نا، بەڵکوو لەبەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)... من بگیرامایە و بکوژرامایە هیچ نەدەقەوما، بەڵام ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) شتێکی لێ بەسەر بهاتایە، ئیتر ئەم ئایینە دەکوژایەوە و تیادەچوو...

بە پێغەمبەرم(ﷺ) وت: قوربان خۆ ئەگەر یەکێک لەوانە تەماشای بەرپێی خۆی بکات چاوی بە خۆمان دەکەوێ...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبوبەکر! گومانت چییە بە دوو کەس کە سێیەمیان خوای گەورەیە؟

خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دابەزاند و فەرمووی:

﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ التوبة: ٤٠

واتـە: ئەگـەر ئێـوە پشـتگیری پێغەمبـەر(ﷺ) نەکـەن و یارمەتـی نـەدەن، ئـەوە بەڕاسـتی خـوا پشـتگیری کـرد و سـەری خسـت، کاتێک ئەوانـەی بێبـاوەڕ بـوون دەریانکـرد لـە شـاری مەککـە و یەکێـک بـوو لـەو دوو کەسـە کاتێـک هەردووکیـان لەنـاو ئەشـکەوتەکەدا بـوون (کاتێـک بێبـاوەڕەکان گەشـتبوونە دەوروبـەری ئەشـکەوتەکە ئەبوبەکـری هاوەڵـی خەمـی لێهـات) پێغەمبەریـش(ﷺ) دڵـی دایـەوە و پێـی وت: خەفـەت مەخـۆ، دڵنیابـە خوامـان لەگەڵـە، ئەوسـا ئیتـر خـوا ئاسـوودەیی و ئارامـی خـۆی دابەزانـدە سـەری و پشـتگیری لـێ کـرد و بەهێـزی کـرد بـە سـەربازانێک کـە ئێـوە نەتاندەبینیـن و بەرنامـە و ئایینـی بـێ باوەڕانـی دانەوانـد و ڕیسـواتری کـرد، بەرنامـە و ئایینـی خوایش هەمیشـە بەرز و بڵندترە، خوایش هەمیشـە باڵادەسـت و دانایە.

- ئـای خۆزگـەم بـە خـۆت قوربـان... پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) خـۆی بـە دەنگ و سـەدای خـۆی دڵـی تـۆی دایـەوە... بـە قسـەیەک کـە مێـژوو قسـەی هێنـدە جوانـی تۆمـار نەکـردووە و تۆماریشـی ناکـا... ئەبوبەکر! گومانت چییە بە دوو کەس کە سێیەمیان خوای گەورەیە؟

خۆزگـەم بـە خـۆت قوربـان... لـە بـارەی تـۆوە ئایەتێکـی وا دابەزیـوە هەتـا ڕۆژی پەسـڵان هـەر دەمێنـێ و هـەر دەخوێنـرێ... خـوا خـۆی شـایەتی ئـەوەی داوە کـە تـۆ هاوڕێـی پێغەمبەرەکـەی(ﷺ) بـووی...

+ ئەوە بەخششی خوایە و بەو کەسانەی دەدا کە خۆی دەیەوێ پێیان بدا... سوپاس بۆ خوای گەورە... سوپاس بۆ ئەو بەخششـە گەورەیە...

- باشە قوربان با پرسیارێکیترت لێ بکەم...

+ بیکە کوڕم پرسیاری خۆت بکە...

- کاتـێ ئێـوە لـە ئەشـکەوتەکەدا بـوون تـا ئـەو کۆچـە مـەزن و پیـرۆزە تـەواو بکـەن، هیـچ دەنگوباسـێکی نـاو شـاری مەککەتـان پـێ دەگەیشـت؟

+ ئێمــە هەمــوو شــتێکمان دەزانــی و هەمــوو دەنگوباســێکمان پــێ دەگەیشــت...

- چۆن؟

+ پێموتی: ئێمـە نەخشـەیەکی تۆکمەمـان بۆ کۆچ دارێژا... یەکێک لە خاڵەکانی نەخشـەکە ئەوەبوو کە عەبدوڵڵای کورم ڕۆژانە لـە مەککەدا بە نـاو کوچـە و کۆڵان و بـازاڕی مەککەدا بگەڕێ و هەمـوو هەواڵێکی دەست بکـەوێ و بزانێ چی دەکەن و نیازی چییان هەیە... ئەمە بە ڕۆژدا... کـە شـەویش دادەهـات عەبدوڵـڵا دەهـات بـۆ ئەشـکەوتەکە و هەموو شتێکی بۆ دەگێڕاینـەوە... شـەوانەش تـا بەرەبەیان لـە بـەردەم ئەشکەوتەکەدا دەبـوو بـە پاسـەوان و کاتێ دونیـا ڕووناک دەبوویـەوە ئیتـر دەڕۆیشـتەوە بـۆ مەککـە... خەڵکی مەککـە بـە ڕۆژدا لـە بـازاڕا دەیانبینـی و ئیتـر گومانـی ئەوەیـان لـێ نەدەکـرد کـە شـەو لای ئێمـە بووە و تـا بەیانی پاسـەوان بووە...

- بەخـوا قوربـان نەخشـەیەکی تۆکمـە و بەهێـز بـووە، بـەڵام نەدەترسـان کـە قورەیشـیەکان جارێکی تر بەرەو ئەشکەوتەکە بێنەوە؟

+ دڵنیـا بوویـن کـە دووبـارە نایەنـەوە، بـەڵام پارێزیشـمان هـەر دەکـرد...

- قوربان دەمەوێ زیاتر بۆم ڕوون بکەیتەوە...

+ مـن بـە عامـری خزمەتکاری خۆمـم گـوت لەگـەڵ شـوانەکانی قورەیشـدا دەربچێـت و مەڕەکانـم بلەوەڕێنـێ، بـۆ ئـەوەی کـەس گومانی هیچـی لێ نـەکا... بەو جۆرە ئێواران بە خۆی و مەڕەکانـەوە دەهاتـە لای ئەشـکەوتەکە... شـیری بـۆ دەدۆشـین و ئێمـەش تێـر شـیرمان دەخـواردەوە... دوایـی لـە شـوێنەوەی کـە عەبدوڵـڵای کـوڕم پێیدا دەڕۆیشـتەوە بۆ مەککە، مەڕەکانی بـەرەو مەککـە دەبـردەوەو بـۆ ئـەوەی شـوێن پـێـی عەبدوڵـڵاش بسـڕێتەوە...

**- ئای لەو هۆشیاری و زیرەکییە...**

**+ کورم! پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی فێر کردبوو هەتا بۆمان دەست بدات و هەتا بتوانین دەست بە هۆکارەکانەوە بگرین... دواییش پشت بە خوای گەورە و تاک و تەنیا ببەستین نەک هۆکارەکان... ئەی مەگەر نازانی کە پێغەمبەر(ﷺ) عەبدولڵای کوڕی ئورەیقطی بە کرێ گرت بۆ ئەوەی ببێ بە ڕێنیشاندەرمان؟ خۆ پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرموو: من پێغەمبەرم و خوای گەورە ناهێڵێ لەو دەشت و بیابانەدا وێڵ و سەرگەردان ببم و خۆی دەمگەیەنێتە مەدینە! خۆ بە خوا خوای گەورە بۆ خۆی ڕێنوێنی دەکرد... هەرچۆنێک بووایە هەر دەگەیشتە مەدینە، بەڵام ویستی ئوممەتەکەی فێر بکات تا بە پێی توانا و بە پێی گونجان دەست بە هۆکارەکانەوە بگرن و پشت بە خوا ببەستن...**

- قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... ئا لەو کاتە نارەحەت و مەترسیدارەشدا هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بە کردەوە ئوممەتەکەی فێر بکات و ڕێگای ڕاستیان پێ نیشان بدات و فێریان بکات دەست بە هۆکارەوە بگرن و پشت بە خوا ببەستن...

+ بەڵێ! بە خوا پێغەمبەر(ﷺ) وابوو...

- باشە قوربان من پرسیارێکم بۆ هاتووەتە پێشەوە...

+ پرسیاری خۆت بکە کورم...

- تۆ فەرموت: باوکم لە کاتی ڕزگاربوونی مەککەدا مسوڵمان بوو... ئەی کاتی کۆچ؟ دەمەوێ بزانم هەڵوێستی باوکت چۆن بووە و چی کردووە؟

+ باوکم پێش کۆچ نابینا ببوو... کاتێ بیستی کە من کۆچمم کردووە هاتبووە ماڵی من و هەواڵی مناڵەکانی منی پرسیبوو... بە ژنەکەمی وتبوو: بەخوا وا دەزانم ئەبوبەکر بە گیان و بە سەروەت

و سامانەوە ڕۆیشتووە و ئێوەی تووشی خەم و خەفەت کردووە... ڕێک وابوو کە باوکم هەستی پێ کردبوو... من هەموو سەروەت و سامانەکەم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتبوو وتم: نەکا لە ڕێگا پێویستمان پێی بێ، بەڵام ئەسمای کچم زۆر وتووریا و ژیر بوو... بوخچەیەکی بچوکمان هەبوو، بنی بوخچەکەی پڕ کردبوو لە وردە بەرد و لە سەرەوەش هەندێ خشڵ و زێڕی خۆی و عایشەی خوشکی و دایکی دانابوو، پارچەیەکی دابوو بە سەریدا و بردبووی بۆ لای باوکم و پێی وتبوو: نا باپیرە گیان وا نییە... باوکم ئەو هەمووە سەروەت و سامانەی بۆ ئێمە بەجێ هێشتووە... ئەوەتا دەستی لەسەر دابنێ...

باوکیشم دەستی لەسەر بووخچەکە دانابوو... دەستێکی هێنابوو بە سەر خشڵەکاندا... ئیتر وایزانیبوو ئەوە هەمووی پارەیە و من بۆ مناڵەکانم بەجێ هێشتووە...

- کورە قوربان ئێوە هەر هەمووتان وریا و ژیر و لێزانن... پاک و بێگەردی بۆ خوای مەزن... مناڵەکانیشت وەک خۆت ژیر و وریا بوون...

+ سوپاس بۆ خوای مەزن و لە کارزان...

- دەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ سێ ڕۆژ لە ئەشکەوتەکە ماینەوە... جموجووڵ کەمێک دامرکایەوە... وەک جاران خەڵک بە دوای ئێمەدا نەدەگەڕا... قوڕەیش لە دۆزینەوەی ئێمە نائومێد بوون... تەنانەت وایان لێهاتبوو سەد وشتریان کردبوو بە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە ئێمە بە مردوویی، یان زیندوویی دەباتەوە بۆ ئەوان...

عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقطی ڕێپیشاندەری زۆر وریا و عامری خزمەتکاری بەئەمەک و وەفا، هاتنەوە بۆ لامان... ئێمەش دەستمان

کرد بە ڕۆیشتن بەرەو مەدینە... سۆز و میهرەبانی خوای گەورەش هاوڕێ و هاوسەفەرمان بوو... خوای گەورە خۆی چاودێری کردین و گەیشتینە شاری مەدینەی پیرۆز...

- قوربان پێش ئەوەی باسەکە بگەیەنین بە شاری مەدینە، دەمەوێ پرسیاری دوو شتت لێ بکەم، ئیزنم دەدەی؟

+ بەڵێ کوڕم! چ پرسیارێکت هەیە بیکە...

- دەمەوێ پرسیاری ئەوەت لێ بکەم کاتێ ئێوە بە لای دەوارەکەی (أم معبد)-ی خوزاعیدا تێپەڕین، چ ڕوویدا؟

+ پرسیاری چ شتێکی تر دەکەی بیکە کوڕم...

- قوربان دەمەوێ پرسیاری سووراقەی کوڕی مالکیش بکەم... چیرۆکی ئەویشم بۆ باس بکە... بیستنی ئەو چیرۆکانە لەسەر زاری کەسێکی وەک جەنابت لە هەموو شتێکی ئەم دونیایە خۆشترە...

+ لە ڕێگەی چوون بۆ مەدینە بە لای دەوارێکدا تێپەڕین... ڕەشماڵی (أم معبد)-ی خوزاعیە بوو... ئەو ژنە ژنێکی زۆر پاک و دلاوا و سەخی بوو... میوان دۆست بوو... یارمەتی مرۆڤی کۆچەری دەدا... داوای هەندێ گۆشت و خورمامان لێ کرد بە پارە لێی بکڕین، هیچیانی نەبوو... ئەو کاتە ئەوان زۆر هەژار و نەدار بوون... مێردەکەی ڕانە مەڕەکەیانی بردبوو بۆ دەرودەشت بۆ لەوەڕاندن... پێغەمبەر(ﷺ) مەڕێکی لەڕی بینی لە تەنیشت ڕەشماڵەکە بەسترابوویەوە... فەرمووی: دایکی مەعبەد ئەو مەڕە چییە؟

وتی: ئەو مەڕە ناتوانێ لەگەڵ ڕاندا دەربچێ... باوکی مەعبەد بەجێی هێشتووە و لەگەڵ ئاژەڵەکاندا نەیبردووە...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مۆڵەتم پێ دەدەی بیدۆشم؟

وتی: دەی خوا بمکا بە قوربانت ئەگەر دەزانی شیری تیایە بیدۆشە...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو مەڕەم لێ نزیک بکەنەوە... مەڕەکەمان لێ نزیک کردەوە... ناوی خوای هێنا... دوایی بە دەستی پیرۆزی خۆی دەستێکی هێنا بە گوانی مەڕەکەدا... دوایی مەڕەکەی دۆشی... کاسەیەکی گەورە شیری دا... دایکی مەعبەد واقی وڕما... باشە ئەم مەڕە بێ شیرە پەککەوتووەی کە دوێنێ چۆڕێ شیری تیا نەبوو، ئێستا چۆن کاسەیەکی گەورە شیری تیایە؟

پێغەمبەر(ﷺ) شیرکەی دا بە دایکی مەعبەد و فەرمووی: سەرەتا تۆ تێری لێ بخۆ...

دایکی مەعبەد تێر شیری خواردەوە... دوایی دای بە ئێمە و ئێمەش تێرمان لێ خواردەوە، دوای هەمووان خۆی لێی خواردەوە...

بۆ جاری دووەم پێغەمبەر(ﷺ) مەڕەکەی دۆشییەوە و دیسان کاسەکە پڕ بوو لە شیر... شیرەکەی دا بە دایکی مەعبەد و فەرمووی: ئەوەش بۆ باوکی مەعبەد و منالەکان، با ئەوانیش تێری لێ بخۆن...

دوای ئەوەی هەمووان تێر بووین و پشوویەکمان دا، ملی ڕێگامان گرتەوە بەر...

- مەڕێکی لەڕی پەککەوتە ئەو هەمووە شیرەی دا؟ بەخوا سەیرە... ئای قوربانت بم پێغەمبەری خوا چەندێ بەپیت و فەڕ و پیرۆز بووی...

+ کورە کوڕی خۆم بەخوا پێغەمبەر پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر هەر پیرۆز بوو... ئیتر دوای بوون بە پێغەمبەر چۆن پیرۆز نابێ؟ کاتێ خۆی مەڕەکانی ماڵی حەلیمەی سەعدیە لاوازترین و لەڕترین مەڕی خێڵی سەعد بوون... دوای ئەوەی حەلیمە هات بۆ مەککە و پێغەمبەری(ﷺ) برد بۆ ئەوەی شیری پێ بدا و ببێ بە دایەنی، خێر و بەرەکەت و پیت و فەڕ کەوتە ماڵیەوە... مەڕەکانی ئەوەندە قەڵەو بوون، ئەوەندە شیردار بوون ناوبانگیان دەرکرد... وای لێ هات

خەڵکی بە شوانەکانی خۆیان دەگوت: ئا بزانە ماڵی حەلیمە لە کوێ مەڕەکانیان دەلەوەڕێنن، تۆش لەوێ بیلەوەڕێنە...

- بەخوا ئەوە پیرۆزییە... ئەوە خێر و بەرەکەتێکی زۆر گەورە و مەزنە، ئای بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)...

❀ ❀ ❀

- باشە قوربان! ئەوە باسی دایکی مەعبەد، ئەی باسی سوراقەی کوڕی مالیک؟ بێزەحمەت باسەکەی ئەویشم بۆ بگێڕەوە...

+ باشە... پێشتر پێموتی کە قورەیش سەد وشتریان کردە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە ئێمە بە مردوویی یان زیندوویی دەباتەوە بۆیان... سوراقە پیاوێکی سوارچاک، وریا، تۆڵەستێن، تیرئەناز و دەستڕاست بوو... زۆر بە جوانی شوێنپێی خەڵکی هەڵدەگرت و نەیدەهێشت کەس لە دەستی دەربچێ... سوراقە لە مەککە لەناو کۆمەڵێ پیاوا دانیشتبوو... پیاوێک بە لای ئەو کۆمەڵەدا تێپەڕیبوو وتبووی: سێ چوار کەسم لەو بیابانە بینی، وای بۆ دەچم محەمەد و هاوڕێکانی بن...

سوراقە بە ئاماژە پێی وتبوو: بێدەنگ بە... دوایی خۆی وتبووی: من ئەوانەم بینیوە ئەوانە فلانکەس و فلانکەس بوون، شتێکیان ون کردووە و بە دوایدا دەگەڕێن...

بە قسەی ئەو پیاوە سوراقە دڵی لێیدابوو کە ئەو کۆمەڵە ئێمەین، ئەو ئێمەی خۆش نەدەویست، بۆیە وای کرد خۆی بە تەنیا خەڵاتەکە بباتەوە... دوایی بەپەلە ڕۆیشتبوویەوە بۆ ماڵەوە و خۆی پڕچەک کردبوو... سواری ئەسپەکەی ببوو... شوێن ئێمە کەوت...

سوراقە لە دوورەوە چاوی بە ئێمە کەوت... بە دوای ئێمەدا هات... ئێمەش کەمێک خێراتر ڕێگامان گرتە بەر... چاوم لێبوو

سوراقە لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە... هەستایەوە و سواری ئەسپەکەی بوویەوە، بەڵام دووبارە کەوتە خوارەوە... ئیتر بۆی دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە لایەن خوای گەورەوە پارێزگاری لێ دەکرێ و هەرگیز ناتوانێ زیانێکی لێ بدا، چونکە سوارچاکێکی وەک ئەو کەی لەسەر ئەسپەکەی کەوتووەتە خوارەوە؟ چۆن دەبێ دووجار بەسەر یەکەوە لەسەر ئەسپەکەی بەربێتەوە؟

بۆیە سوراقە لە دوورەوە بانگی ئێمەی کرد و وتی: من سوراقەی کوڕی مالیکم... چاوەڕێم بن قسەتان لەگەڵدا دەکەم... بەخوا فێڵتان لێ ناکەم و زیانم لێ نابینن...

پێغەمبەر(ﷺ) بە منی فەرموو: ئەبوبەکر پێی بڵێ: سوراقە پێت چۆنە ئەم دەنگوباسەی ئێمە بشاریتەوە و لە پاداشتی ئەوەدا خوای گەورە زرێ و جلوبەرگی کیسرات پێ ببەخشێ؟

ئەوەم بە سوراقە وت... سوراقە وتی: کیسرای کوڕی هورمز؟

وتم: بەڵێ! کیسرای کوڕی هورمز...

وتی: ڕازیم... بە مەرجێ نووسراوێکم بۆ بنووسی با ببێتە بەڵگە لەنێوان من و ئێوەدا...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبوبەکر نووسراوێکی بۆ بنووسە...

منیش لە پارچەیەکی بچووکدا بۆم نووسی و پێمدا و ئیتر ڕۆیشتین و ئەویش گەڕایەوە...

❀ ❀ ❀

بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دی... لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا خاکی فارس ئازاد کرا... هەموو سەروەت و سامانەکەی کیسرا کەوتە دەستی مسوڵمانان... هەموویان هێنایە

**خزمـەت حەزرەتـی عومـەر... سـوراقە بەڵێننامەکـەی هێنـا و دای بـە دەسـتی حەزرەتـی عومـەرەوە... حەزرەتـی عومەریـش هەمـوو ئـەو شـتانەی پێدا کـە بەڵێنـی پـێ درابـوو... زرێـی تایبەتـی کیسـرا و جلوبەرگەکانی کیسـرا درا بـە سـوراقە... سـوراقە هەمووی لەبـەر کـرد و دوایـی دایکەنـد و هێنایـەوە بـۆ حەزرەتـی عومـەر وتـی: بەڵێنەکـە هاتـە دێ... مـن زرێ و جلوبەرگـی تایبەتـی کیسـرام لەبـەر کـرد و وا هێنامـەوە و دامـەوە بـە بەیتولمـاڵ...**

❀ ❀ ❀

- قوربان من پرسیارێکی ترم لا دروست بووە...

+ چییە کورم بیکە؟

- باشە قوربان پێغەمبەر(ﷺ) غەیبی دەزانی؟

+ نەوەڵڵا جگـە لـە خـوای گـەورە نەبـێ هیـچ کەسـێکی تـر غەیـب نازانـێ، مەبەسـتت چییـە؟

- قوربـان پێغەمبـەر(ﷺ) چۆنـی زانـی مسـوڵمانان خاکـی فـارس ڕزگار دەکەن و جلوبەرگ و زرێی کیسرا و سەروەت و سامانەکەیشی دەسـت مسـوڵمانان دەکـەوێ و زرێ و جلوبەرگەکـەی بـە سـوراقە دەدرێ؟ زۆر سـەیرە، ئەگـەر ئـەوە غەیبزانیـن نییـە ئـەی چییـە؟

+ کـورم ڕاسـتە جگـە لـە خـوا هیـچ کەسـێک غەیـب نازانـێ، بـەڵام خـوای گـەورە خـۆی هەنـدێ شـت پیشـانی هەنـدێ کـەس دەدا... ئـەو کاتـە ئیتـر لـە غەیـب دەردەچـێ، ئـەوە شـتێکە خـوا پیشـانی داوە، نـەک لـە خۆیـەوە بزانـێ... ئەوەتـا پێغەمبـەر(ﷺ) هەواڵـی ئـەوەی داوە کـە لـە ئاخـر زەمانـدا خەڵکـی ڕەشـوڕوت دەوڵەمەنـد دەبـن و دەبـن بـە خاوەنـی کۆشـک و تـەلار... دوایـی پێشـبڕکێ دەکـەن تـا بزانـن کـێ بەرزتریـن

**کۆشک و تەلاری هەیە... هەر ئەوە نا، پێغەمبەر(ﷺ) سەدان نیشانەی ئاخر زەمانی باس کردووە... هەندێکی دوای وەفاتی خۆی دەرکەوت... زۆریشی ماوە دەربکەوێ و بێگومان دەردەکەوێ...**

**- باشە قوربان تێگەیشتم، دەی ئەگەر بە زەحمەتی نازانی باسی ئەو چرکەساتانەم بۆ بکە کە گەیشتنە شاری مەدینە... خەڵکی چۆن پێشوازییان لە ئێوە کرد؟**

+ پێش ئەوەی خۆمان بگەینە مەدینە دەنگوباسی کۆچەکەمان گەیشتبووە مەدینە... مسوڵمانەکان هەمووان چاوەڕێ بوون و ڕۆژانە لەو پەڕی شارەوە دەوەستان و چاودێرییان دەکرد تا بزانن کەی ئێمە دەگەینە شاری مەدینە... کاتێ گەیشتینە ئەوێ زۆر دڵخۆش بوون... زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێ کردین... پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو هیچ قسەی نەدەکرد... منیش وەستابووم... هەندێ پیاوی ئەنصاری هاتن و وایان زانی من پێغەمبەرم و بەخێراتنی منیان دەکرد... منیش بۆ ئەوەی بزانن کە من پێغەمبەر نیم کەواکەی خۆمم داکەند و کردم بە سێبەر بۆ پێغەمبەر(ﷺ)... ئیتر خەڵکەکە زانییان کە کێ پێغەمبەرە...

- بۆچی واتکرد قوربان؟

+ ڕۆڵە نەمدەویست کەس تەریق ببێتەوە... ئەگەر من بمگوتایە من پێغەمبەر نیم و ئەمە پێغەمبەرە، خەڵکەکە لەوانەبوو تەریق ببنەوە و بشکێنەوە، بەو کارە هەمووان بۆیان دەرکەوت کێ پێغەمبەرە و کەسیش تەریق نەبوویەوە...

- کورە قوربان تۆ زۆر بەڕێزی... ئا لەو کاتەشدا خەمی دڵی خەڵکت بوو...

+ کوڕم! خەڵکی خاوەنی ڕێزن... شکاندنی ئێسکی مرۆڤ هەر ئەوەندەی شکاندنی حورمەتی مرۆڤ ئێشی نییە... ئێسک خۆی

دەگریتەوە و ساریژ دەبیتەوە، بەلام حورمەتشکاندن هەرگیز ساریژ نابیتەوە...

- ئەی قوربان بۆ باسی سروودی (طلع البدر علينا)م بۆ ناکەی؟ ئەوە چۆن چۆنی بوو؟

+ کورم! ئەو ڕۆژە هیچ کەسێ سروودی (طلع البدر علينا)-ی نەخوێندەوە، ئەو سرووده خەڵکی مەدینە کاتێ خوێندیانەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگی خەیبەردا بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە...

- پاک و بێگەردی بۆ خوا... هەر لەبەر شتێکی ئاوایە ئەوەندە حەزم دەکرد چیرۆکەکە لە زاری جەنابتەوە ببیستم... باشە قوربان با بێمە سەر باسی نەخۆشکەوتنی جەنابت... بیستوومە دوای ئەوەی هاتیتە نێو شاری مەدینەوە نەخۆش کەوتی، ئەوە چۆن بوو؟

+ شاری مەدینە پەتا و دەرد و نەخۆشی زۆر تیابوو... زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) تووشی نەخۆشی بوون، بەلام خوای گەورە پێغەمبەری(ﷺ) پاراست و خودی پێغەمبەر(ﷺ) تووش نەبوو... من و بیلال و عامر پێکەوە نەخۆش کەوتین و لە یەک ژووردا کەوتین... عایشەی کچم کە هاوسەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرت تا بێت بۆ سەردانی ئێمە... ئەویش مۆڵەتی پێدا... عایشە هات بۆ سەردانم... کاتێ هاتە ژوورەوە وتی:

باوکە چۆنی؟

منیش ئەو شیعرەم بۆ خوێندە:

پیاوی وا هەیە لە ماڵی خۆیدا    هەتا بەیانی ساغە و بێخەمە

کەچی نازانی خاڵی کۆتایی    زۆر نزیک بووە و وەختی مردنە

عایشە وتی: باوکە بە خوا ئەوەندە (تا)کەت بەرزە خۆیشت نازانی چی دەڵێی...

دوایی عایشە بە بیلال و عامری وت: ئەی ئێوە چۆنن؟

وەڵامەکەی ئەوانیش زۆر نزیک بوو لە وەڵامەکەی منەوە...

عایشە گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و دەنگوباسی ئێمەی پێ ڕاگەیاند... بە پێغەمبەری(ﷺ) وتبوو: قوربان (تا)کەیان ئەوەندە بەرزە هەموویان وڕێنە دەکەن...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوایە شاری مەدینەمان وەک شاری مەککە لە لا خۆشەویست بکە، بگرە لە مەککەش زیاتر...

خوایە ئەم پەتایە لێرە هەڵگرە و بیبە بۆ جوحفە...

خوایە پیت و بەرکەت بخەیتە نێو پێوانە و گوێل و مشتمانەوە... (مەبەستی ئەوە بوو پیت و بەرکەت بخاتە نێو دەغڵ و دان و کشتوکاڵیانەوە)...

- جوحفە کوێیە قوربان؟

+ شوێنێکی نزیک شاری مەدینەیە... ئەوی ڕۆژێ ئەو شوێنە جوولەکەنشین بوو...

❀ ❀ ❀

- قوربان ئێستا دەمەوێ باسێکی جەنگی (بەدر)م بۆ بکەی... ئەوە چۆن بوو؟

+ قورەیشیەکان لە مەککە دەستیان گرتبوو بەسەر سەروەت و سامان و زەویوزاری مسوڵمانانداا... پێغەمبەر(ﷺ) بیستی کە کاروانێکی قورەیشیەکان بە سەرکردایەتی ئەبوسوفیان لە نزیک مەدینەوە بەرەو مەککە تێدەپەڕێ... ئێمەش بە پێغەمبەرمان(ﷺ) گوت: قوربان با لە بری ئەو هەمووە شتەی لە ئێمەیان داگیر کردووە، ئێمەش بچین دەست بەسەر ئەم کاروانەدا بگرین، بەڵکوو بتوانین کەمێک تۆڵەی خۆمان بکەینەوە...

پێش ئـەوەی ئێمـە ئـەو کارە بکەیـن، ئەبوسـوفیان بـەم نیـازەی ئێمـەی زانـی... بۆیـە ڕێـگای کاروانەکـەی گـۆڕی و کەسـێکی بەپەلـە نـاردەوە بـۆ مەککـە و داوای هـاوکاری کردبـوو... ئیتـر قورەیـش سـوپایەکیان کـۆ کـردەوە و هاتـن... ئێمـەش بە مەبەستی دەستگرتن بەسەر کاروانەکەدا ڕۆیشتین، بـەڵام لـە دەستمان دەرچووبـوو... ئیتـر کاروانەکـە پێویستیان بـە هـاوکاری قورەیشـیەکان نەمـا... ئێمـە شـتێکمان دەویسـت و ئەوانیـش شـتێکی تـر، بـەڵام ویسـتی خـوای گـەورە وابـوو جەنـگ ڕووبـدات...

- ئەی پێش جەنگەکە چی قەوما قوربان؟ مەبەستم ئەوەیە حاڵ و گوزەرانی سوپای ئێوە چۆن بوو؟

+ پێغەمبـەر(ﷺ) هەموومانـی کـۆ کـردەوە و فەرمـووی: ئـادەی خەڵکینـە پێـم بڵێـن: چـی بکەیـن باشـە؟

منیش هەستام و پێمگوت با هەمووان ناوی خوای لێ بێنین و پشت بە خوا ببەستین و بڕۆین...

دووبارە فەرمووی: ئادەی خەڵکینە پێم بڵێن: چی بکەین باشە؟

ئەمجارە عومەر هەستایە سەر پێی و ئەویش قسەیەکی نزیک لـە قسـەکەی منـی کـرد...

بـەڵام پێغەمبـەر دووبـارە فەرمـووی: ئـادەی خەڵکینـە پێـم بڵێـن: چـی بکەیـن باشـە؟

- باشـە قوربـان پێغەمبەر(ﷺ) بۆچـی دوای ئـەوەی گوێـی لـە ڕای جەنابـت و حەزرەتـی عومـەر بـوو، هـەر دەیفەرمـوو: ئـادەی خەڵکینـە پێـم بڵێـن: چـی بکەیـن باشـە؟

+ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەبـەر دوو هـۆکار دەیەویسـت گـوێ لـە قسـەی ئەنصارییەکانیـش بگـرێ...

یەکەم: من و عومەر هەدووکمان کۆچەری بووین... پێغەمبەر(ﷺ) نەیدەویست بەبێ ڕەزامەندی خۆیان، ئەوان لە جەنگێکدا تێوە بگلێنێ...

دووەم: ئەوان پەیمانیان دابوو هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری مەدینەدا بێ، بیپارێزن، بەڵام ئەو دەمە ئێمە لە دەرەوەی شاری مەدینەدا بووین... لای چاڵە ئاوەکانی (بەدر)دا بووین... ئەو شوێنە شوێنێکی نوێ بوو... چ یارمەتیدان و چ پاراستن بەر ئەو بەڵێنە نەدەکەوت... دەبوو سەرلەنوێ پەیمانێکی تر بە پێغەمبەر(ﷺ) بدەن...

- زۆر باشە قوربان تێگەیشتم... ئەی دوایی چی ڕوویدا؟

+ سەعدی کوڕی مەعاز کە گەورەی ئەنصارەکان بوو، لە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشت... سەعد پیاوێکی زۆر ژیر و دانا بوو... زۆریش دلێر و چاونەترس بوو... سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێی مەبەستت ئێمەیە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ...

سەعد وتی: ئێمە باوەڕمان بە تۆ هێناوە... بەڕاستت دەزانین... شایەتیمان داوە کە ئەو شتەی تۆ هێناوتە لە لایەن پەروەردگارەوە هێناوتە... ئێمە بەڵێنمان بە تۆ داوە... ئێمە لەسەر بەڵێنی خۆمانین، پاشگەز نابینەوە... سەرمان لە ڕێتایە... گوێڕایەڵی فەرمانەکانتین... ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ کوێ پێت خۆشە بڕۆی، بڕۆ... ئێمە لەگەڵ تۆداین... سوێند بە خوا ئەگە خۆت فڕێ بدەیتە نێو دەریایەکەوە ئێمەش بەبێ سێ و دوو خۆمانی تێ فڕێ دەدەین... یەک کەس لە ئێمە بێ فرمانی تۆ ناکەین... ئێمە پێمان ناخۆش نییە ڕووبەڕووی جەنگ ببینەوە... ئێمە لە جەنگدا زۆر خۆڕاگرین، بەڵکوو خوای گەورە بیەوێ ئەوە بە تۆ پیشان بدا کە لە ئێمەی چاوەڕوان دەکەی... پشت بە خوا بۆ کوێمان دەبەی بمانبە...

کاتێ سەعد ئەو قسانەی کرد دەموچاوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەشایەوە... ئیتر پشتئەستوور بوو بە سوپاکەی... وورەی هەموو سەربازەکان بەرز بوویەوە...

- ئەی قوربان ئەو ڕۆژە کە جەنگ دەستی پێ کرد پێغەمبەر(ﷺ) هیچ نزایەکی کرد؟

+ پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو تاکێکی ئەم ئوممەتە زیاتر یادی خوای گەورەی دەکرد و نزای خێری دەکرد... پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی وا نەبوو لە کاتی تەنگانە و ناخۆشیدا هاوار بکاتە خوای گەورە و لە کاتی خۆشی و فەرحانیدا خوای لە بیر نەمێنێ... ئێمە ئیتر لە ئانوساتی دەستپێکردنی جەنگدا بووین... پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕووی کردە ڕووگە و دوایی هەردوو دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی: خوایە بەڵێنەکەی خۆتمان بۆ وەدی بێنە... خوایە! ئەگەر ئەم چینە مسوڵمانە تیابچێ، ئیتر هەتا هەتایە لەسەر زەویدا کەسێک نامێنێ تۆ بپەرستێ...

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە لە خوا پاڕایەوە تا کەواکەی بەری لەسەر شانی کەوتە خوارەوە... منیش کەواکەم بەرز کردەوە و خستمەوە سەرشانی پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوەندە پاڕانەوە بەسە... بێگومان خوای گەورە بەڵێنەکەی خۆی بەدی دێنێ... بەسە قوربان زۆر لە خوا پاڕایتەوە...

- باشە قوربان ئەی باسی کەپرەکە چییە؟ پێم خۆشە بۆم باس بکەی...

+ ئەوە داخوازی سەعدی کوڕی مەعاز بوو... سەعد پیاوێکی ژیر و زانا بوو... هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! با لە گەڵای دارخورما کەپرێکت بۆ دروست بکەین ل ژێر سێبەرەکەیدا دانیشە... ئێمەش دەچینە پێشەوە و ڕووبەڕووی

دوژمـن دەبینـەوە... ئەگـەر سـەرکەوتین، ئـەوە هەمووومـان ئەوەمـان پێخۆشـە... خوانەخواست ئەگەر شکاین تۆ خۆت بگەیەنە بەوانیتر... خەڵکانێکی زۆر نەهاتوون و گومانـت لـە خۆشەویستییان نەبێ... ئەوانـەش زۆر تۆیـان خـۆش دەوێ... بگرە لـە ئێمـەش زیاتر... ئەگەر بیانزانیایـە تووشـی جەنـگ دەبیـن بێگومـان دەهاتـن و لـە ماڵـەوە دانەدەنیشـتن... خـوای گـەورە ئەوانـە دەکاتـە قەڵغـان و پارێـزەر بـۆ جەنابـت... پشـتگیریت لـێ دەکـەن و لەگەڵتـدا دەجەنگـن...

- ئـای سـەعد چ پیاوێکـی پیاوانـە بـوو... ئـای لـەو دڵسـۆزییە گەورەیـە...

+ کـوڕم سـەعد پیاوێکـی وابـوو گیانـی خـۆی کردبـوو بـە خێـر لـە پێناوی خـوای گـەورەدا... ئەوەنـدە بەسـە بـۆ ئـەو کـە لـە کاتـی مردنیا عەرشـی خـوای گـەورە لەرییـەوە...

- ئەی قوربان پێغەمبەر(ﷺ) بەو نەخشەیەی سەعد ڕازی بوو؟

+ بەڵێ ڕازی بوو...

- کەواتە ئەو شتەی کە من بیستوومە ڕاستە؟

+ چیت بیستووە کوڕم؟

بیسـتومە کـە حەزرەتـی عەلـی کـوڕی ئەبوتالیب ڕۆژێـک لـە خەڵکـی پرسـیوە: کـێ دلێرتریـن کەسـە؟

لە وەڵامدا وتویانە: تۆ...

ئەویـش فەرموویەتـی: مـن زۆرانبـازی و جەنگـم لەگـەڵ هـەر کەسـێکدا گرتبـێ و کردبـێ بەسـەریدا زاڵ بـووم، بـەڵام دلێرتریـن پیـاو ئەبوبەکـرە... لـە ڕۆژی جەنگـی (بـەدر)دا کەپرێکمـان بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) ئامـادە کـرد... وتمـان: کـێ دەتوانـێ لـە خزمـەت پێغەمبـەردا(ﷺ) بمێنێتـەوە و نەهێڵێـت هیـچ کەسـێک لـە کافـران لێـی نزیـک ببێتـەوە؟ سـوێند بـە خـوا یـەک کـەس هەڵنەسـایە سـەرپێ ئەبوبەکر نەبـێ... ئـەو

شمشێرەکەی هەڵکێشا و ئامادە بوو بۆ ئەوەی خۆی بکا بە قەڵغانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)...

+ ئەوە گومانباشی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە... خۆشڕەفتاری و دڵپاکی و گەورەیی خۆیەتی... داوا دەکەم لە خوای گەورە کە پاداشتی بەخێری بداتەوە... ئەو بەردەوام شێرێک بوو لە شێرەکانی ئیسلام...

- باشە قوربان کاتێ دووبەدوو لەو کەپرەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووی هیچی پێت نەفەرموو؟

- با... پێی فەرمووم: ئەبوبەکر مزگێنیم بدەرێ وا سەرکەوتن لە لایەن خوای گەورەوە هات... ئا ئەوە جوبرەئیلە ڕەشۆی ئەسپەکەی بە دەستەوە گرتووە و لێی دەخوڕێ...

دوایی پێغەمبەر(ﷺ) لە کەپرەکەی هاتە دەرەوە و هانی مسوڵمانانی دا و فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە! هەرکەسێ ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگێ و خۆڕاگر بێت و ڕانەکات و شەهید ببێ، خوای گەورە یەکسەر دەیخاتە بەهەشتەوە...

ئێمەش پشتمان بە خوای گەورە بەست و جەنگاین... سوپاس بۆ خوای گەورە سەرکەوتنمان بە دەست هێنا...

- باشە قوربان ئەوە جەنگ... ئەی باسێکی دیلەکانی ئەو جەنگەم بۆ ناکەی؟

+ با... باسی ئەوەشت بۆ دەکەم... ئەو ڕۆژە سوپای مسوڵمانان حەفتا جەنگاوەری قوڕەیشیان کوشت... حەفتا سەربازیشمان بە دیل گرت... پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ ئایەتێکی بە دەستەوە نەبوو تا بزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ دیل و یەخسیردا بکات... تا ئەو ساتە خوای گەورە هیچ ئایەتێکی دانەبەزاندبوو... پێغەمبەریش(ﷺ) عادەتی وابوو بۆ هەموو کارێکی گرنگ پرس و ڕاوێژی بە هاوەڵانی

دەکرد... هەموانی کۆ کردەوە و پرسی پێ کردین... من هەستام و وتم: قوربان! ئەوانە هەموویان ئامۆزا و کوڕی عەشیرەت و خزمی خۆمانن... من پێم باشە نەیانکوژین، بەڵکوو ئەوانە بە بڕە پارەیەکی دیاریکراو خۆیان بکڕنەوە و ئازاد بکرێن... بەو جۆرە ئەوە دەبێتە هێز و دەستکەوتێک بۆ خۆمان، بەڵکوو ئەوە خوای گەورەشە ڕێنوێنییان بکات و مسوڵمان ببن و ببنە پاڵپشتی خۆمان و هێزمان زیاد بکا...

- ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرموو؟

+ پێغەمبەر(ﷺ) هیچی نەفەرموو... تەنیا لە عومەری پرسی: کوڕی خەتتاب تۆ چی دەڵێی؟

عومەر وتی: نا بە خوا ڕای من وەک ڕای ئەبوبەکر نییە... من پێموایە کە فڵانکەسی خزمی خۆم بدەی بە دەستی منەوە و بیکوژم... فڵانکەسی خزمی حەمزە بدە بە دەست حەمزەوە با حەمزە بیکوژێ... با هەموو خەڵکی بزانن کە دڵی ئێمە بە قەد سەرەدەرزییەک خۆشەویستی تیا نەماوە بۆ کافر و کوفر و بتپەرستی... ئەو دیلانە زۆرێکیان پیاوە بەناوبانگەکان و دەسەڵاتدارانی قوڕەیشن...

- ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرمووی؟

+ پێغەمبەر(ﷺ) هیچی نەفەرموو... تەنیا هەستا و تەشریفی ڕۆیشتە نێو چادرەکەی...

- ئەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ هەندێ کەس دەیانگوت: پێغەمبەر(ﷺ) بە قسەی ئەبوبەکر دەکات... هەندێکیش دەیانگوت: بە قسەی عومەر دەکات...

- ئەی دوایی ڕای کامتانی پێ پەسەند بوو؟

پێغەمبەر(ﷺ) لە چادرەکەی هاتە دەرەوە و فەرمووی:

"خودای مەزن دڵی هەندێ کەس وا نەرم دەکا لە نەرمیش

نەرمترە، دڵی هەندێ کەسیش وا توند دەکا لە بەردیش توندترە، ئەی ئەبو بەکر تۆ! ڕێک وەکو ئیبراهیم وای، (خودا باسی ئیبراهیم دەکا کە) دەیفەرموو: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ إبراهيم: ٣٦ واتە: سا هەر کەسێ شوێنی من کەوت، ئەوە ئەو کەسە لە خۆمە، هەرکەسێکیش لێم یاخی بوو، ئەوسا ئەتۆ خەتابەخش و دلۆڤانی.

وەک عیسا وای (خودا باسی عیسا دەکا کە دەیفەرموو): ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ المائدة: ١١٨ واتە: گەر بتەوێ ئازاریان دەی؛ بەندەی خۆتن، گەر بشتەوێ لێیان خۆشبی خۆت دەزانی و هەر بۆ خۆتی کە دەستەڵاتت بە دەستە و لە کارزانی.

عومەریش ڕێک وەکو نوحە (خوا دەفەرمووێ) نوح دەیفەرموو: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا﴾ نوح: ٢٦ واتە: خوایە! لەم سەر هەردە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن، جووقەواریان لێ مەهێڵە.

وەکو موسای (خودا باسی موسا دەکا کە) دەیفەرموو: ﴿رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾ یونس: ٨٨ واتە: خودای گەورە! ماڵیان لێ تەفروتونا بکە، دڵیان پتر ڕەق و ڕەش کە، با هەرگیز باوەڕ نەهێنن؛ هەتا جەزرەبەی زۆر بەژان بە چاوی خۆیان دەبینن.

دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بە قسەی منی کرد... لە بەرامبەر برێک پارەی دیاریکراو دیلەکانی ئازاد کرد... بۆ ڕۆژی دوایی دەرکەوت کە قسەکەی عومەر هەق بووە... خوای گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ناردە خوارەوە: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٧﴾ الأنفال: ٦٧ واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا

کاتێک چاک پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا، (مەگەر) کەلوپەل و شتومەکی دنیاتان دەوێت؟ لەکاتێکدا خوا (سەرفرازیی) ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە (سەرکەوتن بە ئیمانداران دەبەخشێت و دانایە لە تاقیکردنەوەیاندا).

- دەی قوربان خۆ جەنابت هیچ زیانت نەکرد... تۆ قسەی دڵی خۆتت کرد... ڕای خۆتت دەربڕی... دڵسۆزی خۆتت بۆ خوای گەورە و پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرخست... تۆ دڵنەرم و بەسۆزی بۆیە ئەو ڕایەت پێ پەسەند بوو... ئەوەتا پێغەمبەریش(ﷺ) تۆی چواند بە حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی عیسا...

+ خوا لێمان ببووری... ئێمە هەموو مەبەستێکمان هەر ڕەزامەندی خوای گەورەیە... خوا لێمان ببووری...

❀ ❀ ❀

- باشە قوربان ئەگەر جەنابت ئیزن بفەرمووی دەمەوێ بێمە سەر باسی جەنگی ئوحوود و پرسیاری ئەو جەنگەت لێ بکەم...

+ باشە کوڕم... گوێ بگرە با بۆت بگێڕمەوە...

- بە گوێ، بە دڵ، بە گوێی دڵ، گوێت بۆ دەگرم... فەرموو قوربان تامەزرۆی بیستنی قسەکانی جەنابتم...

+ قوڕەیش ویستیان تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، چونکە لە جەنگی بەدردا پیس شکابوون... دەیانەویست بە هەر جۆرێ بووە تۆڵەی ئەو شکانە بکەنەوە و سەربەرزی بۆ خۆیان تۆمار بکەنەوە... لە جەنگی بەدردا چەند پیاوماقوڵ و سەرکردەیەکی قوڕەیشیەکان کوژرا... لەوانە:

ئەبوجەهل...

**عوتبەی کوڕی ڕەبیعە...**

**ئومەیەی کوڕی خەڵەف...**

ئەمانـە گـەورە موشـریکەکانی قورەیـش بـوون... ئەمانـە بنەماڵـە و ژن و منـاڵ و کەسـوکاریان هەبـوو... داوای تۆڵەیـان دەکـرد... هەموویـان ڕێـک کەوتـن و کەلوپـەل و تفاقـی جەنگیـان ئامـادە کـرد و هاتـن... پێغەمبەریـش(ﷺ) ڕای لەگـەڵ ڕای پیـاوە بـە تەمەنـەکان بـوو... ئـەو دەیەویسـت دەرنەچیـن بـۆ جەنـگ، بەڵکـوو لەنـاو شـاردا بمێنینـەوە، ئەگـەر ئـەوان هاتنـە نزیـک شـاری مەدینـە ئەوسـاکە ئێمـە لەگەڵیانـدا بجەنگیـن...

بـەڵام سـەربازە گەنجـەکان و ئەوانـەی کـە لـە جەنگـی بـەدردا بەشـدارییان نەکردبـوو زۆر پاڕانـەوە بـۆ ئـەوەی دەربچیـن و لـە دەرەوەی شـاری مەدینـە ڕووبـەڕووی سـوپای قورەیـش ببینـەوە...

پێغەمبـەر(ﷺ) تەشریفی ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان و جلوبەرگی جەنگی پۆشـی و هاتـەوە دەرێ...

هەندێ کەس پێیان وت: قوربان نیازت شتێکی ترە یان جەنگ؟

پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: هـەر پێغەمبەرێـک جلوبەرگـی جەنگـی پۆشـی بـۆی نییـە دایبکەنـێ هەتـا جەنگەکـە نـەکات و تـەواو نەبـێ...

ئیتـر ئێمـەش بـەرەو شـاخی ئوحـوود بـەڕێ کەوتیـن بـۆ ئـەوەی لـەوێ ڕووبـەڕووی سـوپای قورەیـش ببینـەوە...

لـەوێ پێغەمبـەر(ﷺ) ترسـی ئـەوەی هەبـوو لـە پشـتەوەی چیاکـە سـەربازانی قورەیـش پشـتمان لـێ بگـرن و ئێمـە بکەوینـە نێـوان دوو بەرداشـەوە و هیچمـان پـێ نەکـرێ... لایـەک سـوپای قورەیـش... لایـەک ئەوانـەی لـە دواوە پشـتمان لـێ دەگـرن...

جـا بـۆ ئـەوەی تووشـی ئـەو کێشـەیە نەبینـەوە حەفتـا تیرهاوێـژی زۆر زیـرەک و لێهاتـووی هەڵبـژارد و ناردنـی بـۆ سـەر چیاکـە و پێـی

فەرموون: بە هیچ شێوەیەک شوێنی خۆتان چۆڵ نەکەن... ئەگەر ئێمە سەرکەوتین ئێوە مەجووڵێن و مەیەن بۆ یارمەیتمان... ئەگەریش ئێمە شکاین دیسان هەر مەجووڵێن و مەیەن بۆ یارمەتیمان...

جەنگ دەستی پێ کرد... هندی کچی عوتبە بەڵێنی بە وەحشی کوڕی حەرب دابوو ئەگەر حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) لە تۆڵەی باوکیدا بکوژێ - قسە دێ قسە دەبڕێ لە جەنگی بەدردا حەمزە باوکی هندی کوشتبوو- ئەوا وەحشی ئازاد دەکات... حەمزە شێر بوو ئەمان شێر... شێری خوا و شێری پێغەمبەری خوا بوو...بە تاک و تەنیا سی سەربازی قوڕەیشی کوشت... حەمزە لەگەڵ سوارێکی دوژمندا خەریکی شەڕە شیر بوو... وەحشی لە دواوە ڕمێکی بۆ تەقاند و لێیدا و شەهیدی کرد...

مسوڵمانان هاواریان لێ هەستا و وتیان: حەمزە شەهید بوو... غیرەت بدەنە بەر خۆتان با تۆڵەی حەمزە بکەینەوە... ئێمە تەواو گیانی تۆڵەسەندنەوە یەخەی گرتین... سوپای قوڕەیش خۆیان پێ نەگیرا و هەڵاتن... کەچی تیرهاوێژەکان کە پێغەمبەر(ﷺ) دایانابوون و پێی فەرمووبوون: بە هیچ شێوەیەک شوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن، بینیان سوپای قوڕەیش هەڵاتون، شوێنی خۆیان چۆڵ کرد و هاتنە خوارەوە... تمەز خالیدی کوڕی وەلید -کە ئەو دەمە هێشتا مسوڵمان نەبووبوو و سەرکردەی سوپای قوڕەیش بوو- چاوی لێبوو ئەوانە شوێنی خۆیان چۆڵ کردووە... خالید ئەوەی بە هەل زانی... خۆی و چەند سوارێک لە پشتەوە هاتن و پشتی ئێمەیان گرت... کە سوپای قوڕەیش بەوەیان زانی ورەیان بەرز بوویەوە و گەڕانەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ... ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەترسا بقەومێ، قەوما... ئێمە کەوتینە نێوان دوو بەرداشەوە... لە پێشەوە سوپای قوڕەیش بە چەک و تیر و شیرەوە... خالیدیش لە پشتەوە و بە خۆی و سەربازەکانی دواوەیان لێ گرتین...

لەو جەنگەدا ئێمە حەفتا کەسمان لێ شەهید بوو... تەنانەت خەریک بوو پێغەمبەری خوداش(ﷺ) شەهید ببێ...

چەند کەسێک چەکەکانیان فڕێ دا... ئەنەسی کوڕی نەزر پێیوتن: ئەوە چی دەکەن؟

وتیان: پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەهید کرا...

ئەنەس لە وەڵامدا وتی: دەی ئێوە پاش پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژیانتان بۆ چییە؟ دەی هەستن بزانن ئەو لەپێناوی چیدا گیانی خۆی بەخت کرد، ئێوەش وەک ئەو لەو پێناوەدا گیانی خۆتان بەخت بکەن و بگەن بە پلەی شەهیدی...

ئەو ڕۆژە سەری پێغەمبەر(ﷺ) شکێنرا... چەند ددانێکی پێشەوەی شەهید بوو...

یەکەم کەسێ پێغەمبەری خوای بینی کەعبی کوڕی مالیک بوو... ئەو بۆی دەرکەوت کە پێغەمبەر(ﷺ) ماوە و شەهید نەبووە... کەعب پڕ بە دەنگی خۆی هاواری کرد و وتی: مسوڵمانان! مزگێنیم پێ بدەن پێغەمبەر(ﷺ) شەهید نەکراوە و ماوە... ئەمە پێغەمبەری خوایە خەریکە دەجەنگێ...

ئێمەش هەموومان لە دەوری پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆ بووینەوە و کەمە کەمە بەرەو کێوەکە ڕۆیشتین بۆ ئەوەی سەرکەوین و ئەوان نەتوانن شوێنمان بکەون...

- دەی قوربان دوایی چی قەوما؟

+ لە لای کێوەکە قوڕەیشیەکان وەستان و نەیانتوانی سەرکەون و شوێن ئێمە بکەون، بەڵام ئوبەیی کوڕی خەڵەف شوێنمان کەوت و دەینەڕاند و دەیگوت: کوا محەمەد لە کوێیە؟ بمێنم بۆ محەمەد بمێنم... هەڕەشەی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکرد...

ئێمەش بە پێغەمبەرمان(ﷺ) وت: قوربان با یەکێکمان بۆی بچینە خوارەوە...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لێیگەڕێن...

پێغەمبەر(ﷺ) حەربەیەکی لە ئەنەسی کوڕی صوممە وەرگرت و گرتیە ئوبەی... نووکی حەربەکە چەقییە بن ملی ئوبەی، ئوبەی لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە...

- قوربان مەگەر ئوبەی لەسەر سەرکەوتنی فارسەکان لەگەڵ جەنابتدا گرەوەی نەکردبوو لەسەر سەد وشتر؟

+ با... ئەو ئوبەیە بوو...

- ئەی قوربان مرد یان ژیا؟

+ کتوپڕ نەمرد... لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ مەککە بەهۆی ئەو برینەوە گیانی دەرچوو... بەوەش بەڵێنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی ئوبەیەوە هاتە دی...

- چ بەڵێنێک قوربان؟

+ ئەو ئوبەیە بەدبەختە لە هەر جارێ لە مەککە بگەیشتایە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) (ﷺ) پێی دەگوت: محەمەد! من هەموو ڕۆژێ گەنمەشامی دەدەم بە ئەسپەکەم و بە گەنمەشامی بەخێوی دەکەم بۆ ئەوەی بە سواری ئەو ئەسپە تۆ بکوژم...

پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو: نا... گەر خوای گەورە بیەوێ من تۆ دەکوژم...

جگە لە ئوبەی پێغەمبەر(ﷺ) هیچ کەسێکیتری نەکوشتووە... هەموو جارێ دەیفەرموو: بەدبەخترین مرۆڤی سەر زەوی ئەو کەسەیە کە پێغەمبەرێک دەکوژێ، یان پێغەمبەرێک دەیکوژێ...

- ئەی قوربان دوای برینداربوونی ئوبەی، قورەیش هیچ کەسێکیان کرد بە پێشەوای خۆیان؟

+ بەڵێ کوڕم... ئەبوسوفیانیان کرد بە پێشەوای سوپاکەی خۆیان... ئەبوسوفیان لە شوێنێکدا ڕاوەستا... ئەو ئێمەی دەبینی

و ئێمـەش ئەومـان دەبینی... هـاواری کـرد و وتـی: محەمەدتـان تیایـە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە...

دوایی وتی: کوڕەکەی باوکی قوحافەتان تیایە؟ مەبەستی من بوو...

پێغمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە...

دوایی وتی: عومەری کوڕی خەتتابتان تیایە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە...

ئەبوسـوفیان لای کردەوە بـە لای سـوپاکەی خۆیاندا وتـی: ئەوانـە هەموویـان کـوژراون... ئەگـەر زیندووبـان وەڵامیـان دەدایـەوە...

ئا لـەو کاتـەدا عومـەر خـۆی پـێ نەگیرا و وتـی: خـوا ڕووت ڕەش بـکا ئـەی دوژمنـی خـوا... خـوا ئەوەنـدەی هێشـتووەتەوە تـۆی پـێ سەرشـۆڕ بـکات...

ئەبوسوفیان وتی: جەنگ کێبڕکێیە... ئەمڕۆ لەباتی ڕۆژی بەدر...

پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: وەڵامـی بدەنـەوە و بڵێـن: ئێمـە و ئێـوە وەک یـەک نیـن... کوژراوەکانـی ئێمـە –شـەهیدن- لـە بەهەشـتدان... کوژراوەکانـی ئێـوەش –سـەکەتن- لـە دۆزەخـدان...

ئەبوسوفیان وتی: سەربەزی بۆ هوبەل...

پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: وەڵامـی بدەنـەوە و بڵێـن: خـوای گـەورە لـە هەمـوو کەسـێ بەرزتـر و بڵندتـرە...

ئەبوسوفیان وتی: ئێمە عوززامان هەیە، ئێوە نیتانە...

پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: وەڵامـی بدەنـەوە و بڵێـن: خـودا گـەورەی ئێمەیـە و ئێوە گەورەتـان نییـە...

دوایـی سـووپای قورەیـش بـەرەو مەککـە گەڕایـەوە و ئێمـەش لەسـەر کێوەکـە دابەزیـن و شـەهیدەکانمان بـە خـاک سـپارد...

❀ ❀ ❀

- قوربان با بێینە سەر باسی ڕزگاربوونی شاری مەککە... پێم خۆشە باسێکی ئازادبوونی مەککەم بۆ بکەی...

+ کورم... ناکرێ باز بدیەن بە سەر باسی ئاشتەوایی حودەیبیەدا (صلح الحديبية) و یەکسەر بچین بۆ باسی ئازادکرانی مەککە، چونکە ئەو ئاشتەواییە وەک دەرگایەک بوو بۆ ئازادبوونی شاری مەککە...

- دەی قوربان مادەم وایە لە پێشدا باسی ئاشتەوایی حودەیبییەم بۆ بکە...

+ باشە... پشت بە خوا بۆت باس دەکەم...

پێغەمبەر(ﷺ) خەوێکی بینی... لە خەویدا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دەچوونە نێو شاری مەککەوە... بۆ بەیانی مزگێنی بە ئێمە دا... ئێمەش زۆر دڵخۆش بووین بەو خەوبینینەی پێغەمبەر(ﷺ)... پێغەمبەر و هاوەڵان هەمووان بە نیازی بەجێهێنانی (عەمرە) جلوبەرگی ئیحراممان پۆشی... نیازی جەنگمان نەبوو، بەڵام قوڕەیش بڕیاریان دابوو نەهێڵن ئێمە بە هیچ شێوەیەک بچینە نێو شاری مەککەوە... ئێمەش لە حودەیبیە ئۆردومان خست... لەنێوان ئێمە و سەرانی قوڕەیشدا گفتوگۆ و دانوستانێکی زۆر کرا... دوای ئەوەی قوڕەیش سەهلی کوڕی عەمریان نارده لامان ئیتر گەیشتینە خاڵی ڕێکەوتن و نامەی ئاشتەوایی مۆر کرا...

- باشە قوربان خاڵەکانی ئەو ئاشتینامەیە چی و چی بوون؟

+ خاڵە گرنگەکانی چوار خاڵ بوون:

یەکەم: ئەمساڵ ئێمە بگەڕێینەوە و ساڵی داهاتوو بێینەوە بۆ عەمرە...

دووەم: بۆ ماوەی دە ساڵ جەنگ کۆتایی پێ بێت...

سێیەم: هەر عەرەبێک ویستی بێتە بەرەی مسوڵمانانەوە دەتوانێ

بێت... هەر کەسێکیش ویستی بێتە بەرەی قورەیشەوە دیسان دەتوانێ بێت... ئیتر ئەو کەسە یان ئەو تاقمەی هاتووەتەوە یەکێک لە دوو بەرەیە، دەبێتە بەشێک لەو بەرەیە و بەرەکەی تر بۆی نییە دەستدرێژی بکاتە سەر، ئەگەر دەستدرێژییان کردە سەری، وەک ئەوە وایە دەستدرێژییان لەسەر هەمووان کردبێ...

چوارەم: هەر قورەیشییەک هات و موسوڵمان بوو، دەبێ بیگێڕنەوە، بەڵام هەر موسوڵمانێک لە ئایین پاشگەز بوویەوە و هاتە نێو قورەیشەوە، ئەوا قورەیش نایگێڕنەوە.

- باشە قوربان هەندێ خاڵی ئەم ڕێکەوتنە بۆ ئێوە سەخت نەبوو؟

+ کوڕم... هەر موسوڵمانێک ئەو ڕۆژە لەوێ بوو وای بۆ دەچوو، بەڵام من دەمزانی کە پێغەمبەر پێغەمبەری خوایە... لە خۆیەوە قسە ناکا... خوای گەورە پشتی تێ ناکات و سەرکزی ناکا... ئەوێ ڕۆژێ سەبارەت بەو خاڵانە وتوویژ و گفتوگۆیەکی زۆر لەنێوان من و عومەری کوڕی خەتتابدا ڕوویدا... عومەر پێی وابوو ئەو خاڵانە بۆ ئێمە زۆر توندن... منیش پێموت: عومەر... ئەمە پێغەمبەری خوایە! بە گوێی بکە و هیچ مەڵێ...

- ئای قوربان تۆ چەندە بیر و بڕوات سەبارەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پتەو و ئەستوور بووە، بەڵام تێنەگەیشتم ئەم ئاشتەواییە چ پەیوەندییەکی بە ڕزگاربوونی مەککەوە هەبوو؟

+ پەلە مەکە کوڕم... ئێستا پێتدەڵێم پەیوەندییان چیبوو...

لە خاڵی سێیەمی ئاشتینامەکەدا ئەوە هاتبوو کە هەر کەسێک، یان هەر هۆز و تاقمێک بیانەوێ لەگەڵ ئێمەدا پەیمان ببەستن، دەتوانن بیبەستن... هەر کەس و دەستە و تاقمێکیش بیانەوێ لەگەڵ قورەیشدا پەیمان ببەستن، دەتوانن پەیمان ببەستن... هەرکەسێ

**لەگەڵ هەر لایەک پەیمانی بەست، هەر بەو پەیمانبەستنە دەبێتە بەشێک لەو لایەنە... جا هەر دەستدرێژییەک بۆ سەر ئەو کەسە، یان ئەو تاقمەی کە پەیمانی لەگەڵ یەکێک لەم دوو لاینە بەستووە، وەک دەستدرێژی وایە بۆ سەر تەواوی ئەو لایەنەی پەیمانی لەگەڵ بەستراوە... مەگەر وانییە؟ ئەوە لە خاڵی سێیەمدا نەهاتووە؟**

- با قوربان... پێشتریش ئەوەت ڕوون کردەوە...

+ زۆرباشە... تیرەی بەکر ڕۆیشتنە پاڵ قورەیشیەکان... تیرەی خوزاعەش هاتنە پاڵ ئێمە... خاڵەکان هەژدە مانگ بە باشی جێبەجێ کران... دوایی شەوێک تیرەی بەکر شاڵاویان هێنابوو بۆ سەر تیرەی خوزاعە... بۆ ئەو مەبەستەش هەندێ چەک و سەربازیان لە قورەیش وەرگرتبوو، بەو بڕوایەی کە شەوە و کەس بە کەس نییە و کەس پێیان نازانێ...

هەرچۆنێک بێ ئەو هێرشکردنە بەس بوو بۆ ئەوەی لە لایەن ئەوانەوە پەیمانە بشکێندرێ... نەخاسمە هەندێکی قورەیشیش بەشدار بوون...

- ڕاستە وایە قوربان... ئەی باشە دوایی چی ڕوویدا؟

+ عەمری کوڕی سالم، گەورەی خوزاعە هات بۆ مەدینە... سڵاوێکی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و ئەم شیعرانەی خوێندەوە:

**خوایە من بانگی محەمەد دەکەم**
**هاوپەیمانی باب، هەم هی باپیرم**
**یارمەتیم بدە، خوا سەرت بخا**
**بە هەمووان بڵێ: با بێن بە پیرم**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عەمری کوڕی سالم! بێخەم بە یارمەتیدراوی...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپایەکی پێک هێنا کە بریتی بوو لە

دە هەزار جەنگاوەر... بانگی خوزاعەی هاوپەیمان و هەموو هاوپەیمانەکانی تری کرد... بە سەربەرزی و سەرکەوتنەوە چوونە ناو شاری مەککە...

بیلال سەرکەوتە سەر کەعبە... بە ئاشکرا بانگی دا... بەو جۆرە مەککە بوو بە شاری یەکتاپەرستی و هەتا ڕۆژی پەسلانیش بەو جۆرە دەمێنێتەوە...

❀ ❀ ❀

- قوربان پێش ئەوەی باس بێتە سەر باسی ئەوەی کە جەنابت بووی بە جێگەدار و خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتم پێ دەدەی پرسیاری شتێکت لێ بکەم کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ڕوویداوە و پەیوەندی بە جەنابتەوە هەیە؟

+ فەرموو کوڕم... پرسیاری چی دەکەی بیکە...

- چیرۆکی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) چییە کە بە جەنابتانی فەرمووە: هەموو دەرگاکانی بەهەشت بانگت دەکەن؟

+ ئەوە ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر کەسی لە سەردەمی ئیسلامدا و لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ژن و پیاوێک بەخێو بکات، یان تێچوی ژنهێنانێک بۆ کەسێک لە ئەستۆ بگرێ لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێ و دەوترێ: ئەی بەندەی خودا! ئەمە خێرێکی گەورەیە... جا هەرکەسێ پیاوی نوێژ بێ و نوێژی زۆر کردبێ لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ... هەرکەسێکیش پیاوی جەنگ و جیهاد و تێکۆشان بێ، لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێ... هەرکەسێکیش پیاوی ڕۆژووگرتن بێ لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێ... هەر کەسێکیش پیاوی خێر و صەدەقە بێ، ئەوا لە دەرگای خێر و صەدەقەوە بانگ دەکرێت...

**منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)... هیچکەسێ لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ دەکرێت؟**

فەرمووی: بەڵێ... هیوادارم تۆ یەکێک بی لەو کەسانە...

- ئای چ مزگێنییەکی خۆشە... هەموو دەرگاکانی بەهەشت بانگت دەکەن قوربان... خۆزگەم بە خۆت...

+ کورم لە خوا دەخوازم پارێزراو بین...

- ئەە- باوکە گیان... تۆ داوا دەکەی پارێزراو بی؟ ئەی ئێمەی قوربەسەر چی بڵێین؟

+ خوای گەورە لە ئێمەش و لە ئێوەش خۆش ببێ... لێی دەپاڕێمەوە هەموو کارەکانمان بۆ ڕەزامەندی ئەو بێ و لێمان وەربگرێ...

- ئامین... خوایە ئامین... دەی قوربان ئێستا باسەکەی خۆمان درێژە پێ بدەین؟

+ پشت بە خوا... فەرموو بڵێ بزانم چ پرسیارێکت هەیە...

- قوربان جەنابتان کاتی خۆی بە حەزرەتی عومەرت فەرموو: من هەرگیز نهێنیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باس ناکەم... مەبەستت چیبوو؟

+ ئەوە چیرۆکێکی خۆشە... حەفصەی کچی عومەر -کە دواتر بوو بە دایکی بڕواداران- ژنی خونەیسی کوڕی حوزافە بوو... خوا هەڵناگرێ خونەیس پیاوێکی خواپەرست و خۆپارێز و باش بوو... یەکێک بوو لەو کەسانەی لە غەزای بەدردا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ئامادە بوو... دوایی خونەیس مرد... دوای ئەوەی عیدەی حەفصە تەواو بوو، عومەر بە دوای کەسێکدا دەگەڕا کە حەفصەی پێ بدا... ڕۆژێک گەیشتبوو بە عوسمانی کوڕی عەففان، پێی وتبوو: عوسمان ئەگەر پێت باشبێ دەمەوێ حەفصەی کچی خۆمت لێ مارە بکەم...

عوسمان وتبووی: با جارێ بیرێکی لێ بکەمەوە...

بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتبوویەوە بە عوسمان... عوسمان وتبووی: من جارێ ژن ناهێنم...

عومەر لە دڵی خۆیدا نیگەران بوو... وەک بڵێی: کەمێک لە عوسمان زیز بوو...

دوایی گەیشت بە من... بە منیشی وت: ئەبوبەکر ئەگەر ژنت دەوێ با حەفصەی کچی خۆمت لێ مارە بکەم...

منیش بێدەنگ بووم و هیچم نەگوت... عومەر لە منیش زیز بوو...

دوای یەک دوو حەفتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای حەفصەی کرد و حەزرەتی عومەر حەفصەی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لێی مارە کرد...

دوایی گەیشتم بە عومەر و پێموت: کاکە عومەر... لەوانەیە لە دڵی خۆتدا لە من زیز بووبی، چونکە تۆ وتت: با حەفصەت لێ مارە بکەم و منیش هیچم نەوت... بەخوا من تەنیا ئەوە گیری دام و وەڵامم نەدایتەوە لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست باسی حەفصەی لای من کرد و نیازی بوو داوای بکات و بیخوازێ... نەدەکرا منیش نهێنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاشکرا بکەم... ئەگەر ئەو داوای نەکردایە و خوازبێنی لێ نەکردایە، بێگومان من دەمخوازی...

- باشە قوربان پرسیارێک...

+ فەرموو...

- باشە حەزرەتی عومەر چۆن بەدوای کەسێکدا دەگەڕا کچەکەی خۆی پێ بدا؟ زۆر سەیرە!

+ بۆچی سەیرە کورم؟ بۆچی بەدوای کچێکی باشدا دەگەڕێین بۆ ئەوەی بیخوازین بۆ کوڕەکانمان سەیر نییە، بەڵام ئەگەر بەدوای کوڕێکی باشدا بگەڕێین بۆ ئەوەی کچی خۆمانی پێ بدەین سەیرە؟

- قوربـان مـن مەبەسـتم ئەوەیـە عـادەت و داب و نەریت وایـە کوڕ داوای کـچ دەکات و لـە دەرگای ماڵـی باوکـی کـچ دەدا، نـەک بـە پێچەوانـەوە...

+ بەڵێ ڕاسـتەکەی داب و نەریت وایـە... لـە مەدینـەش هـەر بـەو جۆرە بوو، بەڵام چ لەمپەرێک هەیـە لـە بەرامبـەر ئـەوەی کە باوکێک بەدوای کوڕێکی باش و خواناس و ڕێکوپێکدا بگەڕێ و کچی خۆی لێ مارە بکات؟

کـورم... (شـتی حـەڵاڵ و عەیبـە پێکـەوە کۆ نابنـەوە...) جـا لـە گۆشـەنیگای باوکـەوە بیـر لـە بابەتەکـە بکـەرەوە نـەک لـە گۆشـە نیگای خۆتـەوە... باوکێـک کچێکـی بێوەژنـی کەوتبێ بـە مـلا... لـەم دوو بژاردەیە کامیان باشـترە؟ بگـەڕێ و کوڕێکی بـاش ببینێتـەوە و کچەکەی خۆی لێ مارە بکات و سوننەتی ژیان جێبەجێ بکات، یان هـەروا لێیگـەڕێ و لـە ماڵـەوە بـۆ خـۆی بکـەوێ؟ شـتەکە پەیوەسـت نییە بە خـواردن و جلوبـەرگ و بابەتـی تـر... خـۆ کـەس کچـی خـۆی نەبـووە بـە مـل و کـەس لـە برسـدا کچـی خـۆی بـە مێـرد نـەداوە... خـوای گـەورە خـۆی ڕزق و ڕۆزیـی هەمـوو کەسـێ دابیـن دەکات، بـەڵام خۆ ژیان تەنیا خـواردن و خـەوتن نییـە... ژن بۆ پیاو دروسـت کـراوە و پیاویش بۆ ژن... ئـەوە سروشـتی خودایـە و ئێمـەی لەسـەر ئـەو سروشـتە ڕاهێنـاوە...

- باشە قوربان پرسیارێکی تر...

+ فەرموو پرسیاری خۆت بکە...

- قوربان بابەتەکە هەر پەیوەندی بە بێوەژنەوە هەیە یان؟

+ نەخێـر کـورم... چ ڕێگرییـەک هەیـە لـەوەی کـە باوکێـک بـەدوای کوڕێکـی بـاش و خواناسـدا بگـەڕێ و کچـی خـۆی لـێ مـارە بـکا... باشـە باشـتر وانییـە کـە بـاوک ببینـێ کچەکـەی لای مێردێکـی بـاش

و ڕێکوپێکە و بێخەمە؟ کوڕم! باوک جێگای مێرد پڕ ناکاتەوە، هەروەک مێردیش جێگای باوک پڕ ناکاتەوە، ڕێک بەو جۆرەی کە دایک جێگای ژن پڕ ناکاتەوە و ژنیش جێگای دایک پڕ ناکاتەوە...

- زۆر باشە قوربان تێگەیشتم، بەڵام قوربان بۆچی کاتێ حەزرەتی عومەر داوای لێ کردی حەفصەی کچی لە تۆ مارە بکات، تۆ پێت نەگوت کە پێغەمبەر(ﷺ) نیازی هەیە خوازێنی بکات بۆ خۆی؟

+ کوڕم! کاتێ کەسێک قسەیەکی تایبەتت لەگەڵدا دەکا، ئەو قسەیە ئەمانەتە، نابێ لە دەمت دەربچێ... پێغەمبەر(ﷺ) قسەیەکی خۆی لای مندا باس کرد، ئیتر چۆن من لای کەسێکی تردا بیدرکێنم؟

- قوربان مەبەستم ئەوەیە لای حەزرەتی عومەردا باست بکردایە، با دڵی گەردی نەگرتایە...

+ نا نەدەکرا باسی بکەم...

- بۆچی؟

+ ئەی باشە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ڕای بگۆڕیایە و داوای حەفصەی نەکردایە، ئەو کاتە عومەر لە دڵی خۆیدا نەیدەگوت: دەبێ چی ڕوویدابێ وا پێغەمبەر(ﷺ) نەهات بۆ داخوازی حەفصە؟ کوڕم شەیتان ستەمکار و ئاژاوەچییە... لەوانەبوو دڕدۆنگییەکی بۆ عومەر دروست بکردایە و عومەر لە دڵی خۆیدا بیگوتایە: بێگومان حەفصەی کچم خراپەیەکی لێ دەرکەوتووە و پێغەمبەر(ﷺ) بیستوویەتی، بۆیە نەهات بۆ خوازبێنیی...

- وەڵڵا ڕاست دەڵێی قوربان... من بیرم لەو شتانە نەکردبوویەوە...

+ من تەنیا لەبەر ئەو هۆکارە هیچم بە عومەر نەگوت، دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنیی حەفصەی کرد، هەموو شتێکم بۆ عومەر ڕوون کردەوە...

- وەڵڵا کارێکی زۆر باشت کردووە گەورەم...

+ دەی کوڕم خوای گەورە سەرفەرازت بکا... بزانم لێبووینەوە، یان پرسیاری ترت ماوە؟

- کورە قوربان ئەوە بەڕاستە... من هێشتا سندووقی مێشکم پڕ لە پرسیارە...

+ دەی پرسیاری خۆت بکە با وەڵامت بدەمەوە...

- باشە قوربان... با بێمە سەر ئەوەی کە بیستومە: گوایە ڕۆژێک خزمەتکارێکی جەنابت هەندێ خواردنی بە تۆ داوە و دوای ئەوەی خواردوتە خۆت ڕشاندووەتەوە... پێم خۆشە بۆم ڕوون بکەیتەوە بزانم بۆچی خۆتت ڕشاندەوە؟

+ ئەوە من کۆیلەیەکم هەبوو... کاری دەکرد... منیش عادەتم وابوو هەر جارێ لە دەرەوە خواردنێکی هێنابا لێمدەپرسی لە کوێی و چۆنی پەیدا کردووە؟ ڕۆژێک هەندێ خواردنی لە دەرەوە هێنا و منیش لە بیرم چوو پرسیاری لێ بکەم و کەمێکم لێ خوارد...

کۆیلەکەم وتی: ئەرێ قوربان هەر جارێ لە دەرەوە خواردنم هێنابێ لە منت پرسیوە: چۆنت پەیدا کردووە و لە کوێ هێناوتە؟ ئەوە چییە ئەمجارە لێت نەپرسیم؟

منیش وتم: دەی باشە پێم بڵێ بزانم لە کوێت هێناوە؟

ئەویش وتی: ئەوە لە سەردەمی نەفامیدا فاڵم بۆ پیاوێ گرتەوە... خۆ من فاڵچیش نەبووم، هەروا خەڵەتاندم... کەچی قەزا و قەدەر قسەکەی منی بە درۆ نەخستەوە و وا دەرچوو کە من وتبووم... ئەمڕۆ ئەو پیاوەم بینی و لەجیاتی کرێی ئەو فاڵگرتنەوەیە هەندێ خواردنی پێدام...

ئیتر بە بیستنی ئەم قسەیە دەستم کرد بە قورگی خۆمدا بۆ ئەوەی خۆم بڕشێنمەوە، بەڵام نەمتوانی خۆم بڕشێنمەوە...

پێیان وتم: بە ئاو نەبێ نایەتە دەرەوە...

بەردەوام ئاوم دەخواردەوە و دەستم دەکرد بە قورگی خۆمدا و خۆم دەرشاندەوە...

پێیان وتم: زۆرت کرد لە خۆت...

وتم: بەخوا ئەگەر بە دەرچوونی گیانم نەبووایە نەرشامایەتەوە ئامادە بووم گیانی خۆم دەرکەم و برشێمەوە... من خۆم لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە فەرمووویەتی: هەر گۆشتێک بە -خواردنی- حەرام پەیدا بووبێ، ئەوە زیاتر شایانی ئاگرە...

- جا قوربان خۆ تۆ نەتدەزانی ئەو خواردنە حەرام و ناڕەوایە...

+ ئێ خۆ دوایی زانیم...

- قوربان مەبەستم ئەوەیە تۆ تاوانت نەبوو... تۆ عادەتت وابوو هەموو جارێک پرسیارت دەکرد، ئەوجارە لە بیرت چوو پرسیار بکەی... خۆ تۆ خۆت فاڵت نەگرتبوویەوە، با داوای لێبووردنت لە خوا بکردایە و بتگوتایە (استغفرالله) ئیتر ئەوەندە بەس نەبوو؟

+ ڕاستە من خۆم فاڵەکەم نەگرتبوویەوە، بەلام خۆ زگ زگی خۆم بوو... نابێ خواردنی حەرام و ناڕەوا بچێتە نێو زگی ئەبوبەکرەوە...

- قوربان ئاوا خۆپارێزی بۆیە کەس پێشت ناداتەوە...

+ کورە ڕۆڵە بەخوا هیوادارم کاتێ لە دونیا دەردەچم خراپەم لە چاکەم زۆرتر نەبێ، خوا دەکا تاوانبار نابم نامەوێ چاکەکانم زیاتر بن...

- کورە قوربان وا مەفەرموو... تۆ کاتێ لە دونیا دەردەچی بە کۆڵێ ئیمانەوە دەردەچی... جیهاد و تێکۆشانت هەیە... سەروەت و سامانی خۆت لەپێناو خوای گەورە و پێغەمبەرکەیدا(ﷺ) خەرج کردووە... تۆ بفەرموو: خوایە لێم وەربگری... ئیتر بە پلە و پایەیەک

دەگەی هەرکەسێ سەری بۆ بەرز بکاتەوە بۆ ئەوەی تەماشای بکا، بێگومان کڵاوەکەی دەکەوێتە خوارەوە...

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کوڕم... پێمخۆش نییە بە شان و پیلی مندا هەڵدەی... بزانم پرسیاری ترت هەیە یان نە؟

- بەخوا قوربان ڕووپامابیت بۆ ناکەم، هەر بەڕاستی ڕاستەقینە دەیڵێم: هیچ کەس هێندەی تۆ شایانی ئەوە نییە پەسنی بدەین و باسی چاکەکانی بکەین... بەس لەبەر خاتری جەنابت واز دێنم... سەبارەت بە پرسیاریش بەڵێ پرسیاری زۆرم ماوە...

+ دەی کوڕم بزانم لە بارەی چ شتێکەوە دەپرسی بپرسە...

- ئەم چەلە لەبارەی فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر(ﷺ) لێت دەپرسم... پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: باشە ئێوە پشت دەکەنە هاوڕێکەی من؟

+ ئەوە شتێک لەنێوان من و عومەری کوڕی خەتتابدا ڕوویدا... عومەر تووڕەبوو هەستا و ڕۆیی... منیش دوای کەوتم و داوای لێبووردنم لێ کرد، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو لێم ببووری... هەتا گەیشتەوەماڵەوە من هەر بە دوایەوە بووم و داوای لێبووردنم لێ دەکرد... کاتێ گەیشتینە ماڵی عومەر، عومەر خۆی کرد بە ژووردا و دەرگاکەی لەسەر من داخست...

منیش ڕۆیشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئەوەی باسی ڕووداوەکەی بۆ بگێڕمەوە... بە دەموچاومدا دیاربوو کە زۆر نیگەرانم... پێغەمبەریش(ﷺ) کەسێکی زۆر ژیر و دانا و وردبین و سەرناس و ڕۆشنبیر بوو... هەر بە بینینی من زانی نیگەرانم و قسەیەکم پێیە... بۆیە بەوانەی فەرموو کە لە خزمەتیدا دانیشتبوون: وادیارە ئەم هاوڕێیەتان دەستەویەخەی کەسێک بووەتەوە...

مـن گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)... سڵاوم کرد و

دانیشتم... ڕووداوەکەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە... باسی پەشیمانی و داوای لێبووردنەکەیشم بۆ گێڕایەوە... ئەوەشم گوت کە عومەر لێم نابووریٚ و دەرگای بە سەرمدا داخستووە...

پێغەمبەر(ﷺ) بە منی فەرموو: خوا لێت خۆشبیٚ ئەبوبەکر...

- ئەی قوربان دوایی چی ڕوویدا؟

+ دوایی عومەر دامرکابوویەوە و پەشیمان ببوویەوە... ڕۆیشتبوو بۆ ماڵی ئێمە بۆ ئەوەی داوای لێبووردنم لیٚ بکات، بەڵام من لە ماڵ نەبووم... ئەویش هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) سڵاوی کرد و دانیشت... هێشتا ئاسەواری تووڕەیی بە دەموچاویەوە دیاربوو... زۆر ترسام پێغەمبەر(ﷺ) شتێک بە عومەر بڵیٚ و دڵی عاجز بکات... بۆیە بەپەلە ڕۆیشتمە بەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ناهەق بووم و ستەمم لە عومەر کرد...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کاتیٚ خوای گەورە منی کرد بە پێغەمبەر و من وتم: بووم بە پێغەمبەر، ئێوە هەمووتان وتتان: درۆ دەکەی... ئەبوبەکر وتی: ڕاست دەکەی...

ئەبوبەکر بە گیان و ماڵ و سەروەت و سامانەوە هاوکاری منی کرد... ئیتر چۆن ئێوە پشت دەکەنە ئەم هاوڕێیەی من؟ چۆن پشت دەکەنە ئەم هاوڕێی منە؟

- ئای قوربان خۆزگەم بە خۆت... پێغەمبەر(ﷺ) ئاوا پەسنی جەنابتی بدات و ئاوا باسی چاکەکانی جەنابتی کرد... خۆزگەم بە خۆت...

+ تۆ ئەوە مەڵیٚ، بەڵکوو بڵیٚ: ئای لەو پێغەمبەرە مەزنە چەندیٚ بەئەمەک و بەوەفا بووە... پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەزڵ و چاکەی زۆر زۆرە بەسەر منەوە... هەر ئەوەندە بەسە کە خوای گەورە ئەوی کردووەتە هۆکاری ڕێنوێنی من... ئەو تەنیا باسی ئەو شتانەی کرد

کە من بۆ ئەوم کردووە... ئیتر باسی ئەو شتانەی نەکرد کە ئەو بۆ منی کردووە... ئەمە عادەت و خدەی پیاوە مەزنەکانە... هەروا بوون و هەرواش دەبن... چاکەی خەڵک باس دەکەن و پاداشتی دەدەنەوە، بەڵام هەرگیز باسی چاکەی خۆیان ناکەن... هەرگیز چاوەڕێی پاداشتی هیچ کەسێک نین... دەی خۆ پێغەمبەریش(ﷺ) سەرکردە و گەورەی پیاوە مەزن و گەورەکانە...

- ڕاست دەفەرمووی قوربان قسەی جەنابتە، بەڵام قوربان پێم بڵێ: تۆ و حەزرەتی عومەر لەسەر چ شتێک بوو بە کێشەتان؟

+ کوڕم لەسەر هەر شتێ بوو، بوو... تۆ مەڵێ کێشە... بڵێ: ڕا جیاوازی... هەرکەسە جۆرە ژیری و عەقڵێکی هەیە... هەر کەسە و ڕا و بۆچوونێکی تایبەت بە خۆی هەیە... هەموو کەسێک بە گوێرەی ژیری و ئاوەزی خۆی بابەتەکان شەنوکەو دەکات و دەیخوێنێتەوە... بۆیە جار جار ڕاجیاوازی دروست دەبێ... کورە نەک جار جار، بەڵکوو زۆر جار ڕا جیاوازی دروست دەبێ... ئیتر جاری وا هەیە کەسێک بە بیستن، یان بینینی شتێکی تر سەخڵەت بووە... ئیتر ئا لەو کاتانەدا ڕا و بۆچوونی کەسی بەرامبەری بە لاوە ئاسایی نییە و پێی سەخڵەت دەبێ... کەچی لە کاتی ئاسایی و کاتێکی تردا کێوێک بخەیتە سەر شانی پێی ئاساییە و سەخڵەت نابێ...

- ڕاست دەفەرمووی قوربان، بەڵام پێمخۆشە بزانم بۆچی جەنابت بەدوای حەزرەتی عومەردا ڕۆیشتیت و داوای لێبووردنت لێ دەکرد؟

+ جا بۆ داوای لێبووردنی لێ نەکەم... عومەر برا و هاوڕێی منە... ڕاجیاوازییەک لەنێوانماندا هەبوو... لەوە زیاتر هیچی تر نەبوو... من ئەو ڕاجیاوازییەم پێ خۆشترە تا ئەوەی خۆم ڕایەکەم هەبێ و کەسی تر هیچ ڕایەکی نەبێ... دڵڕاگرتنی هاوڕێ و تەنانەت

هەر کەسێکی تر با نەناسیش بێ، لەوە گرنگترە مرۆڤ ڕای خۆی سەربخات... من دەمەویست بەوە بە عومەری بسەلمێنم کە دڵی ئەوم لە هەموو شتێک زیاتر بە لاوە گرنگە...

- ئەی باشە قوربان! بۆچی ئەو لێت نەبوورا و تەنانەت دەرگاشی لەسەر داخستی؟ خوانەخواست مەبەستم ئەوە نییە وەک ناحەزێک بمەوێ نێوانتان تێک بدەمەوە، بەڵکوو دەمەوێ سوود لە دانایی جەنابت وەربگرم...

+ ڕۆڵە! هەموو کەسێک سروشتێکی تایبەت بە خۆی هەیە... ئەگەر هەموو کەسێک پەی بە سروشتی کەسی بەرامبەر بە خۆی ببا، ئەوا زۆربەی زۆرینەی کێشە و ئاریشەکان ئاسان دەبوون، نەک ئاسان، بەڵکوو هەر ڕوویان نەدەدا... دەمانزانی کە کاردانەوەی کەسی بەرامبەر ئاسەوای سروشتی ئەو کەسەیە، نەک لەبەر شتێکی تایبەت... سروشتی عومەر وابوو... کەسێکی توند، بەهێز بوو... کاردانەوەکانیشی وەکو سروشتی خۆی بوو... ئەو بە دڵ و گیان کەسێک بوو خوا و پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆش دەویست... خۆی بۆ خزمەت بە ئایین تەرخان کردبوو... من لە خوا دەخوازم کارە چاکەکانی منیش و عومەری خۆشەویستم وەربگرێت و لێمان ببووری...

- ئەی باشە قوربان بۆ جەنابت ڕۆیشتی بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو شتێکت بۆ گێڕایەوە؟ مەبەستت چیبوو؟

+ ئەو ڕووداوەی نێوان من و عومەر زۆر لەسەر دڵم گران کەوت... ئەگەر من نەچووومایەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەو نەبووایەتە هۆکاری ئاشتەوایی نێوانمان، ئەی پەنام بۆ کێ ببردایە؟ سروشتی مرۆڤ وایە، کاتێ لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دەبێ بە کێشەیان پەنا بۆ هاوڕێیەکی تر دەبا بۆ ئەوەی کێشەکەیان بۆ

یەکلایی بکاتەوە و ئاشتیان بکاتەوە... مەگەر وانییە؟

- بەرەوەڵلا قوربان وایە... قسەی جەنابت دروستە...

+ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو کەسێک بۆ ئێمە لە پێشتر بوو... باشترین هاوڕێمان بوو...

- قوربان من پێموایە حەزرەتی عومەریش زۆر مەرد بوو... دوای ئەوەی تووڕەییەکەی نەما و سارد بوویەوە هات بۆ ماڵی ئێوە بۆ ئەوەی جەنابت ئاشت بکاتەوە... ئەوەش کارێکی مەردانەیە و لە هەموو کەسێک ناوەشێتەوە...

+ عومەر عومەرە... کە وتت عومەر ئیتر تەواو... ناوەکەی پێناسەیەتی... توند، گورجوگۆڵ، نەک هەر ئەو جارە، بەڵکوو هەرکاتێ تووڕەیی نەمایە و بیزانیایە هەق لای بەرامبەرە ئیتر پشتگیری لە هەق دەکرد... کەسایەتی عومەر زۆر وەک کەسایەتی حەزرەتی موسا وابوو... لە بیرتە ڕووداوەکەی جەنگی بەدرم بۆ گێڕایتەوە؟ لەبیرتە پێم وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عومەر وەکو موسا وایە... (خودا باسی موسا دەکات)، کە دەیفەرموو: ﴿ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾ یونس: ٨٨ واتە: خودای گەورە! ماڵیان لێ تەفروتوونا بکە، دڵیان پتر ڕەق و ڕەش کە، با هەرگیز باوەڕ نەهێنن؛ هەتا جەزرەبەی زۆر بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن.

حەزرەتی موسا کەسێکی توند بوو... کاتێ لە بەنی ئیسرائیلیەکان تووڕە بوو ئەو تەتەڵە و لەوحانەی فڕێ دا کە تەوراتی لەسەر نووسرابوو... خوای گەورە خۆی لە قورئاندا باسی ئەو ڕووداوە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِ ﴾ الأعراف: ١٥٠

واتە: جا کاتێک موسا گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی (زانیبووی خەریکی گوێرەکەپەرستین)، زۆر بە تووڕەیی و پەستی و

غەمبارییەوە وتی: بەڕاستی دوای ڕۆشتنی من جێنشینییەکی خراپی منتان کرد، ئەوە پەلەتان کرد لە وادەی پەروەردگارتاندا؟ (ئیتر لە داخی ئەو لادان و سەرگەردانییە) تابلۆکانی (تەورات)-ی فڕێ دا و پەلاماری قژی (هاروون)-ی برای دا و ڕایکێشا بۆ لای خۆی.

دوای ئەوەش کە تووڕەییەکەی دامرکایەوە و نەما، یەکەم کار ئەوەبوو تابلۆ و تەتەڵەکانی هەڵگرتەوە، خوای گەورە باسی ئەوەشمان بۆ دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ ﴾ الأعراف: ١٥٤

واتە: کاتێک تووڕەیی موسا هێور بووە، تابلۆکانی (تەورات)-ی هەڵگرتەوە.

مرۆڤ ناتوانێ خۆی لە سروشتی خۆی دەربێنێ، بەڵام ناشکرێ هەر شوێن سروشتی خۆی بکەوێ و لێی لانەدا و بیکا بە پێوەر بۆ هەموو شتێ... سروشتی حەزرەتی موسا وایکرد تاوێک تووڕە ببێ... دوایی دینداری و ئیمانی حەزرەتی موسا، کارێکیان بە حەزرەتی موسا کرد کە بە تەواوی هێور ببێتەوە... عومەریش ڕێک وابوو... کاتێ تووڕە بوو وەک ئەو کاتانە وابوو کە حەزرەتی موسا تەتەڵەکانی فڕێ دا... کاتێکیش تووڕەیی نەما و هات بۆ ماڵی ئێمە بۆ ئەوەی دەست لە ملی من بکات و ئاشتم بکاتەوە، ڕێک وەک ئەو کاتەی حەزرەتی موسا وابوو کە یەکسەر دوای هێوربوونەوە تەتەڵەکانی هەڵگرتەوە...

- بەخوا جوانە قوربان... زۆر جوان ئەم بابەتەی نێوان خۆت و حەزرەتی عومەرت بەستەوە بە ڕووداوەکەی حەزرەتی موساوە (ﷺ)...

+ خوا پایەدارت بکات کوڕم...

+ دەی کوڕم پێم بڵێ: پرسیاری ترت ماوە؟
- ئەرەوەڵڵا قوربان پرسیارم زۆر ماوە...
+ ئەمجارە چ پرسیارێک دەکەی؟ پرسیار بکە با وەڵامت بدەمەوە...
- وەڵڵا قوربان بیستومە جەنابت بە پێغەمبەر(ﷺ) و دایە عایشەت فەرمووە: دەی وەک چۆن لە کێشەی نێوان خۆتاندا بەشدارتان کردم، ئاواش لە خۆشی نێوان خۆتاندا بەشدارم بکەن...
+ باشە... ئەوە ڕۆژێک بە نیازی سەردانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) -کە ئەو ڕۆژە لە ماڵی عایشەی کچی من و خێزانی خۆیدا بوو- ڕووم لە ماڵی عایشەی کچم کرد... ئەوانیش وەک هەموو ژن و پیاوێکی تر لەسەر شتێ ببوو بە کێشەیان... گوێم لێبوو عایشەی کچم دەنگی بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) بەرز دەکردەوە... منیش خۆم پێ نەگیرا و زۆر تووڕە بووم... تەنانەت ویستم لێی بدەم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) منی گرت و نەیهێڵا لێی بدەم... پێم وت: ئەوە تۆ دەنگ بەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرز دەکەیتەوە؟
دوای ئەوە ئەوێم بەجێ هێشت، پێغەمبەر(ﷺ) بە عایشەی فەرمووبوو: ئەها کەوتمە نێوان تۆ و باوکتەوە و نەمهێشت لێت بدا...
هەر ئەو ڕۆژە تاقی ئێوارە ڕۆیشتمەوە سەریکیان لێ بدەم... گوێم لێبوو بۆ خۆیان پێدەکەنین... منیش پێموتن: دەی وەک چۆن لە کێشەی نێوان خۆتاندا بەشدارتان پێ کردم، ئاواش لە خۆشی نێوان خۆتاندا بەشدارم بکەن...
وتیان: باش...
-باشە قوربان چۆن دەبێ کێشەی نێوان ژن و مێرد لە ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ڕووبدات؟ سەیر نییە؟

سلسلە و پلپلەوە بە فیزیکەوە بە ڕێدا دەڕۆیی... پرچی داهێنابوو... ئا لەو کاتەدا خوای گەورە بردی بە ناخی ئاخدا... هەتا ڕۆژی پەسلان بە ناو ئاخدا هەر سوور دەخوا...

- باشە قوربان ئایینی ئیسلام دژی ئەوەیە مرۆڤ پاکوخاوێن بێت و جلوبەرگی جوان لەبەر بکات و پرچی دابهێنێ و بۆنی خۆش لە خۆی بدا؟

+ نەوەڵڵا کێ وای وتووە؟ ئەوە نەک هەر نارەوا نییە، بەڵکوو یەکێکە لە داخوازییەکانی ئایینی ئیسلام... خوای گەورە خۆی جوانییە، جوانی خۆش دەوێ... خوای گەورە پێی خۆشە کاتێ ناز و نیعمەتی دەڕژێنێ بەسەر کەسێکدا، شوێنەواری ئەو ناز و نیعمەتە بەسەر ئەو کەسەدا ببینێ، بەڵام جوانی شتێکە و خۆبەزلزانی شتێکی تر...

ئایینی ئیسلام جوانی پێخۆشە، بەڵام دژی خۆبەزلزانینە... دژی ئەوەیە کەسێک ناز و نیعمەتەکانی خوا بە جۆرێک بەکار بێنێ کە بۆنی ئەوەی لێبێ کە ئەم بەکاربەرە خۆی بە گەورەتر لە خەڵک دەزانێ... بیرۆکەکە ئەوەیە کە دونیا لەنێو دەستدا بێ، نەک لەنێو دڵدا... جلوبەرگ لەشی مرۆڤ جوان و لەبار بکات، نەک دڵی مرۆڤ گەندەڵ بکا...

- زۆر باشە قوربان... زۆر بە باشی تێگەیشتم...

+ دەی ڕۆڵەکەم! پرسیاری ترت ماوە یان تەواو؟

- نەوەڵڵا قوربان تەواو نەبووە، هێشتا زۆرم ماوە...

+ دەی بزانم چ پرسیارێکت هەیە بیکە...

- وەڵڵا قوربان دەمەوێ ئەمجارە لە بارەی کێشەیەکی نێوان جەنابت و ڕەبیعەی ئەسلەمییەوە پرسیارت لێ بکەم، گوایە کێشەکە لەسەر دار خورمایەک بووە، هەرکەسێک لە ئێوە بە هی خۆی زانیوە... ئەوە چۆن بوو قوربان؟

+ ئەوەڵڵا کورم بۆچی سەیرە؟ خۆ پێغەمبەران هەرچەندە پێغەمبەرن و هەڵبژاردەی خوای گەورەن و پاک و بێگوناهن، بەڵام هەر پیاون و هەر مرۆڤن... ژنەکانیشیان هەرچەندە ڕێزێکی تایبەتییان هەیە، بەڵام خۆ ئەوانیش هەر ژنن و هەر مرۆڤن... زۆر ئاساییە لەنێوان هەموو ژن و پیاوێکدا چی ڕوودەدات، هەمان کێشە لەنێوان پێغەمبەرێک و ژنەکەیشیدا ڕوو بدات... کێشەی نێوان ژن و مێرد لە هەموو ماڵێکدا ڕوو دەدا... ئەوە کاردانەوەی مامەڵەی ڕۆژانەی ژن و مێردە لەگەڵ یەکتردا... خەم و خەفەتی ژیانە... دڵی مرۆڤیش لە کارکردن ناوەستێ و ئەمدیو و ئەودیوەیەتی... کاتێ عایشە دەنگی بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) بەرز کردەوە، لەسەر شتێک نەبوو کە پەیوەندی بە ئیمان و بیروباوەڕەوە هەبێ، ئەوە تەنیا پەیوەندی بە ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەی نێوان خۆیانەوە هەبوو... کاتێ دەنگی بەرز دەکردەوە، بەو سیفەتە دەنگی بەرز نەکردەوە کە تاکێکی مسوڵمانانە، بەڵکوو بەو سیفەتەی کە ژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)... مەبەستم ئەوەیە کە هەر ژنێکی مسوڵمانی ئەم سەرزەمینە ئەم چیرۆکە ببیستێ لەوانەیە پێی سەیر بێ و بڵێ: چۆن عایشە دەنگی بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) بەرز کردووەتەوە؟ لە کاتێکدا ئەگەر خۆیشی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوایە و کێشەی ڕۆژانەی ژیان بەرۆکی بگرتایە، بێگومان ئەویش وەک عایشە دەنگی بەرز دەکردەوە... ئەمەش وەک پاکانەیەک بۆ عایشە ناڵێم، بەڵکوو تەنیا وەک ڕاستی و حەقیقەتێک باسی دەکەم... ئەگەر هەر ژنێکی پێغەمبەر(ﷺ) دەنگی بەرز بکردایەتەوە هەر هەمان ڕا و بۆچوونم هەبوو...

- باشە قوربان مادەم وایە بۆ ویستت لە دایە عایشە بدەی؟

+ چونکە بە لامەوە ئاسان نەبوو ئەو دەنگ بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) بەرز بکاتەوە...

-ئەی تۆ خۆت نەتفەرموو: ئەوە شتێکی سروشتییە و لەنێوان هەموو ژن و مێردێکدا ڕوو دەدا؟

+ با وام وت، بەڵام هەموو شتێک شایانی ڕوودانە... هەرچەند ئەو دەنگ بەرزکردنەوەیەی عایشەی کچم لە چوارچێوەی کێشەی نێوان ژن و مێرددا نەدەچووە دەرێ، بەڵام ئەمە مانای وا نییە کە من پێی ڕازی بم... بۆ نموونە: ئەگەر تۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان بڕۆی بۆ ماڵی کچەکەت و کاتێ دەچیتە ماڵەوە ببینی کە کچەکەت و زاواکەت لەسەر شتێ بەشەڕ هاتوون، پێش ئەوەی پشوویەک بدەی، یان قومێک ئاو بخۆیتەوە، هەوڵ دەدەی ئاشتیان بکەیتەوە... خۆ ناڵێی: قەیناکا با شەڕ بکەن شتێکی ئاساییە...

تێگەیشتن لەو شتانەی کە ئاسایین و دەشێ ڕووبدەن شتێکە و کار نەکردن بۆ ئاساییکردنەوەی ئەو ڕووداوە شتێکی ترە... جگە لەوەش خۆ زاواکەی من پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو... ئەو بە هەموو پێوەرێک گەورەو سەرکردە و ڕێنیشاندەری من بوو... شتەکەش هەرچەندە ئاسایی و سروشتی بێت، هێشتا من ناتوانم لایەنی کچەکەم بگرم و ڕووبەڕووی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوەستمەوە...

- کەواتە تۆ لەگەڵ ئەوەدای کە کەسوکار خۆیان بتکێننە نێو کێشەی نێوان کوڕ یان کچیان، کاتێ لەگەڵ هاوسەرەکانیان دەمەقاڵێیەکیان دەبێ؟

+ کوڕم! خۆ تێتکاندن لە هەموو شتێکی گەورە و بچووک و بەرنامەدانان بۆیان کە چی بکەن و چی نەکەن و دانانی سنوور بۆیان، ئەوە شتێکی ترە... ناکرێ دایک، یان باوک، یان کەسوکاری نزیک خۆیان لە ورد و درشتی ژیانی هاوسەری منداڵەکانیان بتکێنن...

من پێموایە مرۆڤ لە کوڕ و کچی خۆی گەڕێ با چۆن دەژی ئاوا بۆ خۆی بژی... لە هەموو گەورە و بچووکێکدا خۆی

هەڵنەقورتێنێ، بەڵام ئەگەر کێشەیەکیش لەنێوانیاندا ڕوویدا بە پێی دەسەڵات بە دانایی و ژیری و لێزانینەوە کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات... ئاشتیان بکاتەوە... ئیتر دەمارگیریش بە خەرج نەدات و بە ناهەق لایەنی کوڕ یان کچەکەی خۆی نەگرێ... نابێ کەسوکاری کچ هەموو چاکەیەکی زاوا پشتگوێ بخەن و بە ناهەق پشتی کچەکەیان بگرن... نابێ کەسوکاری کوڕیش هەموو چاکەیەکی بووکەکەیان پشتگوێ بخەن و بە ناهەق پشتی کوڕەیان بگرن... دەبێ ڕەچاوی هەق بکرێت... کێ هەق بوو لەگەڵ ئەوە بە... بەپێی تواناش هەوڵ بدە چارەسەرێکی گونجاو بدۆزیتەوە و ئاشتیان بکەیتەوە...

بە کورتی: دەبێ مرۆڤ ئامۆژگاری و فەرمانکردن لە یەک بکاتەوە... ئامۆژگاری شتێکی باشە و هەموو کەسێ پێی خۆشە و مرۆڤی مەردیش ئامۆژگاری چاکی کوڕ و کچی خۆی دەکات، بەڵام فەرمانکردن و شت بە سەردا سەپاندن کارێکی دزێو و ناحەزە و مرۆڤی ژیر خۆی لێ دوور دەخاتەوە...

- باشە قوربان تێگەیشتم، بەڵام قوربان پێم بڵێ: بە ڕای جەنابت بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت پشتگیری لێ بکەیت و خۆت لە دایە عایشە تووڕە بکەیت؟

+ چونکە پێغەمبەر(ﷺ) مەردێکی تەواو مەرد بوو... عایشەش سووکایەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) نەکردبوو... ئەوە تەنیا کێشەیەکی هاوسەرانە بوو... پێغەمبەر(ﷺ) بەو کارەی دەریخست کە عایشەی زۆر خۆش دەوێ... ئەو بە چاوێکی بەرز و بەڕێزەوە لە عایشە دەڕوانی... ئەو کێشەیەی نێوانیشیان وەک هەورێک وایە بەری تیشکی خۆری ژیانی گرتبێ و بە زووترین کات دەڕەوێتەوە و تیشکی زێڕینی خۆر بە زووترین کات خۆی دەکاتەوە بە ژووردا... خۆشەویستی عایشەش لە دڵیدا چەقیوە و هیچ شتێ هەڵیناکەنێ...

**- بە خوا پێغەمبەر(ﷺ) قوتابخانەیەکی زۆر زۆر گەورەیە...**

**+ بەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) تەنیا لەو بووارەدا قوتابخانە نەبوو، بەڵکوو لە کاتی خۆشیدا قوتابخانە بوو... لە کاتی ناخۆشیدا هەر قوتابخانە بوو... لە کاتی خەم و خەفەتدا، لە کاتی توورەبووندا، لە کاتی پێکەنیندا، لە کاتی ڕازیبووندا، لە کاتی ڕقلێبووندا، لە کاتی خۆشەویستندا، لە کاتی قسە کردندا، لە کاتی بێدەنگیدا، لە کاتی جوولەدا، لە کاتی نەجووڵاندا هەر قوتابخانە بوو... بە کورتی لە هەموو کاروبارێکدا قوتابخانەیەکی زۆر مەزن بوو...**

- بەخوا قوربان ئەم قسەیە قسەی ڕاستە کە تۆ فەرمووت...

+ باشە کورم... هیچ ماوە، یان پرسیارت تەواو بوو؟

- نەوەڵڵا قوربان هێشتا زۆرم ماوە...

+ دەی فەرموو بپرسە...

❀ ❀ ❀

- قوربان چیرۆکی (حەنزەلە بووە بە دووڕوو) چییە و چۆن بوو؟

+ ئەوە ڕۆژێک (حەنزەلەی کوڕی ڕەبیع) بە خەمبارییەوە لە ماڵ هاتە دەرێ... لە ڕێگا من پێی گەیشتم...

وتم: حەنزەلە چۆنی؟

وتی: لێمگەڕێ... حەنزەلە بووە بە دووڕوو...

منیش وتم: پاک و بێگەردی بۆ خوا... ئەوە تۆ چی دەڵێی؟

وتی: کورە ئێمە دەچینە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی بەهەشت و دۆزەخمان بۆ دەکات... وا دێتە بەرچاومان دەڵێی هەر بە ڕاستی و بە چاوی سەر دەیبینین... کەچی لای ئەو هەستاین و

ڕۆیشتینەوە پەیوەندیمان کرد بە ژن و منداڵ و ماڵ و سەروەت و سامانەوە، دەڵێی: نە هیچمان بیستووە و نەهیچمان بینیوە...

منیش وتم: سوێند بەخوا ئێمەش وەک تۆ واین...

هەردووکمان ڕۆیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)...

حەنزەلە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەنزەلە بووە بە دووڕوو...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ؟ چی بووە؟

وتی: کورە قوربان ئێمە دێینە خزمەتت باسی بەهەشت و دۆزەخمان بۆ دەکەیت... وا دێتە بەرچاومان دەڵێی هەر بە ڕاستی و بە چاوی سەر دەیبینین... کەچی لای جەنایت هەڵدەسین و دەڕۆینەوە و پەیوەندی دەکەین بە ژن و منداڵ و ماڵ و سەروەت و سامانەوە، دەڵێی: نە هیچمان بیستووە و نەهیچمان بینیوە...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، لای من چۆنن ئەگەر بەردەوام وابن فریشتەکانی خوای گەورە لەسەر ڕێگاوباندا تەوقەتان لەگەڵدا دەکەن، بەڵام حەنزەلە مرۆڤ سات ساتە...

- قوربان مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) چیبوو... بۆچی فەرمووی: مرۆڤ سات ساتە؟

+ مەبەستی ئەوەبوو کە مرۆڤ ناتوانی لەسەر یەک شێوە بمێنێتەوە و بەردەوام هەر خەریکی خواپەرستی و بەندایەتی بێت... مرۆڤ دەبێ بژی... دەبێ لەگەڵ ژیاندا بڕوا... ئەوە بژێوی پەیداکردنە... ژن و منداڵ بەخێوکردنە... پەروەردەکردنی منداڵە... سەردانی دایک و باوک و خزم و کەسوکار و دراوسێیە... بەشداریکردنە لە بۆنە و کۆڕ و کۆبوونەوەدا... ئەمە مانای سات ساتە... مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە نییە کە مرۆڤ تاوێ

خواپەرست بێ و تاوێ لەسەر بەرنامەی شەیتان بێ... ساتێ لە مزگەوت بێ و ساتی بە ناڕەوایی باسی ئەم و ئەو بکات... ساتێ خێر بکات و ساتێ سووخۆر بێ... ساتێ هاوڕێی مرۆڤی چاک بێ و ساتێ لەگەڵ پیاوخراپدا بێ... ساتێ لەسەر بەرماڵ بێ و ساتێ لە شوێنێکی خراپدا دەرکەوێ...

سات ساتە بەو واتایەی کە مرۆڤ ساتێ خەریکی خواپەرستی بێ و ساتێ کاتەکانی خۆی لە شتێکی ڕەوادا سەرف بکات...

- خوا پاداشتت بداتەوە قوربان، تێگەیشتم...

+ خوا دڵت ڕووناک بکاتەوە کوڕم...

- ئامین... زۆر سوپاست دەکەم گەورەم...

+ دەی کوڕم بزانم چ پرسیارێکی ترت هەیە؟

- وەڵڵا قوربان بیستوومە (ئوسەیدی کوڕی حوزەیر) فەرموویەتی: ماڵی ئەبوبەکر! ئەمە یەکەم پیت و بەرەکەتتان نییە... مەبەستی چیبوو؟ بۆ وای فەرموو؟ بۆم ڕوون بکەرەوە...

+ باش... ئەوە جارێک لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دەرچووبووین... پێغەمبەر(ﷺ) هەرجارێ بۆ هەر شوێنێک بڕۆیشتایە تیروپشکی لەنێوان خێزانەکانیدا دەکرد... ناوی هەرکامیان دەرچووبا ئەوەی لەگەڵ خۆی دەبرد... ئەوێ ڕۆژێ عایشەی کچی منی لە خزمەتدا بوو... گەیشتینە شوێنێکی بیابان و بێ ئاو... عایشەی کچم خوناوکەیەکی لە ملا بوو... پچڕابوو... ونی کردبوو... پێغەمبەر(ﷺ) کاروانەکی گیر دا... بەدوای خوناوکەکەدا دەگەڕا... خەڵکی تریش دەستیان بە گەڕان کرد، بەڵام سوودی نەبوو... کاتی نوێژ نزیک بوویەوە... ئاویش نەبوو بۆ دەستنوێژ... بە بۆنەی ئەوەی کە زۆر گەڕابووین بەدوای خوناوکەکەی عایشەدا دەستمان نەدەگەیشتە شوێنێ ئاوی لێبێ... پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتە نێو چادرەکەی عایشە

بۆ ئەوەی سەرخەویک بشکێنێ... خەڵکی گلەییان لە من دەکرد و دەیانگوت: ئەها عایشەی کچت چی بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو خەڵکە کرد... ئەوەتا ئاوی دەستنوێژمان لێ بڕاوە و کەمێک ئاوی خواردنەوە نەبێ ئیتر ئاومان پێ نییە...

منیش ڕۆیشتمە نێو چادرەکەی پێغەمبەر(ﷺ)... پێغەمبەر(ﷺ) سەری خستبووە سەر کۆشی عایشە و خەوتبوو... منیش بە دەنگێکی نزم بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) خەبەری نەبێتەوە هەندێ سەرکۆنەی عایشەم کرد... خەڵک ئەوەندە گلەییان لە من کردبوو تەواو بێزار ببووم، بۆیە یەک دوو سیخوڕمەشم کوتایە لاتەنیشتی عایشە... ئەویش زۆری لە خۆی دەکرد بە ئەوەی نەجووڵێت و پێغەمبەر(ﷺ) خەبەری نەبێتەوە...

- ئەی قوربان دواتر چی قەوما؟

+ دوای کەمێک پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بۆ نوێژکردن... وەک پێموتی ئاومان نەبوو... خوای گەورە ئەم ئایەتی تەیەمومەی نارده خوارە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦﴾ المائـدة: ٦

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێک ویستتان هەستن بۆ نوێژ (پێش ئەوە دەستنوێژ بگرن، بەم شێوەیە): ئەوە سەرەتا ڕووخسارتان بشۆن، ئینجا دەستەکانتان لەگەڵ ئەنیشکتاندا، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتاندا، قاچەکانیشتان بشۆن لەگەڵ قولە پێتاندا، ئەگەر لەشتان گران بوو، ئەوە خۆتان خاوێن بکەن

و خۆتـان بشـۆن، ئەگـەر نەخـۆش بـوون، یـان لـە سـەفەردا بـوون، یـان دەسـتان بـە ئـاو گەیاندبـوو (تاراتتـان گرتبـوو) یـان لـە ئافرەتـی (نامەحـرەم) کەوتبـوون و ئاوتـان دەسـت نەدەکـەوت (بـۆ خۆشـتن یـان بـۆ دەسـتنوێژ، ئـەو کاتـە دەتوانـن) بـە خاکێکـی پـاک تەیەمـوم بکـەن (واتـە لەپـی دەسـتان بـە ئاسـتەم بماڵـن بـە خاکـدا) و بیهێنـن بـە ڕووخسـار و دەسـتاندا (تـا ئانیشـکتان)، خـوا نایەوێـت لـە ئایندا تووشـی سـەغڵەتی و نارەحەتیتـان بـکات، بەڵکـوو دەیەوێـت پـاک و خاوێنتـان بکات (لـە ڕواڵـەت و ناوەڕۆکدا) و دەیەوێت نـاز و نیعمەتـی خۆیتـان بـە سـەردا تـەواو بکات بـۆ ئـەوەی سوپاسـگوزار بـن.

ئیتـر دوای ئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) ئایەتەکـەی بـۆ هەمـووان خوێنـدەوە و ڕوونـی کـردەوە، ئوسـەید وتـی: ماڵـی ئەبوبەکـر! ئەمـە یەکـەم پیـت و بەرەکەتتـان نییـە...

- مەبەستی ئوسەید چیبوو قوربان؟

+ مەبەسـتی ئەوەبوو کـە خـوای گـەورە لـە دەرەنجامـی ونبوونـی ئـەو خوناوکـەی عایشـەیە و گەڕانـی پێغەمبـەر(ﷺ) و دواکەوتنـی خەڵکەکـە ئـەو ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە و مۆڵەتـی بـە مسـوڵمانان دا کـە ئەگـەر کەسـێک ئـاوی دەسـت نەکـەوت، یـان نەیدەتوانـی ئـاو بەکار بهێنێ، ئـەوا دەتوانێ لەجیاتـی دەسـتنوێژگرتن تەیەموم بکات... ئەگـەر لەبـەر ئـەو خوناوکـەی عایشـەیە ئێمـە لـە ڕێکردن بـەردەوام بووینایـە لـە کاتـی بانگـدا دەگەیشـتینە کانـی و ئـاو و لەبـەر بێئـاوی پەکمـان نەدەکـەوت و خـوای گـەورەش ئـەو ئایەتـەی نەدەنـاردە خـوارەوە، بـەڵام ئیتر خـوای گـەورە ویسـتی کارئاسـانی بـۆ مسـوڵمانان بـکات و ئـەو ڕووداوەی کـردە هـۆکار بـۆ ئـەو کار ئاسـانییە...

- بەخـوا قوربـان حەزرەتـی ئوسـەید ڕاسـتی فەرمـوو ئێـوە هـەر پیـت و بەرەکەتـن...

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کوڕم، بەڵام با پێت بڵێم: تۆ درکت بە شتێک نەکرد و لە بارەی ئەو شتەوە پرسیارت نەکرد...

- چییە قوربان پێم بڵێ؟

+ درکت بەوە کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر گەران بە دوای خوناوکەیەکی عایشەدا کاروانەکەی گیر دا و هەمووان بە دوایدا گەڕان؟

- وەڵڵا ڕاست دەفەرمووی قوربان... من بیرم لەوە نەکردەوە...

+ درکت بەوە کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگای لە هەموو شتێکی وردودرشت بوو؟ خاتری مرۆڤی دەگرت و دڵدانەوەی هەبوو، کە کەس گومانی ئەوەی نەبوو کاتی خاترگرتن و دڵدانەوە بێ؟

- ڕاست دەفەرمووی قوربان قسەی جەنابت تەواوە... ئەی قوربان خوناوکەکە چی بەسەر هات؟ دۆزیتانەوە؟

+ بەڵێ دۆزیمانەوە... دوای ئەوەی ئایەتی تەیەموم دابەزی و ئێمە هەموومان تەیەموممان کرد و نوێژمان کرد، ویستمان دەست بە ڕۆیشتن بکەین... کاتێ وشترەکەی عایشەمان هەڵساند، تەماشا دەکەین خوناوکەکە کەوتووەتە ژێر وشترەکەوە...

- بەخوا خێزانێکی پیرۆز و بە بەرەکەتن قوربان...

+ خوا پایەدارت بکا کوڕم... ئادەی بزانم چیترت پێیە؟

- دەمەوێ لەمەڕ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پرسیارت لێ بکەم کە لە بارەی جلخشاندنی مرۆڤی بەفیز و خۆبەزلزان بەسەر زەویدا فەرموویەتی، هەروەها لە بارەی ئەو شایەتییەی کە بۆ جەنابتانی داوە...

+ ئەوە ڕۆژێک ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووین... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێ بە فیزەوە جلی خۆی بخشێنێ بەسەر زەویدا، خوای گەورە لە ڕۆژی پەسڵاندا بە چاوی سۆز و میهرەبانییەوە سەیری ناکا...

منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! بەڕاستی لایەکی جلوبەرگەکانی من دەخشێ بە زەویدا، بەڵام ئەوەندە هەیە کاتێ لە بیرم بچێ -هەڵیکەم- دەخشێ بە زەویدا؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ لەو کەسانە نیت کە خۆبەزلزانن...

- بەخوا قوربان ئەوە شایەتییەکی گەورەیە بۆ جەنابت کە تۆ پیاوێکی خاکی و سادەیت و خۆبەزلزان و فیززل نیت... ئەو شایەتیەی پێغەمبەری خوات پیرۆز بێت... شایەتی کەسێ کە ڕاستگۆیە و لە خۆوە قسە ناکا، بەڵکوو لە خواوە قسە دەکات...

+ خوا بتپارێزێ کوڕم...

- باشە قوربان! پرسیارێکم بۆ هاتە پێش... پەیوەندی چییە لەنێوان جلخشاندن بەسەر زەویدا لەگەڵ خۆبەزلزانی و فیززلیدا؟

+ لە سەردەمی نەفامیدا لەناو عەرەبدا باو بوو، هەرکەسێ خۆی بە زل و گەورە بزانیایە، یان بیویستایە پۆز بە سەر خەڵکدا لێبدا، یان بیویستایە دەوڵەمەندی و دەسەڵاتداری و کەشوفشی خۆی دەربخا، جل و پۆشاکێکی زۆر شۆڕی لەبەر دەکرد و دەیخشاند بەسەر زەویدا... دوایی ئاینی ئیسلام هات... ئەو ئایینەی کە پڕیەتی لە خاکیتی و سادەیی... ئەو ئایینەی کە ویستی فیززلی و خۆبەگەورەزانین لە دڵی هەمووان‌دا ڕیشەکێش بکات، چونکە خۆبەزلزانی یەکەمجار زیانی بۆ خودی کابرای خۆبەزلزان هەیە... دواتر زیانی بۆ کەسی بەرامبەر هەیە، چونکە لەوانەیە کابرای هەژار خۆزگە بەو دەوڵەمەندە خۆبەزلزانە بخوازێ و ئەوەش زیانی بۆ ئایین و بیروباوەڕی هەیە... ئەو کات خۆی ئەملای نییە و ئەولایشی دەڕوا -پەنا بە خوا-.

ڕۆژێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەی بۆ ئێمە دەکرد... فەرمووی: جارێ پیاوێ هەبوو خۆی ڕازاندبوویەوە و بە -کوڵی- خشڵ و

+ ئـەوە ڕەبیعـەی ئەسـلەمی خزمەتـکاری پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـوو... پێغەمبـەری خـوا پارچـە زەوییەکی پـێ بەخشـی... زەوییەکـەی دراوسـێی زەوییەکـی مـن بـوو، دار خورمایـەک لـە پـەڕی زەوییەکـەی من و لـە تەنیشت سنووری زەوییەکـەی ئـەودا بـوو... ڕۆژێک ڕەبیعە هـات و وتـی: ئـەم دارخورمایـە هـی منـە...

منیش وتم: نەخێر هی منە...

ئـەو بـە تووڕەییەکـەوە وتـی: هـی منـە... منیش وەڵامـم دایـەوە و وتـم: هـی خۆمـە... ئـەو ئەوەنده لەسـەری ڕۆیی منی تـووڕە کرد، مـن قسـەیەکم لـە دەم دەرچـوو زۆرم پـێ ناخـۆش بـوو... کتوپڕ پەشیمان بوومـەوە و پێمـوت: دە توخـوا تـۆش هەمـان قسـە بـە مـن بڵێـوە...

بەڵام ئەو بەگوێی نەکردم...

منیـش وتـم: یـان ئەوەتـا قسـەکەم پـێ بڵێـوە، یـان ئەوەتـە لـە دژی تـۆ داوای هـاوکاری لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەکـەم و داوای هـاوکاری لـێ دەکـەم...

مـن بـە مەبەسـتی بینینـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕۆیشـتم... ڕەبیعەش بـە دوامـدا... لـە ڕێـگا گەیشـتین بـە کۆمەڵـێ خـزم و کەسـوکاری ڕەبیعە... خزمەکانـی ڕەبیعـە بـە ڕەبیعەیـان وت: ڕەحمەتـی خـوا لـە ئەبوبەکـر... بـە چ هەقێـک لـە دژی تـۆ داوای کۆمەکـی لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەکات؟ ئـەو قسـەی بـە تـۆ وتـووە و هێشـتا ئەویش سـکاڵای هەیـە؟

ڕەبیعـە وتـی: دەزانـن ئەمـە کێیـە؟ ئەمـە ئەبوبەکـری ڕاسـتگۆیە... ئەمـە دوانـەی ئـەو دوو کەسـەیە کـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ) لـە ئەشـکەوتەکەدا مایەوە... ئەمە ئـەو کەسـەیە کە ڕیشسـپی مسـوڵمانانە... نەکـەن لەگـەڵ منـدا بێنـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و ئەبوبەکـر بـەو جـۆرە بتانبینـێ و ببـێ بـە هـۆکاری تووڕەیـی ئـەو... دوایـی تووڕەیـی ئـەو ببێتـە هـۆکاری تووڕەبوونـی پێغەمبـەر(ﷺ)... دوایـی تووڕەبوونـی

پێغەمبەریش(ﷺ) ببێ بە هۆکاری تووڕەبوونی خوای گەورە لە من و ئیتر ماڵم کاول ببێ و دونیا و قیامەتم لە دەست بچێ؟

خزمەکانی ڕەبیعە وتیان: ئەی چی بکەین؟

ڕەبیعە وتی: بگەڕێنەوە... من خۆم بە تەنیا دەچمە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)...

- ئەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ ڕەبیعە دوام کەوت تا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)... کاتێ گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پێش من قسەی کرد و هەموو شتێکی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە...

پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ڕەبیعە! تۆ چیت لە ئەبوبەکر داوە؟ چیت لێی دەوێ؟

ڕەبیعە وتی: قوربان لەسەر دار خورمایەک بوو بە کێشەمان... ئەو قسەیەکی بە من وت زۆرم پێ ناخۆش بوو... دوایی پەشیمان بوویەوە و ویستی منیش هەمان قسە بە ئەو بڵێم، بەڵام من پێمنەوت...

پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: باشت کرد پێت نەگوتەوە... پێی بڵێ: خوا لێت خۆشبێ ئەبوبەکر...

ڕەبیعە ڕووی کردە من و وتی: خوا لێت خۆشبێ ئەبوبەکر...

ئیتر من بە دەم گریانەوە ئەوێم بەجێ هێشت...

- قوربان سەرم لە شتێک سووڕماوە...

+ لە چی؟

- وەڵڵا لەوەی کە تۆیەک هەموو سەروەت و سامانی خۆت لە پێناوی خوای گەورە بەخشی، چۆن لەسەر دار خورمایەک لەگەڵ ڕەبیعە بوو بەکێشەتان؟ پێم سەیرە...

+ کوڕم خێر و صەدەقە و بەخشین شتێکە و خەڵک بە

بەرچاوتەوە ماڵەکەت ببا شتێکی ترە... خۆ ئەگەر ڕەبیعە داوای بکردایە و بیگوتایە: ئەبوبەکر ئەو دار خورمایەم پێ ببەخشە... بێگومان منیش دار خورماکەم پێ دەبەخشی، بەڵام ئەو بڵێ: هی خۆمە و منیش دڵنیام کە هی ئەو نییە، بەڵکوو هی منە، ئەوە مافی خۆمە و ناهێڵم لە کیسم بچێ...

- باشە قوربان ئەو قسەیە تۆ بە ڕەبیعەت وت لە بابەتی جوێن و شتی وا بوو؟

+ پەنا بە خوا کوڕم! پەنا بە خوا... من و جوێن؟ ئەوە کەی قسەیە تۆ دەیکەی؟ من لە سەردەمی نەفامیدا جوێنفرۆش نەبووم، لە کاتی ئیسلامدا چۆن جوێن بە خەڵک دەدەم؟ بەڵام خۆت دەزانی لە کاتی تووڕەییدا مرۆڤ قسەی وا دەکا هەرچەند ئەو قسەیە جوێنیش نییە، بەڵام دڵی بەرانبەری پێ بریندار دەبێ...

- ڕاست دەفەرمووی قوربان، بەڵام بۆچی داوات لە ڕەبیعە کرد ئەو قسەیەت پێ بڵێتەوە؟

+ چونکە من پێمخۆشە مافی هیچ کەسێکم بە سەرەوە نەبێ... نامەوێ لە ڕۆژی پەسڵاندا لە خزمەت پەروەردگاردا، لەبەر قسەیەکی نەشیاو ببمە خەنیمی هیچ مسوڵمانێک...

- بەڵام قوربان با پیاو چاکەی چاکەکارانیش فەرامۆش نەکات، من زۆر سەرم لە ڕەبیعە سووڕ ماوە... چەنێ ڕێزی لە جەنابت گرت... چەندێ پەسنی جەنابتی دا... چەندێ تۆی لە لا پایەبەرز بوو... ئەو دەیزانی بە تووڕەبوونی تۆ پێغەمبەری خوا تووڕە و زیز دەبێ، بە تووڕەبوون و زیزبوونی پێغەمبەریش خوای گەورە تووڕە دەبێ... ئەها ڕەبیعە چەندێ بەڕێزەوە سەیری جەنابتی کردووە!

+ بە خوا ڕاست دەکەی ڕۆڵە... هەر ئەوە بوو قورەکەی بۆ من خەست کردەوە...

- چۆن قوربان مەبەستت چییە؟

+ کوڕی خۆم... کاتێ تۆ بەرامبەر کەسێک هەڵەیەک دەکەیت و ئەو کەسە وەڵامت دەداتەوە ئەوە تۆی ئاسوودە کردووە، بەڵام کاتێ وەڵامت ناداتەوە و سەرەڕای ئەوەش باسی چاکەکانت دەکات ئەوە لە هەتیتەی داوی... ئەوە کارێکی پێ کردوی ناتوانی لە خۆت ببووری...

- ڕاستە قوربان، بەڵام من بە شتێکی تریش سەرسامم...

+ بە چی؟

- بە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جەنابت... بەوەی کە چەندێ خاتری تۆی گەرەک بوو... بەوە کە بە ڕەبیعەی فەرموو: ڕەبیعە چیتە بە ئەبوبەکرەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەر کە زانی هەق لای ڕەبیعەیە ڕێنوێنی ڕەبیعەی بۆ سەر شتێ کرد کە چاکسازی دڵی ڕەبیعەی تیابێ...

+ بۆ خۆ ناشێ چاوەڕوانی ئەوەبی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر کەسێک، با ئەو کەسە ئەبوبەکریش بێ، پشت لە هەق بکات و لای ستەمکار بگرێ؟

- نا بە خوا قوربان مەبەستم ئەوە نەبوو... پەنا بە خوا... پەنا بە خوا... پێغەمبەر(ﷺ) چۆن شتی وای لێ دەوەشێتەوە؟ پێغەمبەر ئەو پێغەمبەرەیە کە فەرمووی: ئەگەر فاتیمەی کچیشم دزی بکا دەستی دەبڕمەوە...

+ ئافەرین کوڕم... دەی باشە پێم بڵێ ماومانە؟ پرسیارت ماوە یان تەواو؟

- بێگومان پرسیارم ماوە قوربان...

+ دەی بپرسە بزانم چی دەپرسی؟

- قوربان! باسی ئەو مانگایەم بۆ بکە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لەگەڵ خەڵکدا دەپەیوێ...

+ ئەوە بەیانییەک پێغەمبەر(ﷺ) پێشنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ خەڵک کردبوو... دوای نوێژ ڕووی کردبووە خەڵکەکە و وتاری بۆ دابوون... فەرموو‌بووی: جارێک پیاوێک مانگایەکی دابوویە بەر... دوایی سواری بوو، لە مانگاکەی دا... مانگاکە لای کردەوە بە لای پیاوەکەدا هاتە دەنگ و وتی: من بۆ ئەمە دروست نەکراوم، بەڵکوو بۆ زەویکێڵان دروست کراوم...

خەڵکەکە سەریان سووڕما وتیان: پاک و بێگەردی بۆ خوا... مانگایەک قسەی کرد و هاتە دەنگ؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموو‌بووی: من و ئەبوبەکر و عومەر باوەڕمان بەم چیرۆکە هەیە...

دوایی فەرمووی: جارێک پیاوێک لەناو مەڕەکانیدا بوو... گورگێک هێرشی بۆ مەڕەکان هێنا... مەڕێکی ڕفاند... شوانەکە شوێن گورگەکە کەوت و مەڕەی لێ سەند... گورگەکە هاتە دەنگ و وتی: وا ئەمڕۆ لە منت سەندەوە... ئەی ئەوێ ڕۆژێ جگە لە من کەس شوانیان نییە کێ لێم دەسێنێتەوە؟

خەڵکەکە سەریان سووڕما وتیان: پاک و بێگەردی بۆ خوا... گورگێک قسەی کرد و هاتە دەنگ؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموو‌بووی: من و ئەبوبەکر و عومەر باوەڕمان بەم چیرۆکە هەیە...

- باشە قوربان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بە دیاریکراوی ناوی جەنابت و حەزرەتی عومەری دەهێنا؟

+ چونکە ئەو دەمە ئێمە لەوێ نەبووین...

- تێنەگەیشتم قوربان...

+ پێغەمبەر(ﷺ) ویستبووی بە خەڵکەکە بفەرموێ: ئەگەر ئەبوبەکر و عومەر لێرەبان، بەبێ دوودڵی بڕوایان بە قسەکانی من دەکرد...

- ئای لەو شایەتییە گەورەیە... خۆزگەم بە خۆت قوربان... خۆزگەم بە خۆت ئەی حەزرەتی عومەر... پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە متمانەی بە ئێوە بوو دڵنیا بوو کە هەرچەندێ قسەکانی سەیر بێ، ئێوە بەبێ یەک و دوو... بەبێ فوولەدۆکردن بڕوای پێ دەکەن...

+ بەخوا کوڕم ئەو شایەتیەی پێغەمبەرم(ﷺ) لە هەموو شتێکی ئەم دونیایە پێ خۆشترە جگە لەو قسەیە نەبێ کە لە ئەشکەوتەکەدا بە منی فەرموو: ئەبوبەکر! خەمبار مەبە... ئەبوبەکر! گومانت چییە بە دوو کەس کە سێیەمیان خوایە؟

- دەی یاخوا پیرۆزت بێ قوربان...

+ خوا پایەدارت بکا کوڕم... پرسیاری ترت ماوە بیکەی؟

- قوربان بمبوورە زۆر درێژدادڕیم کرد، بەڵام سەبارەت بەم باسە یەک پرسیارم ماوە...

+ کێشە نییە کوڕم پرسیاری خۆت بکە...

- دەمەوێ لە بارەی پرسیارێکی عەمری کوڕی عاصەوە پرسیارت لێ بکەم... گوایە عەمر لە پێغەمبەری(ﷺ) پرسیوە: کێ خۆشەویستترین کەسە بە لاتەوە؟

+ پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کرد بە سەرکردەی ئەو سوپایەی کە ڕۆیشتن بۆ غەزای (ذات السلاسل)... بە یارمەتی خوای گەورە عەمر بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە... کاتێ هاتەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسی: قوربان! خۆشەویستترین کەس کێیە بە لاتەوە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عایشە...

عەمر وتی: ئەی لە چینی پیاواندا؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: باوکی -عایشە-...

عەمر وتی: ئەی دوای ئەو؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب...

- باشە قوربان عەمر بۆچی ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد؟ مەبەستی چیبوو؟

+ کوڕم ئێمە هەموومان پێشبڕکێمان دەکرد تا بزانین کاممان دەتوانین جێگای خۆمان لەنێو دڵی پێغەمبەردا(ﷺ) بکەینەوە... ئەو کاتە عەمر سەرکەوتنی تۆمار کردبوو... دەیەویست خۆی لای پێغەمبەر(ﷺ) بباتە پێشەوە... ئەوەی بە هەل زانی و ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بفەرموێ: تۆ...

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوەی هەموومانی خۆش دەویست عایشەی لە هەمووان زیاتر خۆش دەویست... هەموو کاتێکیش قسەی دڵی خۆی دەکرد و ڕاستی نەدەشاردەوە... هەرچەند ئەو دەمە عەمر سەرکەوتنی تۆمار کردبوو، بەڵام ئەوە وای لە پێغەمبەر(ﷺ) نەکرد کە قسەی دڵی خۆی نەکات و بە زمان شتێک بڵێ و دڵی شتێکی تری تیا بێ...

- بەڵام خۆ قوربان پرسیاری پیاوانیشی لێ کرد و ناوی جەنابتی برد و فەرمووی: باوکی عایشە...

+ بەڵێ کوڕم وابوو...

- دەی یاخوا پیرۆزت بێ قوربان... شایانی ئەو هەمووە خۆشەویستیەی...

+ خوا سەرکەوتوت بکا کوڕم... شتێک هەیە با پێت بڵێم...

- فەرموو قوربان گیانم لە لاتە...

+ کوڕم... هەموو مسوڵمانان لە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشەویست بوون... ڕۆژێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی ڕۆیشت

بۆ گۆڕستان... کاتێ گەیشتە ئەوێ فەرمووی: سڵاوی خواتان لێبێ ئەی هەوارگەی مسوڵمانان... ان شاالله ئێمەش پێتان دەگەین... زۆرم پێخۆش بوو براکانم ببینم...

ئێمەش وتمان: قوربان مەگەر ئێمە برای جەنابت نین؟

فەرمووی: ئێوە هاوەڵ و هاوڕێی منن، براکانم ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون و دوایی دێن... من لەسەر حەوزی کەوسەر پێیان دەگەم و دەیانبینم...

ئێمەش وتمان: قوربان چۆن ئەو مسوڵمانانەی دوای خۆت دەناسیتەوە؟

فەرمووی: ئەگەر کەسێک لە ئێوە ئەسپێکی ناوچاوسپی و چوارپەل سپی هەبێ و ئەو ئەسپەی لەناو ڕەوە ئەسپێکی ڕەشدا بێ، هەر لە دوورەوە ئەسپەکەی خۆی ناناسێتەوە؟

وتمان: بەرەوەڵڵا...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئوممەتی من بەهۆی گرتنی دەستنوێژەوە لە ڕۆژی پەسڵاندا ناوچەوان و دەست لاقەکانیان نوورانییە و من بە ئاسانی لەسەر حەوزی کەوسەر دەیانناسمەوە...

❀ ❀ ❀

- قوربان مۆڵەتم پێ دەدەی لە بارەی ئەو دەمەی کە جەنابتان بوون بە جێگر و خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیار بکەم؟

+ چیرۆکی ئەوە دووورودرێژە کوڕم... پێش ئەوەی خوای گەورە ئەو بەڵایەم تووش بکات دەستی پێ کرد...

- بۆ قوربان بوون بە خەلیفە بەڵایە؟

+ بەڵێ کوڕم... بەڵا واتە تاقیکردنەوە... ژیان هەر هەمووی

بەڵا و تاقیکردنەوەیە... لەو کاتەوەی مرۆڤ پێدەگات و باڵغ دەبێ لەژێر بەڵا و تاقیکردنەوەدایە هەتا ئەو کاتەی دەمرێ و دونیا بەجێ دێڵێ... جا دوایی خوای گەورە سەیری کار و کردەوەی ئەو مرۆڤە دەکات... سەرکەوتووە یان کەوتووە؟

هەندێ کەس بە هەڵە لە مانای بەڵا و تاقیکردنەوە تێگەیشتون... وادەزانن هەر کارێک خراپ و ناخۆش و دەردەدار بوو ئەوە بەڵایە... هەر کارێکیش خۆشی تیابوو ئەوە بەڵا و تاقیکردنەوە نییە... وادەزانن ئەو بەڵایەی کە مرۆڤ بە خراپی دەزانێ، سووکترە لەو بەڵایەی کە بە چاکی دەزانێ؟ ئەم تێگەیشتنە تێگەیشتنێکی هەڵەیە و دەبێ ئەم چەمکە ڕاست بکرێتەوە...

- چۆن قوربان؟ دەکرێ زیاتر ڕوونکردنەوە بدەیت؟

+ لەوانەیە تۆ پێت سەیر بێ و لە دڵی خۆتدا بڵێی: چۆن مرۆڤ بە درێژایی ژیان هەر لەژێر تاقیکردنەوەدایە؟ یان چۆن ئەو بەڵایەی کە مرۆڤ بە خراپی دەزانێ، سووکترە لەو بەڵایەی کە بە چاکی دەزانێ؟

- بەڵێ وایە...

+ باشە با بۆت ڕوون بکەمەوە... هەموو چرکە ساتێکی ژیانی مرۆڤ تاقیکردنەوەیە... کاتێ بە ڕێدا دەڕوا دیسان لەژێر تاقیکردنەوەدایە... تاقیکردنەوەی ئەوەی بزانن ئەو مرۆڤە کاتێ بە ڕێدا دەڕوا چاوی بەرەڵڵا دەکات و تەماشای هەموو شتێکی ڕەوا و ناڕەوا دەکات، یان جڵەوی چاوی دەگرێت و خۆی دەپارێزێ؟

بزانێ سڵاو لە خەڵک دەکات و بە ڕووی خەڵکدا پێدەکەنێ، یان بە پۆزێکەوە بە ڕێدا دەڕوا و نە سڵاوێک و نە بزە و خەندەیەک؟

کاتێ مرۆڤ هاوسەرگیری دەکات دەکەوێتە ژێر تاقیکردنەوەوە... بزانێ ئەو پیاوەی کە خوا ژنێکی بە نسیب کردووە، لەگەڵ ئەو

ژنەدا باشە و مافەکانی دابین دەکات و وەکو گوڵ بەخێوی دەکات تا ببێ بە سایە و پشتیوانی بۆ دونیا و پەسڵان، یان ستەمی لێ دەکات و بە چاوێکی سووکەوە سەیری دەکات و مافەکانی دابین ناکات و دەیکا بە دوژمنی دونیا و پەسڵانی خۆی؟

کاتێ خوای گەورە منالێک بە پیاو و ژنێک دەبەخشێ، ئەوە کەوتوونەتە ژێر تاقیکردنەوەیەکی نوێوە... ئەم دایک و باوکە بە جوانی منالەکەیان پەروەردە دەکەن؟ فێری ئاکاری بەرز و ڕەوشتی جوانی دەکەن؟ یان هەر ئەوەتا ڕۆڵی تێرکردن دەبینن و جگە لە خۆراک و پۆشاک ئیتر هیچیان بە لاوە گرنگ نییە؟

کاتێ خوای گەورە ڕزق و ڕۆزییەک بە مرۆڤ دەبەخشێ، ئەوە ئەو مرۆڤەی خستووەتە ژێر تاقیکردنەوەیەکی نوێوە... بزانێ ئەو کەسە لە کاتی کڕین و فرۆشتندا پاکە... یان دەستپیس و خیانەتکار؟

کاتێ کەسێ دەبێ بە بەرپرس، ئەو کەسە لەژێر تاقیکردنەوەیەکی سەختایە... تا بزانێ ئەو کەسە بە باشی لەگەڵ ژێردەستەکانیدا هەڵسوکەوت دەکات و مافیان دابین دەکات، یان خۆی لە کارەکانی دەدزێتەوە و گەندەڵی تێدا دەکات و ستەم لە خەڵکی دەکات؟

کاتێ ئەندامی خێزانێکە، ئەوەش هەر تاقیکردنەوەیە... ئایا ئەو کەسە لەگەڵ دایک و باوکیدا بە باشی مامەڵە دەکات یان کەسێکی خراپ و بەدفەڕە؟ سیلەی ڕەحم بەجێ دێنێ و سەردانی دایک و باوک و کەسوکار دەکات، یان خۆی لە هەموو کەسێکی دەشارێتەوە و گوێ بە کەس نادا؟

کاتێ خوای گەورە ماڵ و ژیان و یانەیەکی پێ دەدا، دیسان تاقی دەکاتەوە... تا بزانێ ئەم کەسە لەگەڵ دراوسێکانیدا چۆن ڕەفتار دەکات؟ دراوسێیەکی باش و دەستپاک و لەبارە؟ یان دراوسێیەکی خراپ و نەباش و نالەبار؟

خەڵک متمانەیان پێی هەیە و لە دەست و زمانی پارێزراون، یان متمانەیان پێی نییە و لە دەست و دەمی پارێزراو نین؟

تەنانەت کاتێ مرۆڤ دەچێتە سەر جێگای نوستن، ئەو دەمەش هەر لەژێر تاقیکردنەوەدایە... ئایا بە نیازی ئەوە دەخەوێ کە هەر بخەوێ و شەو بڕەوێنێ و ئیتر هەڵنەستێتەوە بۆ نوێژی بەیانی و بۆ یادی خوای گەورە، یان بەو نیازەوە دەخەوێ کە خوای گەورە هێز و گوڕێکی نوێی پێ ببەخشێ و ئەمیش ئەو هێز و گوڕە بۆ خواپەرستی و کاری ڕەوا بەکار بێنێ؟

کوڕم دونیا ئاوایە... هەرهەمووی تاقیکردنەوەیە...

- ئێستا تێگەیشتم قوربان... پرسیارێکم ماوە... ئەویش ئەوەیە: چۆن ئەو بەڵایەی کە مرۆڤ بە خراپی دەزانێ، سووکترە لەو بەڵایەی کە بە چاکی دەزانێ؟

+ کوڕم... چۆرتم و موسیبەت مرۆڤ تێکدەشکێنێ، بەڵام دڵی نەرم دەکات... سروشتی مرۆڤ وایە کاتێ تووشی چۆرتم و موسیبەتێک دەبێ و تێکدەشکێ، دڵی نەرم دەبێ و پەنا بۆ خوای گەورە دەبا... تۆ تەماشای مرۆڤی دەردەدار و نەخۆش بکە... بزانە بۆ چرکەیەکیش خوایان لە بیر دەچێ؟ بێگومان نەخێر، بەڵکوو بەردەوام یاد و زیکری خوای گەورە دەکەن... لە خوا دەپاڕێنەوە...

یان تەماشای مرۆڤی هەژار بکە... بزانە چۆن لە خوا دەپاڕێنەوە کە ڕزق و ڕۆزییان پێ بدات و فەڕ و پیت و بەرکەت بخاتە نێو دارایی و شتومەکیانەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا دڵیان زۆر نەرمە... ئاکاریان جوانە... خۆشڕەفتارن...

یان تەماشای ئەو کەسانە بکە کە لە کاتی جەنگ و شەڕ و ئاژاوەدا خۆیان پەنا داوە... بزانە چۆن پەنا دەبەن بە خوای گەورە؟ هەمیشە لێی دەپاڕێنەوە لەو موسیبەتە بە دووریان بگرێ و بە

خێر و خۆشی تێپەڕێنن و ڕزگاریان ببێ؟ زۆر بە دەگمەن ئەگینا مرۆڤ تووشی تاقیکردنەوەی ناخۆش ببێ سەردەکەوێ، بەڵام تووشبوون بە بەڵا و تاقیکردنەوە بە شتێکی خۆش، بە پێچەوانەی ئەوی ترەوە مرۆڤ یاخی دەکات... مرۆڤ خوای گەورەی لە بیر دەچێتەوە... مرۆڤ خۆی بە گەورە دەزانێ...

تۆ سەیر... بزانە چەند دەوڵەمەند دەبینی زۆر سوپسگوزاری خوای گەورە بن و لە کات و جێی خۆیدا خێر بکەن و مافی هەژاران بدەن و ئەو سەروەت و سامانانە بە گوێرەی شەرع بەکار بێنن؟

زۆربەی زۆری دەوڵەمەندەکان خۆیان بە زل دەزانن... وا دەزانن خۆیان بە ژیری و لێزانی و زانست و کردەوەی خۆیان هەموو شتێکیان پەیدا کردووە...

تۆ تەماشای بەسەرهاتی قارون بکە... بزانە چی دەگوت... خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی قارون دەکات و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ﴾ القصص: ٧٦ واتە: بێگومان قاروون لە قەوم و خوێشانی موسا بوو کەچی (بەهۆی ماڵ و سامانیەوە) خۆی گێڤ دەکردەوە بە سەریاندا و فیزی بە سەردا دەکردن، ئەوەندە ماڵ و سامان و داراییمان پێ بەخشیبوو، کە بەڕاستی کلیلی گەنجینە و قاسەکانی بە چەند کەسێکی بەهێز بە گرانی هەڵدەگیران...

خوای گەورە دەفەرموێ: ماڵ و سامان و داراییمان پێ بەخشیبوو... کەچی قاروون خۆی دەیگوت: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ﴾ القصص: ٧٨ واتە: بێگومان ئەم سامان و داراییەم بەهۆی زانست و زانیاری و نەخشە و پلانی خۆمەوە پەیدا کردووە...

تۆ تەماشا دڵی ئەو کەسانە بکە کە لەشیان ساغە و هیچ نەخۆشییەکیان نییە و لەگەڵ دڵی ئەو کەسانە بەرامبەریان بکەوە

کە نەخۆش و لەش بیمارن... بێگومان بۆت دەردەکەوێ دڵی ئەوانەی نەخۆش و بیمارن زۆر نەرمترە لە دڵی ئەوانەی لەشیان ساغە و هیچ نەخۆشییەکیان نییە...

سروشتی مرۆڤ وایە... زۆربەی زۆریان کاتێ لەشیان ساغە و هێز و گوریان هەیە، وا دەزانن ئەوە مافێکی خۆیانە و دەبێ وابن، بەڵام کە نەخۆش ئەو هێز و گوڕ و لەشساغیەی نەما ئیتر لە خوای گەورە نزیک دەبێتەوە و پەنای بۆ دەبا...

تەماشای ئەو گەل و هۆز و وڵاتانە بکە کە بە خێر و خۆشی و ئاشتییەوە دەژین و شەڕ و کوشت و کوشتار بەرۆکی نەگرتون، زۆربەیان لە خوا غافڵن... ئاگایان لە یاد و زیکری خوا نییە... وادەزانن مردن لێیانەوە دوورە، بۆیە ئامادەکاری بۆ ناکەن، بەڵام ئەو گەل و هۆز و وڵاتانەی کە مردن ئابڵوقەی داون... تووشی شەڕ و جەنگ و لێکدان و کوشت و کوشتار بوونەوتەوە، دەزانن مردن لێیانەوە نزیکە، بۆیە ئامادەکارییەکی باشی بۆ دەکەن...

- ڕاست دەفەرمووی گەورەم... قسەکەت تەواوە...

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کورم...

- باشە قوربان ئێستا دەکرێ خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لوتف بکات و باسی بارودۆخی ئەو کاتەم بۆ بکات کە هەڵبژێرا و بوو بە خەلیفە؟

+ باشە کورم! گوێ بگرە...

- دڵ و گیانم لە لاتە...

+ لە کۆتایی مانگی (ذي الحجة - ١٢)ـی ساڵی دەیەمی کۆچی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە حەجیماڵئاوایی گەڕایەوە... ئەو چەند ڕۆژەی کە لە مانگی (ذي الحجة) مابوو، لە شاری مەدینە دانیشت... دوایی ساڵی نوێ و مانگی موحەڕڕەم هاتە پێشەوە... دوای ئەو

مانگە مانگی (صەفەر) هاتە پێشەوە... لەو مانگەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی کرد بە ئامادەکاری و ڕێکخستنی سوپا بۆ ئەوەی بڕۆن بۆ جیهاد... ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد بە سەرۆکی سوپا... ئەو کاتە ئوسامە لاوێکی تەمەن هەژدە ساڵ بوو...

هەندێ کەس ڕۆیشتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێیان باش نەبوو ئوسامەیەکی ئاوا لاو ببێ بە سەرۆکی سوپا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی ئوسامە سەرۆکی سوپا بێ... پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشتە سەر مینبەر و وتارێکی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە... فەرمووی: (ئەگەر هەندێک لە ئێوە تانە لە ئوسامە و سەرکردایەتی ئوسامە بدات سەیر نییە، چونکە پێشتریش تانەتان لە سەرکردایەتی باوکی ئوسامە داوە... سوێند بە خوا ئەو شیاوی ئەوەیە بکرێ بە سەرکردە... ئەو -واتە زەیدی باوکی ئوسامە- بە لای منەوە یەکێک بوو لە خۆشەویستترین کەسەکان... کوڕەکەیشی -واتە ئوسامە- بە لای منەوە یەکێکە لە خۆشەویستترین کەسەکان).

وردە وردە خەڵک خۆیان ئامادە دەکرد بڕۆن بۆ جیهاد... ئا لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر بە سەختی نەخۆش کەوت... وای لێ هات نەیدەتوانی بێتە مزگەوت و بەرنوێژی بکات...

- دەی قوربان کێ لەجیاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرنوێژی دەکرد؟

+ دوای ئەوەی نەخۆشی تەنگی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵچنی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە خێزانەکانی کرد مۆڵەتی ئەوەی پێ بدەن لە ماڵی عایشەدا بمێنێتەوە... هەموو خێزانەکانی ڕازی بوون... بەردەوام چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بە دیاریەوە بوون... بیلال هات و بانگی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد بۆ نوێژ... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە یەکێک بڵێن بەرنوێژی بکات...

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە هەستا و هاتبووە دەرەوە... لە ڕێگا منی بینی و بە عومەری کوڕی خەتتابی وت: بەرنوێژی بۆ خەڵک بکە...

عومەر ڕۆیشتە پێشەوە و (اللە اکبر) نوێژی کرد و نوێژەکەی دابەست... دەستی کرد بە قورئانخوێندن... عومەر زۆر دەنگی بەرز بوو... پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لە دەنگی عومەر بوو... فەرموبووی: ئەی ئەبوبەکر لە کوێیە؟

ناردی بە شوێن مندا و من بەرنوێژیم بۆ خەڵکەکە کرد...

دوایی عومەر بە عەبدوڵڵای کوڕی زەمعەی وت: خوا خراپت بۆ نەکا ئەوە چ پەنیکت بە من دا؟ بە خوا وامزانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی بە من بڵێی بەرنوێژی بکەم، ئەگینا پێش نەدەکەوتم بۆ بەرنوێژیکردن...

عەبدوڵڵا وتی: بەخوا پێغەمبەر(ﷺ) ناوی کەسی نەبرد، بەڵام من خۆم ئەبوبەکرم نەبینی بۆیە تۆم لە هەموو کەسێک بە شیاوتر زانی بۆ بەرنوێژیکردن...

- یانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرنوێژیکردنی حەزرەتی عومەری هەڵوەشاندەوە؟

+ شتەکە ئاوابوو کە بۆم گێڕایەوە...

- دەی قوربان مادەم وابوو بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ناوی جەنابتی نەبرد؟

+ گومانی ئەوەی نەبردبوو کەسی تر پێش بکەوێ... ئەوە خۆ بۆم باس کردی سەرەتا عەبدوڵڵا بەدوای مندا گەڕابوو، بەڵام منی نەدۆزیبوویەوە... بۆیە بە عومەری وت بەرنوێژی بکات...

- ئەی قوربان بۆ نوێژەکانی دواتر چی؟

+ کاتێ نوێژی دوای ئەو نوێژە هاتە پێشەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ناوی منی بردبوو و فەرمووبووی: بڵێن بە ئەبوبەکر بڕوا بەرنوێژی بکات...

عایشەی کچم وتبووی: قوربان ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە و زوو دەگری... ئەگەر بڕواتە جێگاکەی تۆ و بەرنوێژی بکات، خۆی پێ ناگیرێ و دەست دەکا بە گریان و خەڵکی گوێیان لە قورئانخوێندنەکەی نابێ... بۆ فرمان ناکەی بە عومەر بڵێن بەرنوێژی بکات؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموبووی: بە ئەبوبەکر بڵێن بەرنوێژی بکات...

عایشە بە حەفصەی وت: دەی تۆ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڵێ کە ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە و زوو دەگری... ئەگەر بڕواتە جێگاکەی تۆ و بەرنوێژی بکات، خۆی پێ ناگیرێ و دەست دەکا بە گریان و خەڵکی گوێیان لە قورئانخوێندنەکەی نابێ... بۆ فرمان ناکەی بە عومەر بڵێن بەرنوێژی بکات؟

حەفصە بە پێغەمبەری خوای وت... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێوە وەک ژنەکانی لای یوسف پێغەمبەر(ﷺ) وان... دەی بە ئەبوبەکر بڵێن بەرنوێژی بکات...

ئیتر هاتن و بە منیان ڕاگەیاند و منیش بەرنوێژیم بۆ خەڵکەکە کرد...

کاتێ من دەستم کرد بە بەرنوێژی پێغەمبەر(ﷺ) کەمێک ئافاقەی بۆ هاتبوو... هەستایە سەر پێی و دوو کەس چووبوونە ژێر باڵی... تەشریفی هات و لە ڕیزەکەی دوای منەوە وەستا... من هەستم کرد پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی هاتووە... ویستم بێمە دواوە بۆ ئەوەی ئەو بێتە پێشەوە... ئاماژەی بۆ کردم کە بەردەوام بم... منیش بەردەوام بووم... ئیتر لەوەودوا چەندێ پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش بوو هەر من بەرنوێژیم بۆ خەڵک دەکرد...

- ئای قوربان... پێغەمبەر(ﷺ) چەندێ سوور بوو جەنابت بەرنوێژی بکەی... چەندێ تۆی خۆش ویستووە... چەندێ تۆی لە لا گەورە و بەڕێز بووە...

+ کورم! ئەوە ڕێزێکە لە لایەن خوای گەورەوە، دەیکا بە خەڵات بۆ ئەوانەی کە خۆی ویستی لەسەرە...

– دەی قوربان باسی وەفات و لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بۆ بکە... چۆن بوو؟ چی ڕوویدا؟

+ وەک پێموتی: بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەخۆش بوو، هەر من بەرنوێژیم بۆ خەڵکی کرد... تا ڕۆژ بوو بە ڕۆژی دووشەممە... دوانزەی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی یانزەی کۆچی... هاتم بۆ ئەوەی بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ خەڵک بکەم... ڕاوەستام و هێشتا نوێژم دانەبەستبوو... پێغەمبەر(ﷺ) پەردەی نێوان ژوورەکەی خۆی و مزگەوتی هەڵدایەوە... بە پێوە ڕاوەستابوو سەیری ئێمەی دەکرد... لە خۆشی ئەوەی کە ئێمە هەموومان یەک بووین و ناکۆک نەبووین، دەموچاوی ئەوەندە گەش و جوان بوو دەتگوت مانگی چواردەیە...

ئێمە سەرەتا وامان گومانبرد کە پێغەمبەر(ﷺ) چاک بووەتەوە و ئیتر خۆی بەرنوێژی دەکات... ئاماژەی بۆ کردین و بە ئاماژە تێیگەیاندین کە نوێژی خۆمان تەواو بکەین و خۆی تەشریفی ڕۆیشتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی...

دوای ئەوەی نوێژ کۆتایی پێهات، هەمووان وامانزانی کە پێغەمبەر چاک بووەتەوە و شیفای بۆ هاتووە... یەکەم کەس من ڕۆیشتمە خزمەتی... ئێش و ئازاری نەبوو... زۆر دڵخۆش بووم... پێموت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپاس بۆ خوا دەتبینم زۆر باشی... زۆر خۆشحاڵین... ئەمڕۆ من سەرەی لای ئەو ژنەکەی ترمە... بڕۆم بۆ لای؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ...

ئەو ماڵەکەم لە شوێنێکی دوور لە مزگەوت و ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو... لە شوێنێک بوو ناوی (سەنح) بوو... ڕۆیشتمەوە بۆ ئەوێ... هێشتا کاتی نوێژی نیوەڕۆ نەهاتبوو کە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەریان(ﷺ) پێدام...

- سڵاوی خوات لێبێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... من شایەتی دەدەم کە پەیامی خۆت گەیاند... ئامۆژگاری هەمووانت کرد... لە پێناوی خوای گەورەدا تێکۆشای... هەتا مردن کۆڵت نەدا...

+ منیش وەک تۆ شایەتم کوڕم...

- باشە قوربان... باسی وەفاتی پێغەمبەرم(ﷺ) بۆ تەواو بکە...

+ ئەو ڕۆژە مسوڵمانان بە تەواوی شڵەژان... هەموو لە مزگەوتدا سەرگەشتە و سەرگەردان ببوون... پیاوی وا هەبوو ئەوەندە پەشۆکابوو زمانی شکابوو قسەی بۆ نەدەکرا... پیاوی وا هەبوو هێزی ئەژنۆ و لاقی نەمابوو، خۆی بە پێوە نەدەگرت... پیاوی واش هەبوو بە هیچ شێوەیەک بڕوای بەوە نەبوو کە پێغەمبەریش(ﷺ) وەک هەموو مرۆڤێکی تر وەفات دەکات... بەو خوایە ڕۆڵە موسیبەتێکی زۆر زۆر گەورە بوو... مسوڵمانان تا ئەو کاتە و لەو کاتەوەش هەتا قامی قیامەت تووشی موسیبەتی وا نەبوون و نابن... من لە خۆمەوە وا ناڵێم، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی فەرموویەتی: هەرکەسێکتان تووشی موسبەتێک بوون بیر لە مردنی من بکاتەوە... ئەوە گەورەترین موسیبەتە -بەو بیر کردنەوەیە ئیتر موەسیبەتی خۆتان لە بیر دەچێتەوە-.

یەکێک لەو کەسانەی باوەڕیان وابوو کە پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز نامرێ، عومەر بوو... عومەر لە مزگەوتدا وەستابوو... دەیگوت: هەندێ کەسی دووڕوو دەڵێن: پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کردووە... بەو خوایە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی نەکردووە، بەڵکوو وەکو موسای

کوڕی عیمران ڕۆیشتووە بۆ موناجات لەگەڵ پەروەردگاردا... موسا چل شەو لە موناجاتدا بوو... خەڵکی دەیانگوت: موسا وەفاتی کردووە... کەچی دوایی هاتەوە... بەو خوایە پێغەمبەریش(ﷺ) وەک موسا دەگەڕێتەوە... بەخوا هەرکەسێ بڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە دەستی، قاچی دەبڕم...

من ڕۆیشتمە مزگەوتەوە... عومەر ئەم قسانەی دەکرد... هیچ قسەم لەگەڵ عومەردا نەکرد... یەکسەر ڕۆیشتمە ژوورەکەی عایشەی کچم... پێغەمبەر(ﷺ) بە پارچە چەرچەفێکی یەمانی داپۆشرابوو... چەرچەفەکەم لادا و سەیرێکی دەموچاوی پێغەمبەرم(ﷺ) کرد... ماچێکم کرد و وتم: خۆم و دایک و باوکم بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... بە زیندوویی و بە مردوویی چەندە پاکی... ئەو مردنەی کە خوای گەورە بۆی نووسیبووی چەشتت... ئیتر هەتا هەتایە جارێکی تر نامری...

دوایی سەری پێغەمبەرم(ﷺ) داپۆشییەوە... ڕۆیشتمە مزگەوت... عومەر هەر قسەکانی خۆی دووبارە دەکردەوە... پێموت: عومەر بێدەنگ بەو لەسەرخۆ، بەڵام بە گوێی منی نەکرد و هەر قسەکانی خۆی دووبارە دەکردەوە... ئیتر من زانیم عومەر بێدەنگ نابێ، بۆیە وازم لێ هێنا و ڕووم کردە خەڵکەکە و ویستم قسەیان بۆ بکەم... کاتێ دەستم کرد بە قسەکردن، خەڵکە پشتیان کردە عومەر و ڕوویان لە من کرد... منیش سوپاس و ستایشی خوای گەورەم کرد... دوایی وتم: خەڵکینە... هەرکەسێ محەمەد دەپەرستێ ئەوا محەمەد وەفاتی کرد... هەرکەسێکیش خوای محەمەد دەپەرستێ، بەراستی خوای گەورە زیندووە و نەمرە...

دوایی ئەو ئایەتەم خوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِي۟ن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن

يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمـران: ١٤٤

واتـە: (محەمـەد(ﷺ) تەنهـا پێغەمبەرێـک نەبـووە وەفـات بـکات، بێگومـان پێغەمبەرانـی پێش ئەمیش (وەفاتیـان کـردووە)، ئایـا ئەگـەر وەفاتـی کـرد یـان کـوژرا و شـەهید بـوو، ئێـوە پاشـگەز دەبنـەوە و هەڵدەگەڕێنـەوە؟ (لـەو دیـن و ئاینـەی کـە پێـی ڕاگەیانـدوون) خـۆ ئـەوەی هەڵگەڕێتـەوە و پاشـگەز بێتـەوە، ئـەوە هەرگیـز زیـان بـە خـوا ناگەیەنێـت، لـە داهاتوویەکـی نزیکـدا خـوای گـەورە پاداشـتی سوپاسـگوزاران دەداتـەوە.

بـە بیستنی قسـەکانی مـن خـەڵکی دڵنیا بوونـەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) وەفاتـی کـردووە...

- باشـە قوربـان مەبەسـتت لـەوە چیبـوو کـە فەرمـووت: ئـەو مردنـەی کـە خـوای گـەورە بـۆی نووسـیبووی چەشـتت... ئیتـر هەتـا هەتایـە جارێکـی تـر نامـری؟ مەگـەر مـرۆڤ دووجـار دەمـرێ؟

+ بەڵـێ مـرۆڤ دوو جار دەمرێ... جارێک وەک ئـەو مردنـەی کـە هەمـوو کـەس دەبـێ بمـرێ... جارێکـی تریش ئـەو کاتـەی بیـر و ڕا و بۆچوونەکانـی دەمـرن و کەسـێک نامێنـێ بـە گوێـی بـکات و پـەرە بـە ڕا و بۆچوونەکانـی بـدات... من مەبەسـتم ئـەوە بـوو...

خـۆ مـن ناتوانـم پێش بـە مردنـی یەکەمـی پێغەمبـەر(ﷺ) بگـرم... لـەوەش زیاتـر ناتوانـم پێش بـە مردنـی خۆیشـم بگـرم... لـە کۆتاییـدا هەمـوو مـرۆڤ و گیانلەبەرێـک دەبـێ بمـرێ، بـەڵام شـەرع و بیروبـاوەڕ و ئایینـی پێغەمبـەر(ﷺ) هەرگیـز و هەتـا قامـی قیامـەت نامـرێ... مـن خۆمـم جەموجـۆر کـرد کـە ئـاڵای پێغەمبـەری خـوا بگرمـە دەسـت... درێـژە بـە ڕێبازەکـەی بـدەم... لەپێنـاو گەیاندنـی شـەرعی خـوا گیانـی خـۆم بەخـت بکـەم...

- ئای چەندێ زانا و لێزانی قوربان... یانی تۆ بڕوات وایە ئایین تەنیا بیروباوەڕ نییە، بەڵکوو هەوڵ و تێکۆشان و بەرپرسیارێتیشە؟

+ بێگومان وایە... ئام ئایینە هاتووە بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی هەتا کۆتایی دونیا لەسەر ئەم ئایینە بن... خۆ بۆ ئەوە نەهاتووە هەتا پێغەمبەر(ﷺ) وەفات دەکات مسوڵمان بین و دوای ئەو ئیتر ئۆخەی ئۆخەی هەرکێ بۆ خۆی...

لەو کاتەوەی ئەم ئایینەمان بۆ ڕوون بووەتەوە و لێی تێگەیشتوین، زانیومانە کە هەموو تاکێکی مسوڵمان جێگری پێغەمبەری خوایە(ﷺ) لە گەیاندنی شەرع و ئاییندا... دەبێ وەک خۆی بیگەیەنین... درێژە بە ڕێباز و سوننەتەکانی بدەین... بۆ ئەوەی ئەم ئایینە پاکە وەک خۆی بمێنێتەوە...

- ئەو قسانەت چەندێ شیرینن قوربان... بەم قسە شیرینانەت بوو کە خەڵکیت لەو سەرگەردانی و سەرگەشتەییە هێنایە دەرەوە و تێگەیشتنی ڕاستەقینەت بۆ گەڕاندنەوە... بە هەمووانت فەرموو: تەنیا خوای تاک و تەنیا نەمرە و هەر ئەو شیاوی ئەوەیە بەندایەتی بۆ بکرێ... هەرچەند پێغەمبەریش وەفات بکات، بەڵام ئایینی ئیسلام هەر دەمێنێت و پایەدار دەبێ...

+ کوڕم ئەوە شتێک بوو خوای گەورە لەو ڕۆژەدا خستیە دڵی منەوە...

- باشە قوربان لە شتێک سەرم سووڕماوە... تۆیەکی دڵنەرم و بەسۆز، تۆیەک کە لە هەموو کەس و هەموو شتێ پێغەمبەرت زیاتر خۆش دەویست... تۆیەک کە تەنانەت پێت ئاسایی بوو گیانی خۆت لەپێناو پاراستنی گیانی پێغەمبەردا(ﷺ) بەخت بکەی... چۆن لەو کاتەدا ئاوا خۆڕاگر بوویت و وەک هاوەڵانی تر سەرگەشتە نەبوویت؟ خۆ بە ڕواڵەت دەبووایە تۆ لە هەمووان زیاتر بێخودی ڕووی تێ بکردیتایە و ئاگا و هۆشت بە خۆتەوە نەمایە...

+ کورم تەنیا خوای گەورە ئا لەو سات و کاتانەدا هێوری و ئۆقرە دەبارێنێتە سەر دڵی بەندەکانی... خوای گەورە ئەو چاکە گەورەیەی لەگەڵ مندا کرد و ئەو ئۆقرە و هێورییەی ڕژاندە سەر دڵ و دەروونم... قسەی ڕاستی خستە سەر زمانم... خوای گەورە منی بەکار هێنا بۆ ئەوەی وتارەکەم ببێ بە جیاکەرەوەی ڕاستی و گومان... قسەکانم ببێ بە پاڵپشتی هێزی ڕاستەقینە...

- ئەی قوربان دواتر چۆن خەڵکی پەیمانیان بە جەنابت دا و بووی بە جێگەداری پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

+ دوای ئەوەی هاوەڵان دڵنیا بوونەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە، هەر پێش ئەسپەردەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) کۆمەڵی ئەنصار لەژێر کەپری (بەنی ساعدة)دا کۆ بوونەوە بۆ ئەوەی یەکێکیان هەڵبژێرن و بیکەن بە جێگری پێغەمبەر(ﷺ)...

ئەنصارییەکان هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە سەعدی کوڕی عوبادە هەڵبژێرن... دوای ئەوەی ئێمەش بەو کەین و بەینەمان زانی و بیستمان کۆمەڵی برا ئەنصارەکان نیازێکی وایان هەیە، کۆچەرییەکان وتیان: با بڕۆین بزانین برا ئەنصارییەکانمان چی دەکەن؟

ئێمەش ڕۆیشتین... لەژێر کەپری بەنی ساعدە گەیشتین پێیان... پیاوێکیان تیا بوو دانیشتبوو خۆی داپۆشیبوو...

وتمان: ئەمە کێیە؟

وتیان: سەعدی کوڕی عوبادەیە...

وتمان: ئەی بۆ ئاوا خۆی داپێچاوە؟

وتیان: نەخۆشە و تا و لەرزی هەیە...

ئیتر ئێمەیش دانیشتین... برایەک لەوان هەستا و دەستی کرد بە قسەکردن... سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد...

دوایی وتی: ئێمە کۆمەڵی ئەنصار و یارمەتیدەرین... ئێمە پاڵەوانانی ئیسلامین... برا کۆچەرییەکان! ئێوە لە چاو ئێمەدا کەمن... دەبێ کەسی جێگرەوە لە ئێمە بێ نەک لە ئێوە...

عومەری کوڕی خەتتاب هەستا ویستی قسە بکات... منیش بە ئاماژەی دەست پێموت: دانیشە... لێیگەڕێ بۆ من...

دوای ئەوەی ئەو برا ئەنصارییە قسەکانی خۆی تەواو کرد، منیش هەستام و وتم: برا ئەنصارییەکان... هەموو ئەو خێر و چاکەیەی کە لە مەڕ خۆتانەوە باستان کرد وایە و کەس نکوڵی لێ ناکا، بەڵام دەبێ جێگەداری پێغەمبەر(ﷺ) قورەیشی بێ... قورەیشییەکان وەکو ناوکەی عەرەب وان... هەم لە ڕووی باب و باپیرەوە، هەم لە ڕووی ماڵەوە... من وەک خۆم دوو کەس دیاری دەکەم و پێمخۆشە ئێوەش یەکێک لەو دوانە هەڵبژێرن...

دواتر من دەستی عومەری کوڕی خەتتاب و دەستی ئەبوعوبەیدەی جەڕاحم گرت و وتم: ئەم دوانە...

عومەر وتی: بە خوا بێمە پێشەوە بۆ ئەوەی لە گەردنم بدرێ ئەوەندەی ئەوە لام گران نییە ببمە گەورەی کەسانی ئەبوبەکریان تیابێ...

پیاوێکی ئەنصاری وتی: دەی با جێگرێک لە ئێمە و جێگرێک لە ئێوە دیاری بکەین...

عومەر وتی: دەی بە خوا ئەوە دەبێتە سەرەتای دووبەرەکی... ناکرێ ئەم کارە دوو کەس بەڕێوەی ببا... دەبێ هەر یەک کەس ببێ بە خەلیفە و جێگر... ئەمە ئەبوبەکری ڕاستگۆیە... هاوڕێی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... دوانەی ئەو دووکەسەی کە لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە... پێغەمبەر(ﷺ) پێش وەفاتی فرمانی کرد ئەو بەرنوێژی بۆ خەڵک بکات... دەی بزانم کێ پێی خۆشە خۆی لەم بە شیاوتر بزانێ؟

هەمووان بێدەنگ بوون و کەس هیچی نەگوت...
منیش وتم: عومەر دەستت بێنە با پەیمانت بدەمێ...
عومەر بە منی وت: تۆ لە من باشتری...
منیش وتم: تۆ لە من بەهێزتری...
عومەر وتی: من هێزەکەی خۆم دەخەمە پاڵ چاکەی تۆ! -یانی بە هەموو جۆرێک دەبمە پشتیوانت-...
دوایی عومەر پەلاماری دەستی منی دا و پەیمانی بە من دا... دوای ئەو هەموو ئەوانەی لەژێر کەپرەکەدا بوون پەیمانیان بە من دا...
- قوربان یانی بەو جۆرە جەنابت بووی بە خەلیفە و جێگری پێغەمبەر(ﷺ)؟
+ ئەو پەیمانە پەیمانی تایبەت بوو... دواتر پەیمانە گەورەکەی بەدوادا هات...
- پەیمانە گەورەکە چییە قوربان؟
+ پەیمانی هەموو هاوەڵان بە گشتی... ئەو پەیمانە کە باسم کرد پەیمانی ڕۆژی دووشەممە بوو... ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد...
بۆ بەیانی لە لای مینبەری مزگەوت دانیشتم... پێش من عومەر هەستا وتی: خەڵکینە... دوێنێ قسەیەکم کرد... ئەو قسەیە ڕای خۆم بوو... ئەو قسەیە نە لە قورئانەوە وەرمگرتبوو نە لە فەرموودەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)... من خۆم وامدەزانی کە پێغەمبەر(ﷺ) دوای هەموومان وەفات دەکا، بەڵام ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئێمە وەفاتی کرد... خوای گەورە ئەو قورئانەی بۆ هێشتووینەتەوە... ئەو قورئانەی کە پڕە لە ڕێنوێنی... ئەو قورئانە کە بوو بە هۆی ڕێنوێنی خودی پێغەمبەریش(ﷺ)... ئەگەر ئێمە دەست بەو قورئانەوە بگرین ئەوا ڕێگای ڕاست ون ناکەین... خوای گەورە دەمانبا بە ڕێگای

پێغەمبەردا(ﷺ)... ئەوەتا خوای گەورە ئێمە لەسەر ئەوە کۆک کردووە کە کاروباری خۆمان بدەینە دەست باشترین هاوڕێی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... بیدەین بە دەست ئەو کەسەوە کە دووەمینی دوو کەسەکەی نێو ئەشکەوت بوو... ئەو کەسەی کە لە هەمووان باشترە... دەی هەستن هەمووتان پەیمانی بدەنێ...

بەوجۆرە هەموو خەڵکی هەستان و پەیمانیان پێ دام...

- سڵاوی خوای گەورە لە حەزرەتی عومەر بێ بە خوا پیاوێکی گەورە و مەزن بوو...

+ ئا بە خوا پیاوێکی مەزن و دەستپاک و ڕاستگۆ بوو... بەهێز و جێ متمانە بوو...

- ئەی قوربان ئەو ڕۆژە دوای قسەکانی حەزرەتی عومەر، جەنابت هیچ قسەت کرد؟

+ بەڵێ کوڕم... دوای ئەوەی هەموو هاوەڵان پەیمانیان پێ دام، منیش هەندێ قسەم کرد...

- چیت فەرموو؟

+ سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای گەورەم کرد... دوایی وتم: خەڵکینە... من کرام بە بەرپرستان و باشترین کەسی ئێوەش نیم... ئەگەر کاری چاکم کرد هاوکارم بن... ئەگەر کاری خراپیشم کرد ڕاستم بکەنەوە و مەهێڵن کاری خراپ بکەم... ڕاستگۆیی ئەمانەتە و درۆکردن خیانەتە... ئەو کەسەتان کە لاوازە لای من بەهێزە تا پشت بە خوا تۆڵە و مافی بۆ دەسێنمەوە... ئەوەشتان خۆی بە بەهێز دەزانێ لای من لاوازە تا ئەو کاتەی پشت بە خوا تۆڵە و مافی لێ دەسێنمەوە...

خەڵکینە... هەر گەل و کۆمەڵێک واز لە جیهاد و تێکۆشان بێنێ، خوای گەورە زەلیل و سەرشۆڕیان دەکات... خراپە و بەدکرداری لەناو

**هەر گەل وهۆزێکدا بڵاو ببێتەوە، خوای گەورە هەموویان تووشی بەلا و موسیبەت دەکا... هەتا من گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بکەم، ئێوەش گوێڕایەڵی من بکەن... هەرکاتێ من گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەری خوام(ﷺ) نەکرد، ئیتر ئێوەش گوێڕایەڵی من مەکەن... دەی هەستن بۆ نوێژ ڕەحمەتی خوای گەورەتان لێبێ...**

- قوربان با بگەڕێمەوە بۆ (کەپرەکەی بەنی ساعیدە)... بۆچی برا ئەنصارییەکان ویستیان پەیمان بە سەعدی کوڕی عوبادە بدەن؟

+ ئەنصارییەکان بە بیر و تێگەیشتنی باشی خۆیان تێگەیشتبوون کە دەبێ ئەو خەڵکە بەڕێوەبەر و گەورەیەکیان هەبێ و حکومەت بەبێ سەرکردە بەڕێوە ناچێ... دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بەپەلە ویستیان ئەو کارە بخەنە ئەستۆی سەعد...

سەبارەت بەوەی کە بۆ سەعدیان هەڵبژارد، ئەوە لەبەر ئەوە بوو کە سەعد گەورەی ئەنصارییەکان بوو... سەعدی کوڕی عوبادە و سەعدی کوڕی مەعاز، گەورەی هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج بوون... پێشتر سەعدی کوڕی مەعاز لە جەنگدا شەهید ببوو... ئیتر ئەوانیش هەموویان چاویان لەسەر سەعدی کوڕی عوبادە بوو...

- قوربان مەبەستم ئەوەیە بۆچی دەیانەویست بەبێ پرسی ئێوە خۆیان کارەکە بەڕێ بکەن و کۆتایی بە هەموو شتێ بهێنن؟

+ ئەوان هەرچەندە لەوەدا زۆر جوان پێکابوویان کە دەبێ گەورە و سەرکردەیەکمان هەبێ، بەڵام لەوەدا بە هەڵە چووبوون کە دەیانەویست بەبێ بەشداری ئێمە کارەکە یەکلایی بکەنەوە... ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە لەوەدا بەهەڵە چوبوون کە مەدینەیان تەنیا بە شاری خۆیان دەزانی و زۆرینە بوون و دەیانویست جێگری پێغەمبەری خوا بەپێی زۆری و کەمی بێ... پەیمانبەستن بەو جۆرە نابێ... پەیوەندی بە خۆمخۆمێنە و ئەو شتانەوە نییە... پەیوەندی بە

شوێن و جوگرافیاوە نییە، بەڵکوو پەیوەندی بە ئەوەوە هەیە کێ شیاوترینە؟ ئیتر بەبێ گوێدانە شوێن و جێگا و خزمایەتی و ئەو شتانە...

- بەڵام خۆ قوربان تۆ زۆر بە نەرمی وەڵامت دانەوە و ئەو هەڵە گەورەیەت بۆ ڕاست کردنەوە...

+ ئاخر کوڕم ئەوانە برای ئێمە بوون... ئەوانە بوون کە پێشوازییان لە ئێمە کرد و پەنای ئێمەیان دا و جێگای ئێمەیان کردەوە... هەر لە خانوو و ماڵەوە بگرە تا دەگا بە خواردن و ئاو و نان، هەر هەموو شتێکیان لەگەڵ ئێمەدا بەش کرد... یارمەتی ئێمەیان دا... لەبەر ئەم ئایینە تێکۆشان... جەنگان... شەهیدیان دا... مەگەر کەسێکی ڕەق و درۆزن و بە کردەوە، ئەگینا هیچ کەسێک ناتوانێ دان نەنێ بە چاکەی ئەواندا... جگە لەوەش هەموو مرۆڤێک لە گۆشەنیگای تایبەتی خۆیەوە تەماشای کاروبارەکان دەکات... ئیتر جاری وا هەیە دەیپێکێ، جاری واش هەیە هەڵە دەکات و نایپێکێ... گرنگ ئەوەیە کاتێ مرۆڤ پەی بە هەڵەی خۆی برد لەسەر هەڵەکەی خۆی سوور نەبێ و دان بە هەقدا بنێ...

- ڕاست دەفەرمووی قوربان، بەڵام من پێم سەیرە تۆیەک ئاوا خۆت لە جێگری بشاریتەوە، تۆ بۆ ئەوە هەڵەی ئەنصارییەکانت ڕاست نەکردەوە تا خۆت ببی بە خەلیفە و جێگر... بە پێچەوانەوە تەنیا ویستت هەق بڵێی... کەچی دوای ئەوەش دوات لە حەزرەتی عومەر کرد ئەو کارە بخاتە ئەستۆی خۆی... داوات لێ کرد دەستی بێنێ بۆ ئەوەی پەیمانی پێ بدەی، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو...

+ کوڕم! ئەو کارە بەرپرسیارێتییە... ئەوەندە بەسە کە مرۆڤ ترسی هەبێ لەوەی کە سبەینێ لەبارەی کار و کردەوە و ماڵ و منداڵیەوە لێی دەپرسنەوە، چ جای ئەوەی بەرپرسی هەموو خەڵک

بێ... ڕۆژی پەسڵان خوای گەورە بیوەستێنێ و پرسیاری ورد و درشتی کارەکانی لێ بکات... جا تۆ پێتوایە ئەم کارە تەشریفی و خاترگرتنە، یان ئەرک و بارە؟ بێگومان ئەرکە... بەرپرسیارێتییە... من دەمەویست ئەو ئەرکە بەسەر عومەردا بدەم، چونکە ئەوم لە خۆم بە بەهێزتر دەزانی، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو... بەو خوایە ئاگای لەنێو دڵی هەمووانە ئەگەر ڕازی بووایە یەکەم کەس بووم کە پەیمانم پێ دەدا...

- قوربان تۆ سەیری خۆشەویستی حەزرەتی عومەر بۆ جەنابت بکە... ئەو دەمەی کە فەرمووی: ئەگەر بێمە پێشەوە بۆ ئەوەی لە گەردنم بدەن پێم خۆشترە لەوەی بێمە پێشەوە بۆ ئەوەی ببم بە بەرپرسی کۆمەڵێ کە ئەبوبەکری تیابێ...

+ جا کێ وەک عومەرە؟ ئەو هاوڕێ پاکە... ئەو کەسە چاکە... ئەو پیاوە بەئەمەک و وەفایە... ئەو پیاوە بەهێزەی کە هێزەکەی وای لێ نەدەکرد هەرگیز ناهەقی بکات...

❀ ❀ ❀

- قوربان ئەوەندەی من بزانم پێغەمبەر(ﷺ) بە ناو ناوی هیچ کەسێکی نەهێنا ببێ بە جێنشینی، بەڵام بە برە ئاماژەیەکی زۆر وای دەرخست کە پێی خۆشە جەنابت ببنە جێنشینی، دەکرێ باسێکی ئەوەم بۆ بکەی؟

+ باشە کوڕم بۆت باس دەکەم، بەڵام پێش ئەوەی باسی ئەو ئاماژانەت بۆ بکەم کە دیار بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێ من ببمە جێنشینی، دەمەوێ باسی شتێکی ترت بۆ بکەم...

- فەرموو قوربان گوێبیستم...

+ پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ نەخۆش کەوت بە عایشەی کچمی فەرموو: بانگی باوکت و براکەتم بۆ بکە تا نووسراوێک بنووسم، بەڕاستی من دەترسم یەکێک قرمی لە جێنشینی خۆش کردبێ و بڵێ: من لە پێشترم... خوای گەورە و مسوڵمانانیش ئەبوبەکریان پێ خۆشە...

- ئەی قوربان بۆ هیچی نەنووسی؟

+ نەخۆشی تەنگی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵچنی... نە عایشە و نە هیچ کەسێکی تر وای بۆ نەچوون پێغەمبەر(ﷺ) بەو نەخۆشییە وەفات بکات... بۆیە عایشە پێی خۆش نەبوو باسەکەی لا بکاتەوە و نووسراوێکی پێ بنووسێ، بەڵکوو دەیەویست پێغەمبەر(ﷺ) چاک ببێتەوە و خۆی بە کەسێک بڵێ بینووسنەوە، بەڵام ویستی خوای گەورە هەر جێبەجێ دەبێ... ویستی خوای گەورە وابوو کە من بە پەیمان و بەڵێنپێدان و کۆدەنگی ببمە جێنشین و خەلیفە، نەک بە وەسیەت و دیاریکردن لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ)...

- دەی قوربان تۆ خۆت کامیانت پێ خۆش بوو؟

+ ئەوەم پێ خۆشبوو کە خوای گەورە پێی خۆشبوو... ئەگەر خوای گەورە پێیخۆش بووایە من بە وەسیەتی پێغەمبەر(ﷺ) ببم بە خەلیفە، ئەوا ئەوەیانم پێ خۆشتر بوو لەوەی کە بە کۆدەنگی و پەیمانپێدان ببمە خەلیفە، بەڵام خوای گەورە ئەوەی پێ خۆش بوو بەو جۆرە ببم بە خەلیفە کە بووم... بۆیە منیش ئەمەیان پێ خۆشترە لەوەیان...

- ئای لەو دڵ و ئیمان و بیر و باوەڕە قوربان...

+ کوڕم ئیمان واتە ڕازیبوون بە قەزا و قەدەری خوای گەورە... باشە ئەگەر مرۆڤ بە قەزا و قەدەری خوای گەورە چ خێر بێ چ شەڕ ڕازی نەبێ، ئیتر چی دەمێنێتەوە؟

- ئەی قوربان سەبارت بە ئاماژەکانی پێغەمبەر(ﷺ)...

+ ئامـاژەکان زۆربـوون... یەکەمیـان ئەوەبـوو خـۆی منـی دیـاری کـرد بەرنوێـژی بـۆ مسـوڵمانان بکـەم... کاتـێ بـە عومەریـان وت و عومـەر ویسـتی بەرنوێـژی بـکات، پێغەمبـەر(ﷺ) ڕازی نەبـوو... کاتـێ بـە عایشـەی فەرمـوو کـە بـە مـن بڵێـن بەرنوێـژی بکـەم و عایشـە داوای لـێ کـرد عومـەر بەرنوێـژی بـکات، ڕازی نەبـوو... بۆیـە عایشـە پەنـای بـۆ حەفصـە بـرد و داوای لـێ کـرد ئـەو داوا لـە پێغەمبـەر(ﷺ) بکات تـا عومـەر بەرنوێـژی بـکات... پێغەمبـەر(ﷺ) بـە داواکارییەکـەی حەفصـەش ڕازی نەبـوو... ئەمـە ئیتـر خـۆی بـۆ خـۆی ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەوەی دەیـەوێ مـن ببـم بـە جێنشـین...

- ئـەی قوربـان بۆچـی هاوەڵانـی ئەنصـار ئـەم ئاماژانـە سـەرنجی ڕانەکێشـان و ویسـتیان یەکێکـی تـر بکـەن بـە جێنشـین و خەلیفـە؟

+ کـوڕم... کاتـێ مـرۆڤ میوانێکـی دێ بـەو میوانـەوە سـەرگەرم دەبـێ... کاتـێ بـەڵا و موسـیبەت بەرۆکـی کەسـێک دەگـرێ ئـا لـەو کاتـەدا مـرۆڤ هەنـدێ شـتی لەبیـر دەچێتـەوە... جگـە لـەوە کارەکـەش کارێـک بـوو کـە یـەکلا نەکرابوویـەوەو دەکـرا مـرۆڤ ڕاوبۆچوونـی خـۆی بـاس بـکات و بـە ڕاوبۆچوونـی خـۆی یـەکلای بکاتـەوە...

- باشە قوربان تێگەیشتم... ئەی هیچ ئاماژەیتر هەبوو بۆم باس بکەی؟

+ جارێـک ژنێـک هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) داوای شـتی لـێ کـرد... لەو کاتـەدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هیچـی نەبـوو... فەرمـووی: دوای ماوەیەکـی تـر وەرەوە بـۆ لام -بـا هەنـدێ شـتت پـێ ببەخشـم-.

ژنەکـە وتـی: ئـەی ئەگـەر هاتـم و تـۆم دەسـت نەکـەت؟ مەبەسـتی ئەوەبوو ئەگـەر دوای ماوەکـە هاتـەوە و پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وەفاتـی کردبوو، ڕوو لـە کـێ بـکات و داوا لـە کـێ بـکات؟

پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فەرمـوو: ئەگـەر مـن نەبـووم بـڕۆ بـۆ لای ئەبوبەکـر...

- بەخوا قوربان ئەمە ئاماژەیەکی گەورە و ڕوون بووە... قوربان ئاماژەی تر هەیە؟

+ بەڵێ هێشتا ماوە... ڕۆژێک کۆمەڵێک لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین... پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی تێکردین و فەرمووی: من نازانم چەندێکی تر لەناوتاندا دەمێنمەوە... دوای من شوێنی ئەم دوانە بکەون... ئاماژەی کرد بۆ من و عومەر... دوایی فەرمووی: وەکو عەممار خواپەرستی بکەن... ئیبنومەسعودیش هەرچی پێ گوتن گومانتان لێی نەبێ...

- وەڵڵا قوربان ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوون بووە... ئەی قوربان ئاماژەی تر هەیە؟

+ بەڵێ ئاماژەی تر هەیە...

- دەی قوربان بێزەحمەت بۆم باس بکە...

+ جارێک لە مزگەوتدا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین... پێغەمبەر(ﷺ) باسی خەوێکی خۆی بۆ گێڕاینەوە... فەرمووی: خەوم بینی، لە خەوما لەسەر حەوزێک بووم... ئاوم بە خەڵکی دەدا... ئەبوبەکر هات دۆڵچەکەی لێ وەرگرتم بۆ ئەوەی پشوویەک بدەم... دوو دۆڵچە ئاوی هەڵگۆزی، بەڵام هەڵکۆزینەکەی کەمێک لاواز بوو... خوا لێی خۆشبێ، دوایی عومەری کوڕی خەتتاب هات، دۆڵچەکەی لە ئەبوبەکر وەرگرت و -ئاوی هەڵگۆزی- هەرگیز کەسێکم نەدیوە وەکو عومەر بەهێزبێ، ئاوی بە خەڵکەکە دا... حەوزەکەش هەر ئاوی هەڵدەقولاند...

- ئەمەش ئاماژەیەک بوو بۆ ئەوەی کە جەنابت دەبی بە جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ)... وەک دەردەکەوێ ئەو دۆڵچەیە بریتی بووە لە خەلافەت و سەرکردایەتیکردن... کە جەنابت دۆڵچەکەت لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرت، ئەوە مانای ئەوەیە کە حوکم و سەرکردایەتی

لە پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگری... دوای وەفاتی ئەو تۆ دەبی بە سەرکردە... حەزرەتی عومەریش لە جەنابتی وەرگرت، ئەوەش مانای وایە ئەویش دوای تۆ بووە بە خەلیفە و سەرکردایەتی و حوکمی وەرگرت...

+ بەڵێ کوڕم جوانت خەوپەرژین کرد... وابوو کە تۆ دەیڵێی... ئەو خەونە ئاماژە بوو بەوەی کە دوای پێغەمبەر(ﷺ) من دەبم بە خەلیفە و جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ)...

- باشە قوربان بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ دوو دۆڵچەت هەڵگۆزی و کەمێک لاواز بووی، بەڵام عومەر زۆر بەهێزەوە ئاوی هەڵدەگۆزی و ئاوی دا بە هەموو خەڵکەکە و حەوزەکەش هەر پڕ دەبوو لە ئاو و لێی کەم نەدەبوویەوە؟

+ کوڕم ئەوەش هەر ئاماژەی تێدایە... ئەو لاوازییەی من ئاماژەیە بەوەی کە من دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر ناژیم و تەمەنم کورت دەبێ و ماوەی خەلیفایەتیم کەمە... زوو دەمرم... لەو ماوەیەشدا نامپەرژێتە سەر هەندێ کاروبار، بەڵکوو زیاتر بە گژ ئەوانەدا دەچمەوە کە لە ئایین پاشگەز دەبنەوە... خەریکی دامرکاندنەوەی ئاژاوە ناوخۆییەکان دەبم... کاروبار ڕێک دەخەمەوە و هەموو شتێ توندوتۆڵ دەکەمەوە و ئیتر ماڵئاوایی دەکەم و کارەکە بە عومەر دەسپێرم و ئەویش ئیتر خەریکی کاروباری دەرەوە و ڕزگارکردنی خاکی دەرەوەی سنووری عەرەب دەبێ...

- بەخوا قوربان جوانت لێکدایەوە...

+ خوا لێت ڕازی بێ کوڕم...

- قوربان ئەگەر بە ئەزیەت نەبێ پرسیارێکم هەیە...

+ فەرموو کوڕم بپرسە...

- ئاماژەکان زۆر و ڕوون بوون... باشە بۆ خەڵکی هەر لە سەرەتاوە درکیان بەو شتانە نەکرد؟

+ کوڕم خۆ ئەو شتانە هەموویان لە یەک کاتدا ڕووی نەداوە... ئەی خۆ ئەو خەڵکەش هەموویان لە هەموو کاتێکا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) نەبوون... بۆ نموونە شتێکت بۆ باس دەکەم... من دوو ژنم هەبوو... ژنێکم ناوی حەبیبە بوو... ماڵی حەبیبە لە شوێنێکی سەرەوەی مەدینە بوو بە ناوی (سەرح)ـەوە... کاتێ سەرەی لای حەبیبە بوو دەچووم بۆ (سەرح) ئیتر لە پێغەمبەر(ﷺ) دادەبڕام و زۆر جار نەمدەتوانی لە کۆڕ و کۆبوونەوەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەشدار بم... زۆر شتی فەرمووە من لێی بێئاگام...

عومەری کوڕی خەتتاب و برایەکی بە سەرە کاریان دەکرد و خزمەتکاری پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد... ڕۆژێک عومەر کاری دەکرد و بژێوی پەیدا دەکرد و براکەی لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو... ڕۆژی دواتر بە پێچەوانەوە، براکەی کاری دەکرد و بژێوی پەیدا دەکرد و عومەر لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو... ئیتر ڕووداوەکانیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە... بەو جۆرە بوو...

برا ئەنصارییەکان خەڵکی مەدینە بوون... زۆربەیان باخ و بێستان و کشتوکاڵیان هەبوو... دەڕۆیشتن بە دەم کشتوکاڵەوە... بە دەم باخڕنینەوە... ئێ لەبەر ئەوە زۆر جار لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوور دەکەوتنەوە و نەیاندەزانی پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرمووە و چی کردووە...

برا کۆچەرییەکان هەرچەند ئەوان لە چاو برا ئەنصارییەکاندا زەوی و کشتوکاڵیان نەبوو، بەڵام ئەوانیش بە زۆری لە بازاڕدا بوون و کار و کاسبییان دەکرد... خەریکی پەیداکردنی بژێوی بوون... ئەوانیش زۆر جار نەیاندەتوانی بێنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو شتێکی لێ ببیستن... بۆیە هیچ کەسێک نەبووە کە هەموو شتێکی لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستبێ...

- زۆرباشە قوربان زۆر جوان تێگەیشتم...

+ دەی ڕۆڵە پێم بڵێ: پرسیارت ماوە؟

- لەمبارەوە نەخێر، بەڵام ئەگەر خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیزنم بدا پرسیارەکانم دەگۆڕم و دەچمە سەر باسێکی تر...

+ باشە کوڕم کێشە نییە، پرسیاری خۆت بکە...

- دەمەوێ لەمەڕ دواتری ئەو ڕۆژە پرسیارت لێ بکەم کە بووی بە خەلیفە...

+ بە دیاریکراوی دەتەوێ لە چ ڕوویەکەوە پرسیار بکەی؟

- قوربان من وادەزانم ئەو وتارەی جەنابت زۆر کورت بوو... من مەبەستم ئەوەیە ئەوە یەک قسە و سیاسەتی یەکەم خەلیفە بوو... ڕۆژێکی نوێ جیاواز لە ڕۆژانیتر... نازانم لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا کاتێ بەڕێوەبەری ئاهەنگێک دەیەوێ کەسێک پێشکەش بکات بۆ ئەوەی وتارێک بدا، خۆی ئەوەندە قسە دەکا خەریکە نەیبڕێتەوە... یان کاتێ وتاربێژێک وتار دەدا، ئەوەندە قسە دەکا پێی خۆش نییە هەر بیبڕێتەوە...

+ کوڕم خۆ قسە بە زۆر و کەمی نییە... مەرج نییە قسەی زۆر پەند و ئامۆژگاری زۆری تیابێ... مەبەست ئەوە نییە هەر کەسێ دەستی کرد بە قسە ئیتر نەیبڕێتەوە، بەڵکوو دەبێ ئەو کەسەی قسە دەکات بزانێ قسەکانی چەندێ کاریگەرن؟ چەندێ پەند و ئامۆژگاری تێدایە... دەبێ بیر و باوەڕ و بۆچوونی خۆی بە کورتی و بەڕوونی بگەیەنێ... خۆ ناکرێ کەسێ قسەی کرد ئیتر چیرۆکی جیجلە و بجیلە بگێڕێتەوە... سەردەمی ئێمە داب وا نەبوو کەسێ وتاربێژ زۆر قسە بکا... ڕەوانبێژی زۆر گرنگە... ڕەوانبێژی لەوەدایە

یەکەم: وتارەکە تا دەکرێ کورت بێ...

دووەم: درێژدادڕی وا دەکا کەسێ گوێگر زۆربەی قسەکانی لە بیر بچێتەوە... کاتێ وتاربێژ قسە دەکات ئەگەر هەر بیهێنێ و بیبا،

کەسی گوێگر لە کۆتاییدا نازانێ چی بیستووە و چی وتراوە... بە پێچەوانەی وتاری کورت و ڕێکوپێکەوە، وتاری کورت و ڕێکوپێک دەچەقێتە نێو مێشکی مرۆڤ و لە بیر ناچێتەوە...

سێیەم: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کورتکردنەوەی وتار و درێژەدان بە نوێژ، ئەوە زانایی مرۆڤ دەردەخەن...

- تێگەیشتم قوربان، بەڵام دەکەوێ ئەوە بپرسم: نابێ یەکەم وتاری کەسێ کە حوکم دەگرێتە دەست بایی ئەوەندەبێت کە سیاسەتی ئەو کەسە ڕوون بکاتەوە، تا خەڵک بزانن چۆن کاروبار بەڕێوە دەبات و چی دەکات و چی ناکا؟

+ با...

- دەی باشە قوربان دەکرێ جەنابت بۆم ڕوون بکەیتەوە تا ئێمەش بزانین خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە یەکەم وتاردا چۆن سیاسەتی خۆی ڕوون کردەوە؟

+ بۆ ناکرێ کورم؟ گوێ بگرە...

- بە گیان و دڵ گوێ دەگرم... فەرموو قوربان...

+ یەکەمجار وتم:

هەتا من گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەری خوا بکەم، ئێوەش گوێڕایەڵی من بن... هەرکاتێ لە فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لامدا، ئێوە بە گوێم مەکەن و گوێڕایەڵم مەبن...

من بەم دوو دێڕە قسەیە ئەوەم بە خەڵکی ڕاگەیاند کە بنەما و دەستووری حکومەتی نوێ لەسەر بناغەی شەرعی خوا دادەنرێ... کەبریتییە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)...

قورئان سەرچاوەی یەکەمە...سەرچاوەی یەکەمی شەرعە... قورئان هەموو کاروبارێکی ژیانی مرۆڤ ڕێک دەخات... لە هەموو بابە شەرعییەکان دەدوێ...

فەرموودەی پێغەمبەری خوداش(ﷺ) هەرکاتێ باسی لە شتێک کرد کە لە قورئانیشدا هەبوو، ئەوە سەرچاوەی دووەمە...

هەر کاتێ باسی لە شتێکیش کرد کە لە قورئاندا باس نەکرابوو، ئەو کاتە سەرچاوەی یەکەمە...

هەندێ بابەت ئیتر ئایا بابەتی خواپەرستی بێ، یان بابەتی کاروباری ڕۆژانە، لە قورئاندا زۆر بە کورتی باس کراوە و هەموو کەسێ لێی تێناگا، فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو بابەتانەی ڕوون کردووەتەوە...

بۆ نموونە:(خوای گەورە لە قورئاندا فرمانی پێ کردووین نوێژ بکەین، بەڵام ژمارەی نوێژەکانی دیاری نەکردووە... کاتی نوێژەکانی دیاری نەکردووە... ڕکاتی نوێژەکانی دیاری نەکردووە چەند ڕکات بێ... ئەوەشی دیاری نەکردووە کە لەناو نوێژدا چی بخوێنین و چی بڵێین، بەڵام فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە تێر و تەواوی و دووروودرێژی و بە وردەکارییەکی زۆر سەرنجڕاکێشەوە باسی هەموو ئەوانەی کردووە و بووە بە تەفسیر و ڕاڤەی قورئانی پیرۆز...)

- زۆر سوپاست دەکەم قوربان، زۆر بە جوانی بۆ منت ڕوون کردەوە... باشە قوربان جەنابت لەو وتارەدا جگە لە بابەتەکانی شەرع، چ سیاسەتێکی خۆتت ڕوون کردەوە؟

+ ئەگەر لە بیرت مابێ پێشتر پێموتی: من لە وتارەکەمدا وتم: ئەگەر کاری چاکم کرد یارمەتیم بدەن... ئەگەریش خراپەیەکم کرد ڕاستم بکەنەوە و مەهێڵن بیکەم...

من بەم دێڕە قسەیە بناغەی چاودێریکردنی کاربەدەست و لێپرسینەوەی کاربەدەستم داڕشت...

پێم ڕاگەیاندن منیش مرۆڤم... دەکرێ هەڵە بکەم... سەردەمی پێغەمبەران(ﷺ) بەسەر چوو... لەمەولا جگە لە حەزرەتی عیسا کە

لە کۆتایی دونیادا دێ، ئیتر کەسێک نایەتە سەر زەوی کە بێتاوان بێ و هیچ تاوانێکی لێ نەوەشێتەوە... منیش یەکێکم لەو کەسانەی کە دەکرێ هەڵە بکەم... من بەو چاوەوە سەیری خەڵکم دەکرد کە ئەوانیش هاوبەشن لە گەڵمدا بۆ بەڕێوەبردنی حکومەت و ئایینی ئیسلام، نەک هەروا کوێرانە شوێنم بکەون و ئیتر هەرگیز نە قسەیەکیان هەبێ و نە ڕەخنەیەک بگرن... بە کورتی من فەرمانبەرێکم کاروباری خەڵکی بەڕێوە دەبەم، نەک ئەوان فەرمانبەری من بن... ئەوان مافیان بەسەر منەوە هەیە و منیش ئەوەم پێ دەبڕێ کە گوێڕایەڵم بن... لە هەر کاروبارێکی چاکدا دەبێ گوێڕایەڵم بن... من بۆم نییە بە هیچ شێوەیەکی ناشەرعی سەروەت و سامانی ئەوان بخۆم... ئەگەر فرمانم پێ کردن بۆ کردنی چاکەیەک، دەبێ بە گوێم بکەن... ئەگەر هەڵەیشم کرد دەبێ و پێویستە ڕاستم بکەنەوە و ڕاستیم پێ نیشان بدەن... مەگەر کەسێکی دەوڵەمەند کرێکارێک بگرێ بۆ ئەوەی باخەوانی بۆ بکات و ئەمیش بڕواتە ناو باخەکەی و کارێکی کرێکارەکەی بە دڵ نەبێ، پێی ناڵێ ئەو کارەم بە دڵ نییە و دەبێ ئاوا و ئاوا بێ؟

ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دەوڵەمەندەیە... منیش ئەو کرێکار و باخەوانەم... ئەگەر کاری باشم کرد، دەبێ دڵیان پێی خۆشبێ... ئەگەر خوانەخواست کارێکی خراپیشم کرد، دەبێ دەستم بگرن و پێم بڵێن: ئەم کارەت خراپە و جێ خۆی نییە...

- ئای قوربان لەو سیاسەتە جوان و پوختە... ئای لەو ڕێزگرتنەی خەڵک چەندێ مەزنە...

+ کوڕم ئەم قسانە زانستی تایبەت بە خۆم نییە... ئەوە شەرعی خوایە... ئەو شەرعەی کە ڕێزی بەخشیوە بەو سەرکردانەی فرمان بە چاکە دەکەن... مافی ئەوەشی داوە بە گەل کە هەرکاتێ سەرکردە

کارێکی خراپی کرد لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن و لێی بپرسنەوە...

– دەی قوربان زۆرم پێخۆشە بزانم جەنابت چ شتێکی تری سیاسیت باس کرد و وتارەکەت چ مەبەستێکی تری سیاسی تیابوو؟

+ ئەگەر لە بیرت بێت پێشتر پێموتی: من لە وتارەکەمدا وتم: ئەو کەسەتان کە لاوازە لای من بەهێزە تا پشت بە خوا تۆڵە و مافی بۆ دەسێنمەوە... ئەوەشتان خۆی بە بەهێز دەزانێ لای من لاوازە تا ئەو کاتەی پشت بە خوا تۆڵە و مافی لێ دەسێنمەوە...

من بەم قسانە ئەوەم بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە کە کارەکانم لەسەر دادگەری و عەدالەت بەڕێوە دەبەم و پشت بە خوا هیچ کەسێک بە نادادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێ...

خەڵک هەموویان لە بەردەم شەرع و قانووندا یەکسانن... ئەوەی کە لاوازە و خاوەن مافە، حکومەت هەموو هێزێکی خۆی بۆ دەخاتە گەڕ تا مافەکەی بۆ دسێنێتەوە... ئەو کەسەیشی کە بەهێزە و ستەمی کردووە، لە بەردەم دەسەڵاتی حکومەتدا کەسێکی لاوازە و حکومەت هەوڵ دەدا تۆڵەی لێ بسێنێتەوە...

– قوربان بێجگە لەم دەستوورە جوانە، وتارەکەت چیتری لە خۆ گرتبوو؟

+ ئەگەر بە بیرت بێت من وتم: ڕاستگۆیی ئەمانەتە و درۆکردن خیانەتە...

بەم قسەیە من ئەوەم بە خەڵکی ڕاگەیاند کە حکومەتەکەم لەسەر بناغەی ڕاستگۆیی دادەمەزرێنم... دەبێ بە ڕاستی و ڕاستگۆیی مامەڵە لەگەڵ خەڵک و کاربەدەستدا بکرێ... من نابێ کارێک بکەم و پێچەوانەکەی بە خەڵک بڵێم... نامەوێ خەڵکیش لای خۆمدا سەر ڕاوەشێنێ و ڕەزامەندی دەرببڕێ و لە پاشملەشدا موعارەزە و ئۆپۆزسیۆن بێ...

من دەمەوێ متمانەمان بە یەکتر هەبێ... دەبێ حکومەت لەسەر بناغەی متمانە دابمەزرێ...

من لەجیاتی ترسان و بەدبینی و بەدگومانی ڕیز لەناو خەڵکدا بڵاو دەکەمەوە... هەرچی ڕاست نەبێ بە زمانمدا نایەت... بە کردەوەش کارێ ناکەم کە پێچەوانەی قسەی خۆم بێ... لە بەرامبەریشدا لە خەڵکم ناوێ لە ناخدا دوودڵ و بەگومان بن و لای خۆمدا بە جۆرێکی تر خۆیان دەربخەن... من دەمەوێ حکومەتەکەم تۆکمە و بەهێز بێ...

ئەو حکومەتەی کە لە پێش دوژمندا خۆی پێ ناگیرێ، ئەوە لە ڕاستیدا پێشتر لە ناوەوە ڕووخاوە و گەنیوە... دوژمن تەنیا فوویەکی کردووە و دەستێکی بە حاڵ لە قەباغی حکومەتەکە داوە، ئیتر حکومەتەکە خۆی داڕووخاوە و تەپیوە... قەڵای بەهێز لە ناوەوە نەبێ ناڕووخێ... تەور ئەگەر کلکی لە خودی دارەکە نەبێ داری پێ نابڕرێتەوە...

من حکومەتێکم دەویست کە لە ناوەوە پتەو و بەهێزبێ... وەکو پۆڵا بێ... خەڵکانێک پەروەردە بکا کە متمانەیان بە یەکتر بێت... کە هەمووان خواپەرست بن... نەک سەرۆکپەرست و نەک دووڕووش...

- ئای لەو سیاسەتە بەهێز و جوانە قوربان...

+ خوا سەرکەوتووت بکات کوڕم...

- دەی قوربان وتارەکەت چ خاڵێکی تری سیاسی تیا بوو؟ پێمخۆشە بۆم باس بکەی...

+ ئەگەر بە بیرت بێ پێموتی من لەو وتارەدا وتم: خەڵکینە... هەر گەل و کۆمەڵێک واز لە جیهاد و تێکۆشان بێنێ، خوای گەورە زەلیل و سەرشۆڕیان دەکات...

من بەو قسانە ئەوەم ڕاگەیاند کە سەربەرزی و عیززەت و

شكۆ، پێناسی ئەم ئوممەتەیە... ئێمە خۆمان بە دەستی خۆمان مافی خۆمان بە دەست دێنین و لە هیچ کەسێک ناپاڕێینەوە کە مافمان پێ بدات...

ئێمە گەلێکین ستەم لە کەس ناکەین... ستەمیش لە هیچ کەسێک و لەژێر هیچ ناونیشانێکدا قبووڵ ناکەین...

ئێمە بانگەشەی پێکەوەژیان و سۆز و بەزەیی دەکەین، بەڵام نابێ بەهێزەکان ستەم لە لاوازەکان بکەن و بیکەنە ژێردەستەی خۆیان و بە خراپی سوودیان لێ وەربگرن...

- ڕاست دەفەرمووی گەورەم... هیچیتر ماوە بۆم باس بکەی؟

+ بەڵێ... ئەگەر بە بیرت بێ، من لە وتارەکەمدا وتم: خراپە و بەدکرداری لەناو هەر گەل و هۆزێکدا بڵاو ببێتەوە، خوای گەورە هەموویان تووشی بەڵا و موسیبەت دەکا...

بەو قسانە من ئەوەم ڕاگەیاند کە لەپێناو ئاکاری جواندا دەجەنگین... بەگژ زینا و داوێنپیسی و سووخواردن و خراپەکاریدا دەچینەوە... ئێمە ئوممەتێکین پەیامێکمان بۆ هاتووە... ئەو پەیامە پاکەی کە کۆتا پەیامی خوای گەورەیە... کۆتا پێغەمبەری خوای گەورە بۆی هێناین... ئەو پەیامە ئەوەندە مەزنە کە دەبێ بە بەرنامەی ژیان... بۆ هەموو چین و توێژێک دەشێ... هەرچەندە لە سەردەمی ئێمە ئەو پەیامە هات و ئێمە فرمانمان پێ کرا کە بیگەیێنین، بەڵام ئەرکی سەرشانی هەموو تاکێکی مسوڵمانە کە بە پێی توانای خۆی دریغی لە گەیاندنی ئەو پەیامەدا نەکات... دەبێ هەموو تاکێکی مسوڵمان ئەوەندە چاک بکرێ، بتوانێ سووچێکی ئەم بەرنامەیە بگرێتە دەست... بتوانێ بۆنی جێگرەوەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لێبێ... کاتێ تاکەکان چاک بوون، ئیتر گەل چاک دەبێ، حکومەت چاک دەبێ... گەل و حکومەت هەر لەو تاکانە پێکهاتووە...

پێویستە لەسەر حکومەتیش هەموو ئەو لەمپەرانە لادا کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم چاکسازی کۆمەڵایەتی و تاکە کەسیدا... مرۆڤ چۆن دەتوانێ لەناو گەلێکی زیناکاری خراپەکاردا ببێ بە موجاهید و تێکۆشەر؟

تاکێ کە لەناو گەلێکی خراپدا پەروەردە کرابێ و بە چاوی خۆی دادگەری نەبینیبێ و بە گوێی خۆی نەیبیستبێ، چۆن دەتوانی ئاڵای دادگەری هەڵدا؟

کەسێ کە سۆزی نەدیبێ، سۆزی نەبیستبێ، هەموو کەسانی دەورەوبەر و تەنانەت ئەوانەیشی کە پەروەردەیان کردووە، کەسی دڵڕەق و خراپەکار بن، چۆن فێری سۆزداری و دڵنەرمی و خۆشڕەفتاری دەبێ...

- بەخوا ڕاستە قوربان... جەنابت چەندە زانا و لێهاتووی...

+ خوا پایەدارت بکا کوڕم... دەی پێمبڵێ دوای ئەوەی باسی ئەو وتارە کۆتایی هات، هیچ پرسیاری ترت ماوە بیکەی؟

- قوربان دەمەوێ باسی یەکەم بڕیاری سیاسی جەنابت بیبیستم... ئەوەی کە بڕیارت دا سوپای مسوڵمانان بە سەرکردایەتی ئوسامە بجووڵێت...

+ دوورگەی عەرەبی دراوسێی دوو دەوڵەتی زلهێز بوو... دەوڵەتی فارس و دەوڵەتی ڕۆم...

عەرەبەکانی وڵاتی عێراق شوێنکەوتەی دەوڵەتی فارس بوون...

عەرەبەکانی شام و باکووری دوورگەی عەرەبیش شوێنکەوتەی ڕۆم بوون...

پێغەمبەریش(ﷺ) تەنیا بۆ عەرەب ڕەوانە نەکرا... وەک چۆن پێغەمبەری عەرەب بوو، ئاوا پێغەمبەری فارس و ڕۆم و هەموو گەلانی تریش بوو... بۆ ئەوە هات هەموو خەڵکی ببنە خواپەرست

و یەکتاپەرست و لە بتپەرستی و شیرک دوور بکەونەوە...

بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نامەی نارد بۆ کسیرای سەرۆکی دەوڵەتی فارس و هیرقلی سەرۆکی دەوڵەتی ڕۆم، بەڵام ئەو دوانە دونیایان هەڵبژارد و چاویان لە ئاست پەسڵان داخست و خۆیان بە گەورە زانی و نەهاتنە ڕیزی مسوڵمانانەوە...

عەرەبی دوورگەی عەربیش ئەو دەمە بە چاوێکی ڕێزەوە تەماشای فارس و ڕۆمیان دەکرد، چونکە ئەوان سوپا و چەک و تفاقی جەنگیان زۆر تۆکمە و بەهێز بوو... لە ڕووی ئابووریشەوە هەر مەپرسە چەندێ بەهێز بوون... لە ڕووی ئاوەدانی و شارستانیەتیشەوە هەر بەهێز و گەورە بوون... بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەیەویست کەمێک لە سام و هەیبەتی ئەو دوو وڵاتە لە بەرچاوی گەلی عەرەب بشکێنێ... ئەوەش وەک پێشەکییەک بۆ جیهاد و تێکۆشانی ئایندە...

ساڵی هەشتەمی کۆچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپایەکی نارد بۆ باکووری دوورگەی عەرەبی... لەوێ لەگەڵ سوپای ڕۆم و عەرەبە مەسیحییەکانی ئەوێ ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە و تووشی غەزای موئتە بوون... لە جەنگی موئتەدا سێ سەرکردەی سوپای ئیسلام یەک لە دوای یەک شەهید کران... سەرەتا زەیدی کوڕی حاریسە... دوایی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب... دوایی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە... دوای شەهیدبوونی ئەو سێ سەرکردەیە، خالیدی کوڕی وەلید ئاڵای سوپاکەی گرتە دەست و توانی بە پێی نەخشە و پلانێکی زۆر تۆکمە سوپاکە بگێڕێتەوە بۆ مەدینە...

خەڵکی ئەو گەڕانەوەیان پێ سەربەرزی نەبوو... تەنانەت تانەیان لە سەربازەکان دەدا و دەیانگوت: هەڵاتوان...

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر ئەوانە شاڵاوبەرانن... هێرشبەرانن...

ئـەوە یەکـەم ڕووبەڕووبوونـەوەی ڕاسـتەوخۆی نێـوان سـوپای مسـوڵمانان و سـوپای ڕۆم بـوو...

سـاڵی نۆیەمـی کۆچـی پێغەمبـەر(ﷺ) خۆی سـەرۆکایەتی سـوپای کـرد و بـەرەو تەبـووک ڕۆیشـتین، بـەڵام نـە لەگـەڵ ڕۆمـا ڕووبـەڕوو بووینـەوە، نـە لەگـەڵ ئـەو تیرە و هۆزانـەدا کە لەژێر دەسـەڵاتی ڕۆما بـوون...

سـەرۆک هەمـوو ئـەو شـوێنانەی کە ئێمـە بۆی ڕۆیشـتین ملکەچـی سـوپای ئیسـلام بـوون و بـەوە ڕازی بـوون کـە سـەرانە بـدەن... ئێمـە بیسـت شـەوێک لـە تەبـووک ماینـەوە و دوایـی بـەرەو مەدینـە هاتینـەوە... ئـەوە دووەم هەنـگاو بـوو بـۆ شـکاندنی سـام و هەیبـەتـی ڕۆم لـە بەرچـاوی گەلـی عـەرەب...

سـەبارەت بـە سـوپاکەی ئوسـامەش ئـەوە پێموتی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئوسـامەی کـرد بـە سـەرۆکی سـوپا بـۆ ئـەوەی ڕووبـەڕووی ڕۆم ببنـەوە، بـەڵام پێـش ئـەوەی سـوپاکە شـاری مەدینـە بەجـێ بهێڵـێ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وەفاتـی کـرد...

ئـەو دەمـە سـوپاکە لـە دەرەوەی شـاری مەدینە ئۆردویان خسـتبوو... ئەوانـە هـەر لـەوێ بـوون و هەموویـان پەیمانیان بـە مـن دا و مـن بـووم بـە خەلیفـەی مسـوڵمانان... دوای سـێ ڕۆژ فرمانـم دەرکـرد بـۆ ئوسـامە وەک سوپاسـالاری ئـەو سـوپایە بـەرەو ئـەو شـوێنە جووڵـە بـکات کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فرمانـی پـێ کردبـوو...

- قوربان ئەو شوێنە کوێبوو؟

+ هەمـان ئـەو شـوێنە بـوو کـە زەیدی باوکـی ئوسـامە تێیدا شـەهید کرابـوو... پێغەمبـەر(ﷺ) فرمانـی بـە ئوسـامە کردبـوو بچـێ بـۆ ئـەوێ و فەرمـووی: هـەر لـەوێ ئۆردو بخـەن و تـۆش سـەرکردەی سـوپا بـە...

کاتـێ فرمانـم بـە ئوسـامە کـرد بـڕوا، عومـەری کـوڕی خەتتابیـش

وەک سەربازێکی سادە لەگەڵ ئوسامەدا بوو... عومەر بە ئوسامەی وتبوو: برۆ بە خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڵێ با من خەڵکەکە بگەڕێنمە بۆ مەدینە... من هەموو جۆرە خەڵکێک دەناسم... دەترسم لە شاری مەدینەدا کافرەکان هەڵگەڕێنەوە و بەرامبەر ئەبوبەکر بوەستنەوە...

برا ئەنصارییەکانیش بە عومەریان وتبوو: بە ئەبوبەکر بڵێ: ئەگەر هەر سوورە لەسەر ئەوەی جووڵە بەم سوپایە بکات ئەوە باشە، بەڵام با کەسێکی بەتەمەن بکات بە سەرکردەی سوپا... ئوسامە زۆر گەنجە و هێشتا بۆ ئەو کارە دەست نادا...

- ئەی دوایی چی قەوما؟

+ عومەر هات بۆ لای من... بە منی وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! خۆت دەزانی بەشێکی زۆری عەرەب دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) کافر بوونەوە... تۆ هەر دەتەوێ سوپاکەی ئوسامە جووڵە پێ بکەی؟ سوپاکەی ئوسامە پڕە لە پیاوی پاڵەوان و ئازا... ئەگەر ئەم سوپایە جووڵە پێ نەکەیت و لای خۆت گیری بدەیت و ئەو هزانەی عەرەبی پێ بترسێنی لەوە باشترە جووڵەی پێ بکەی...

منیش وتم: سوێند بە خوا! ئەگەر دڵنیا بم درندە ونجڕ ونجڕم دەکەن، دەبێ جووڵە بەو سوپایە بکەم... ئالایەک داناگرمەوە کە بە فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵکراوە...

عومەر وتی: دەی برا ئەنصارییەکان بە منیان وتووە پێت بڵێم ئوسامە بگۆڕی و کەسێکی بەتەمەن بکەی بە سوپاسالار...

منیش پەلاماری عومەرم دا... ڕیشیم گرت و پێم وت: ئەی دایکت ڕۆ ڕۆت بۆ بکا عومەر... پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ئوسامەی دیاری کردووە و دەتەوێ من لایبەم؟

عومـەر گەڕایـەوە بـۆ لای ئوسـامە و سـوپاکە هـەر لـە دەرەوەی شـار ئۆردویـان خسـتبوو... بـە عومەریـان وت: چیت کـرد؟

عومـەر وتـی: بـڕۆن! دایکتـان ڕۆڵەڕۆتـان بـۆ بـکات... لەبـەر ئێوە لای خەلیفـە چیـم بـە خـۆم کـرد...

- ئەی قوربان دواتر چی قەوما؟

+ فرمانـم کـرد جارچییـەک بـە نـاو شـاری مەدینـەدا بگـڕێ و جـاڕ بدات و بڵێ: ئاگاداری! ئاگاداری... سـوپاکەی ئوسـامە بەڕێ دەکەوێ... هـەر سـەربازێکی ئوسـامە لەنـاو شـاردا ماوەتـەوە پەیوەنـدی بـە سـوپاوە بـکات و بڕواتـەوە بـۆ سـەربازگە...

دوایـی منیـش خەڵکـم کـۆ کـردەوە و وتارێکـم بـۆ دان... سـوپاس و ستایشـی خـوای گـەورەم کـرد و وتـم: خەڵکینـە! ئـەم کارە بـە مـن سـپێراوە و خۆیشـم حـەزم لێـی نییـە... بـە خـوا پێمخۆشـبوو یەکێـک لـە ئێـوە ببووایـە بـە خەلیفـە... منیـش کەسـێکم وەک ئێـوە... نازانـم لەوانەیـە ئیـوە داوای شـتی وا لـە مـن بکـەن کـە کاتـی خـۆی داواتـان لـە پێغەمبـەر(ﷺ) کردبوو، ئەو توانیبووی بیکا... خـوای گـەورە لەنـاو مرۆڤەکانـدا پێغەمبـەری خـوای هەڵبـژارد... لـە هەمـوو ئافـات و بـەڵا و موسـیبەتێ پاراسـتی... مـن تەنیـا شـوێنکەوتەی پێغەمبـەرم و ناتوانـم لـە خۆمـەوە شـت دابێنـم... مـن چاکتریـن کەسـی ئێـوە نیـم... ئێوەش ئاگاتـان لـە مـن بێ... ئەگـەر کاری ڕاسـت و دروسـتم کـرد، ئـەوا پەیمانـم پـێ بـدەن... ئەگـەر کارێکـی خراپیشـم کـرد ڕاسـتم بکەنـەوە... پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کۆچـی دوایـی کـرد و مافـی یـەک کەسـی بـە سـەرەوە نەبوو... هـەر لـە شـەپازلەیەکەوە بیگـرە تـا کۆتایـی... کـورە خەڵکینـە ئاگادار بـن منیـش وەک هەمـوو کەسـێ شـەیتانێکم لەگەڵدایـە دەیـەوێ تووشـم بـکات... ئەگـەر زانیتـان ئـەو شـەیتانە لێـم نزیـک بووەتـەوە خۆتـان لـە مـن بپارێـزن. و لێـم دوور بکەونـەوە...

- ئەی قوربان دوایی چیت کرد؟

+ دوایی ڕۆیشتم بۆ لای سوپاکەی ئوسامە... بەڕێم کردن... ئوسامە بەسەر ئەسپەکەیەوە بوو، منیش لە خوارەوە پێبەپێی ئوسامە ڕێم دەکرد...

ئوسامە وتی: قوربان یان تۆ سەرکەوە، یان من دادەبەزم...

منیش وتم: نا سوێند بە خوا نە سەردەکەوم، نە دادەبەزی... چی دەبێ سەعاتێک قاچەکانم لە پێناوی خوای گەورەدا تۆزاوی بکەم... بۆ هەر هەنگاوێ کە موجاهید و تێکۆشەر هەڵی دەنێ خوای گەورە حەوتسەد چاکەی بۆ دەنووسێ... حەوسەد پلە بەرزی دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر پێت باشبوو ئەوا عومەرم بۆ بەجێ بهێڵە...

ئیتر ئوسامە مۆڵەتی عومەری دا لە مەدینە لەگەڵ مندا بمێنێتەوە...

- ئەی قوربان هیچ ئامۆژگاری و وەسیەتێکت بۆ سوپاکە کرد؟

+ بێگومان...

- ئامۆژگاری چیت کردن قوربان؟

+ پێموتن: خەڵکینە... ڕاوەستن با دە ئامۆژگاریتان بکەم... ئەو دە ئامۆژگارییەم لێ وەربگرن...

١- خیانەت مەکەن...

٢- دزی لە دەستکەوت و داهاتی جەنگ مەکەن...

٣- لووت و گوێی هیچ کوژراوێ مەکەن...

٤- منالی بچووک مەکوژن...

٥- پیر و پەککەوتە مەکوژن...

٦- ژن مەکوژن...

٧و ٨- دارخورما مەبڕنەوە و مەیسووتێنن...

٩- داری بەردار مەبڕنەوە...

١٠- مانگا و ئاژەڵ و وڵاخی کەس سەرمەبڕن مەگەر بەشی خواردن و بەپێی پێویست نەبێ...

ئێوە ئەدەن بە لای کەسانێکدا لە دێر و کەنیسە و کەنشتەدا بۆ خۆیان خەریکی خواپەرستی خۆیانن، لێیانگەڕێن و دەستیان بۆ مەبەن...

ئەدەن بە لای کۆمەڵە خەڵکێکدا خواردنی ڕەنگاوڕەنگتان بۆ دێنن، ئەگەر لەو خواردنانەتان خوارد، سەرەتا ناوی خوای لێ بێنن پاشان لێی بخۆن...

ئەگەن بە کەسانێ ناوەڕاستی سەریان کورت کردووەتەوە و ئەملاولای سەریان هێشتووەتەوە، دەڵێی مێزەر و جامانەیە بە سەریانەوە... ئەوە ناوی خوا بێنن و بە شمشێر تێیان بکەون...

- باشە قوربان ئوسامە چەند ڕۆژی پێچوو تا سوپاکەی جووڵاند و لە جەنگ هاتەوە؟ بەرهەمی ئەو جەنگەش چیبوو کە ئوسامە سەرکردایەتی کرد؟

ئوسامە چل شەوی پێچوو... دوای چل شەو هاتەوە بۆ مەدینە... سوپاکە ڕووبەڕووی جەنگ ببوونەوە و بە یارمەتی خوای گەورە سەرکەوتنێکی گەورەیان تۆمار کرد و بە دەستکەوتێکی باشیشەوە هاتنەوە بۆ مەدینە...

- ئەی ئەو سوپایەی ئوسامە چ کاریگەرییەکی لەسەر عەرەب هەبوو؟

ئوسامە بیدایە بە لای هەر هۆز و تیرەیەکدا کە دوودڵ ببوون و دەیانەویست لە ئیسلام پاشگەز ببنەوە، ئەو تیرە و هۆزانە دەیانگوت: بە خوا ئەگەر ئەمانە خاوەنی هێزێکی تۆکمە و گەورە نەبن سوپایەکی ئاوا نانێرن بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕۆما بەجەنگ بێن... بۆیە هەموو ئەو تیرە و هۆزانە شوین ئوسامە کەوتن و بەرەو

لای ڕۆم وەڕێ کەوتن... کاتێ سوپاکەی ئوسامە گەیشتە سوپای ڕۆم و جەنگ دەستی پێ کرد، سوپای ئوسامە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا... ئیتر ئەو گەل و هۆزانەش بە تەواوی دڵیان دامەزرایەوە و بە باشی مسوڵمان بوون...

- قوربان مۆڵەتم پێ دەدەی لە بارەی هەندێ شت کە بۆ منت باس کرد، پرسیارت لێ بکەم؟

+ فەرموو کوڕم! ئازاد بە... چی دەپرسی بپرسە...

- بە هۆی فەرموودەکەی حەزرەتی عومەرەوە لە بارەی مانەوەی سوپاکەی ئوسامە لە مەدینەدا، تێبینییەکم بۆ دروست بووە، بەشێکی زۆری عەرەب لە ئایین پاشگەز بوونەوە... بێگومان ئەوانە نیازی ناوجەرگەی ئیسلامیشیان هەبوو کە شاری مەدینە بوو... ڕای حەزرەتی عومەریش وەکو ڕای خودی ئوسامە وابوو کە سوپاسالاری سوپاکە بوو... باشە هێشتنەوەی ئەو سوپایە لە مەدینەدا باشتر نەبوو لەوەی بینێری بۆ سەرکوتکردنی دووژمنێکی دوور؟

+ بێگومان ڕا و بۆچوونی عومەر دروست بوو... مرۆڤی ژێر گومان لە ڕا و بۆچوونی پیاوی وەک عومەر ناکا... خۆ ئەگەر ڕا و بۆچوونەکەیشی هەڵە بووایە ئێمە هەر لێی دڕدۆنگ نەدەبووین و دەمانزانی عومەر چەندێ خوا و پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆش دەوێ... ئەو ئەو کاتە پێی وابوو مانەوەی سوپاکە لە مەدینە باشتر بێ، چونکە بارودۆخی سیاسی ئەو دەمە وای دەخواست، بەڵام کوڕم وادیارە تۆش درکت بە خاڵێکی جەوهەری و هەرە گرنگ نەکردووە...

- چ خاڵێک قوربان؟

+ ئەگەر من خۆم بڕیاری ئەوەم دابا کە ئەو سوپایە دەربچێ، بێگومان لە بارودۆخێکی ئاوادا ڕایەکەی عومەرم پەسەند دەکرد...

ئەگەر عومەریش ئەو ڕایەی نەبووایە خۆم هەر دوودڵ دەبووم، ئایا سوپاکە بنێرم یا نەینێرم، بەڵام خۆ ئەو فرمانە فرمانی من نەبوو... ئەو سوپایە بە فرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێک هات... ئاڵای ئەو سوپایە پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی پیرۆزی خۆی هەڵی کرد... ئیتر چۆن من ئاڵاکەم دابەزاندایەتەوە و سوپاکەم گل بدایەتەوە و فرمانی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بشکاندایە؟

- ئەی باشە قوربان جەنابت خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبووی؟ بۆت نەبوو خۆت ئیجتیهاد بکەیت و لەو کاتە ناسکەدا بڕیاری تایبەتی خۆت دەربکەی؟

+ بەڵێ من خەلیفە بووم، بەڵام من شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوام(ﷺ) نەک داهێنەر... کەس ناتوانێ ئیجتیهاد لە شتێکدا بکا کە ڕای ئاشکرای پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەسەرە... ئەگەر لە ڕۆژی پەسلاندا بڵێن: ئەمە ئەو ئەبوبەکرەیە کە فرمانی پێغەمبەری(ﷺ) جێبەجێ کرد و سوپاکەی نارد و کوژرا و شکستی خوارد، لەوە باشترە بڵێن: ئەمە ئەو ئەبوبەکرەیە کە فرمانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) شکاند و بە گوێی نەکرد و سوپاکەی گل دایەوە و ئەو ئاڵایەی داگرت کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بە دەستی خۆی هەڵیکردبوو...

- بە خوا قوربان کەس وەک تۆ نابێ... نا بە خوا کەس وەک تۆ نابێ...

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کوڕم...

- باشە قوربان پرسیارێکی تر...

+ فەرموو...

- مەگەر ئەنصارییەکانیش ڕایان وا نەبوو جەنابت ئوسامە بگۆڕی و کەسێکی بەتەمەن بکەی بە سوپاسالاری سوپاکە؟

+ ئـەوە چ ڕایەکـە مـن کەسـێک لابـەم کـە خـودی پێغەمبـەر(ﷺ) دیـاری کـردووە و کەسـێکی تـری لـە جێگـە دانێـم؟ ئەگـەر مـن وام کردبـا - پەنـا بـە خـوا- وای لـێ دەهـات کـە مـن گومانـم لـە ژێـری و زانسـتی پێغەمبـەر(ﷺ) هەبـێ و ئـەو شـتێکی بـە بـاش زانیبـێ، بـەڵام مـن بـە باشـی نەزانـم... پەنـا بـە خـوا لـە کارێکـی ئـاوا...

جگـە لـەوەش، ئـەوە بیاننووسـە کـە گوایـە ئوسـامە زۆر گەنجـە و بەکەڵـک نایـە، بیانوویەکـی نـوێ و تـازە نەبـوو... هـەر لـە سـەردەمی خـودی پێغەمبەریشـدا(ﷺ) ئـەو بیانـووە هەبـوو، خـودی پێغەمبـەر(ﷺ) وەڵامـی دایـەوە و فەرمـووی: ئەگـەر تانـە لـە سـەرکردایەتی ئوسـامە دەدەن، ئـەوە کاتـی خۆیشـی تانەیـان لـە سـەرکردایەتی باوکـی ئوسـامە دا... سـوێند بـە خـوا ئوسـامە شـایانی ئەوەیـە ببـی بـە سـەرکردە... بـە خـوا ئوسـامە بـە لای منـەوە یەکێکـە لـە خۆشەویسـتترین کەسـەکان...

خـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) تەنیا لەبـەر خۆشەویسـتی ئوسـامەی نەکـرد بـە سوپاسـالار، بەڵکـوو جگـە لـەوەی ئوسـامەی خـۆش دەویسـت، ئوسـامە خـۆی کەسـێکی لێهاتـوو بـوو... جـا توخـوا ئەگـەر دوای ئـەوەی کـە پێغەمبـەر(ﷺ) خـۆی ئـاوا وەڵامـی خەڵکـی داوەتـەوە مـن ئوسـامەم لابردبایـە و کەسـێکی تـرم بکردایـە بـە سوپاسـالار، ئـەوە تۆمەتبارکردنی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نەبـوو بـەوەی کـە کەسـی شـیاوی لـە جێگـەی شـیاودا دانەنـاوە؟ هـەر بـە خـۆت دەڵێـم: وایـە یـان نـە؟

- بەڵێ وایە...

+ خـۆ ئەگـەر لەبـەر خۆشەویسـتیش ئوسـامەی دانابـا ئیتـر بـە چ ڕوویەکـەوە مـن کەسـێکی خۆشەویسـتی پێغەمبـەرم(ﷺ) لادایـە و کەسـێکی تـرم لـە جێگەیـدا دانایـە؟

جگـە لـەوەش ڕووداوەکانـی دوایـی دەریانخسـت کـە بـە ڕاسـتی ئوسـامە شـیاوی ئەوەبـوو بکـرێ بـە سوپاسـالار... ئـەو هەرچەنـدە

**مناڵیش بوو، بەڵام بەڕاستی شیاو بوو... ئەمەش ئەوە دەردەخا کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندێ زانا و لێزان بووە... چەندێ بە باشی خەڵکی ناسیوە...**

ڕۆڵە گرنگ تەمەن نییە... گرنگ لێهاتوویی و زانایییە... گەنجێکی شارەزا لە کاروباری جەنگ بکرێ بە سەرکردە باشە، یان بەتەمەنێکی نەشارەزا؟

- بێگومان گەنجێکی شارەزا...

+ دەی پێغەمبەریش(ﷺ) وایکرد... منیش جگە لەوەی شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتم، هیچی ترم نەکرد... من نەمدەتوانی کەسێک لابەم کە پێغەمبەر(ﷺ) دیاریی کردووە...

- ئەی قوربان من پێمنەوتی: هیچ کەسێ وەک تۆ شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبووە و نابێ؟

+ کوڕم ئەوە گومانباشی خۆتە...

- نا بە خوا ئەوە ڕاستی و حەقیقەتە... خۆ ئەگەر گومانباشیش بێ، هیچ کەسێ هێندەی تۆ شیاوی گومانباشی نییە...

+ دەی خوا بتپارێزێ... ئێستا پێم بڵێ: پرسیارت ماوە یان نە؟

- بەڵێ قوربان زۆرم ماوە...

+ دەی پرسیاری خۆت بکە کوڕم...

- دەمەوێ لێت بپرسم مەبەستت چیبوو لەوەی کە فەرمووت:

کورە خەڵکینە ئاگادار بن منیش وەک هەموو کەسێ شەیتانێکم لەگەڵدایە دەیەوێ تووشم بکات... ئەگەر زانیتان ئەو شەیتانە لێم نزیک بووەتەوە خۆتان لە من بپارێزن. و لێم دوور بکەونەوە؟

+ ویستم بە خەڵکی بڵێم: من هەرچییەک بم وەک ئێوە مرۆڤم... هەموو مرۆڤێکیش سروشتێکی تایبەت بە خۆی هەیە... یەکێک لە سروشتەکانی من ئەوەیە کە لە کاتی هەڵوێستێکی قورس و پڕ لە

تەنگانە تووڕە دەبم... لەوانەیە لەو کاتەدا خۆم پێ نەگیرێ... بۆیە داوام لێ کردن ئەگەر شتێکی وا ڕوویدا کەس سەختگیر نەبێت و لەسەر بابەتە نەڕوا، ئەوەش لە ترسی ئەوەی نەوەکو قسەیەکم لە دەم دەربچێ کە خۆم پێم خۆش نەبێ قسەی وام لە دەم دەربچێ، چونکە من نامەوێ تاکە مسوڵمانێک مافی بکەوێتە سەرم، جا هەرچەند ئەو مافە قسەیەکی بچووکیش بێ لە کاتی تووڕەییدا کردبێتم...

- قوربان دەترسای قسەیەکی وا بکەی دڵی کەسێک بشکێنێ و بریندارى بکەی؟

+ ئەی چۆن نەترسم؟ کوڕم هەموو کەسێ خاوەنی کەسایەتی تایبەت بە خۆیەتی... هەموو کەسێ خاوەنی ڕێزە... بریندارکردنی مرۆڤ و دڵشکاندنی با بە قسەیەکی بچووکیش بێ، لای خوای گەورە کەم نییە و گەورەیە... وەک چۆن دڵدانەوە خواپەرستییە، ئاواش هەوڵدان بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە دڵی کەس نەشکێنێ، ئەوەش هەر خواپەرستییە...

- بە خوا قوربان کارێکت کردووە بواری هیچت بۆ کەس نەهێڵاوەتەوە... قوربان پرسیاری تر بکەم؟

+ فەرموو کوڕم فورموو...

- سەیرم لە ئاکار و ڕەوشتی بەرزی ئوسامە دێ... ئەو کاتی لەسەر ئەسپەکەی بوو دەیەویست بێتە خوارەوە و جەنابت سەرکەوێ... بۆچی جەنابت بە گوێی ئوسامەت نەکرد و سواری ئەسپەکە نەبووی؟

+ بە خوا کوڕم! ئەوسامە گەنجێکی زۆر بە شەرم و حەیا بوو... ئەو پێی شەرم بوو سوار بێ و منیش بە پیادە لە خوارەوە ڕێ بکەم... ویستی دابەزێ، بەڵام من ڕازی نەبووم، ئەوەش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: ئەو سوپاسالاری سوپای ئیسلام بوو... ویستم بەو کارە لە بەرچاوی خەڵک بە گەورەی پیشان بدەم... بە تایبەت دوای ئەوەی زۆر داوام لێ کرا بیگۆڕم و لە سوپاسالاری لایبەم... من بەو کارەم بە خەڵکم وت: منێکی خەلیفە بە پیادە لەگەڵ ئوسامەی سواردا ڕێ بکەم، ئەوە ئیتر ئێوە بۆتان نییە بە هیچ شێوەیەک لە فرمانی دەربچن...

دووەم: ئەو سوپایە بۆ جیهاد و تێکۆشان دەچوون... منیش ویستم هیچ نەبێ کەمێک ڕێ بکەم و لاقەکانم تەپوتۆزاوی ببن، بەڵکوو خوای گەورە ئەو تەپوتۆزەی وەک تەپوتۆزی جیهاد بۆ من هەژمار بکات...

- ئەی قوربان بۆچی جەنابت داوات لە ئوسامە کرد حەزرەتی عومەرت بۆ بەجێ بهێڵێ... خۆ تۆ خەلیفە بووی... دەبوو تۆ فرمان بەسەر ئوسامەدا بکەیت و بڵێ: عومەرم بۆ بەجێ بهێڵە... نەک داوای لێ بکەی؟

+ کوڕم وەک بۆم گێڕایەوە عومەری کوڕی خەتتاب لە سوپاکەی ئوسامەدا سەربازێک زیاتر نەبوو... وەک بۆم گێڕایەوە سوپاکەی ئوسامە لە دەرەوەی شاری مەدینە ئۆردویان خستبوو... چاوەڕێی ئەوەبوون کە بجووڵێن، کەچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد... دوایی من بووم بە خەلیفە... بە فرمانی من سوپاکە جووڵا... عومەر سەربازی ئوسامە بوو... منیش وەک ڕێز و ئەدەبێک داوام لە ئوسامە کرد عومەرم بۆ بەجێ بهێڵێ... هەرچەند لە ڕووی سیاسییەوە من خەلیفە بووم و سەرکردەی ئوسامە و سوپاکەی و هەموو مسوڵمانانی تر بووم، بەڵام پێمخۆش نەبوو بەبێ پرسی ئوسامە سەربازێکی زیرەک و لێهاتووی وەک عومەر گل بدەمەوە... کوڕم مرۆڤ دەبێ لە هەموو کات و شوێنێکدا بە ڕەوشت و

ئەدەبەوە بجوولێتەوە... هەرچەند خەڵکیش لەژێر دەسەلاتی تۆدابن، بەلام دیسان ئەدەب پێویستە...

- ئەی قوربان منیش پێم نەگوتی: تۆ کارێکت کردووە کەسانی دوای خۆت سەخڵەت کردووە و کەس وەک تۆی پێ ناکرێ؟

+ خوا بتپارێزێ کورم... دەی بڵێ بزانم پرسیارت ماوە یان نە؟

- وەڵڵا قوربان ماومە...

+ دەی فەرموو بپرسە...

- قوربان دەمەوێ لە بارەی ئامۆژگارییەکانی جەنابتەوە بۆ سوپاکە پرسیارت لێ بکەم... بۆچی ئەو ئامۆژگاریانەت کرد؟

+ کورم ئێمە بە ناوی خواوە دەجەنگین، نەک بە ناوی هەوا و ئارەزووی خۆمانەوە... ئێمە جەنگ و جیهادمان پێ خواپەرستییە وەک نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات... جیهاد و تێکۆشان هیچ لەوانە کەمتر نییە... بۆیە دەبێ لەو سنوورەی کە خوای گەورە بۆی داناوین تێنەپەڕین و لانەدەین... من ئەو ئامۆژگاریانەم لە خۆوە نەکرد... هەمان ئەو ئامۆژگاریانە بوو کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاری سوپاکانی پێ دەکرد...

ئێمە بە خیانەت ڕازی نابین، چونکە ئایینی ئیسلام بناغەدارێژی ئاکار و ڕەفتاری جوانە...

دزی لە داهات و دەسکەوتی جەنگ ناکەین، چونکە دزی کاری چەتە و ڕێگرانە، نەک کاری تێکۆشەران...

لووت و گوێی هیچ کوژراوێک ناکەین، چونکە ئێمە گەلێکی هەرچیوپەرچی نین...

ئەگەر دوژمنیش لووت و گوێی سەربازی کوژراوی ئێمە بکات، ئێمە لووت و گوێی کوژراوی ئەوان ناکەین... خۆ نابێ وەڵامی بەدرەفتاری بە بەدرەفتاری بدرێتەوە...

منداڵ و پیر و پیرەک و ژن و پەککەوتە ناکوژین، چونکە ئێمە لەگەڵ کەسێکدا دەجەنگین، کە لەگەڵماندا دەجەنگێ...

ئێمە داری بەردار نابڕین، چونکە ئێمە هەتیومچە نین...

ئێمە بە گوێرەی پێویست نەبێ هیچ جۆرە ئاژەڵێک سەرنابڕین، چونکە ئاژەڵیش گیانی تیایە و خوای گەورە بۆ ئەوەی دروست نەکردووە بە خۆرایی و بەبێ ئەوەی پیویست بێ سەر ببڕدرێن...

ئێمە دەستدرێژی ناکەینە سەر ئەو کەسانەی لە دیر و کەنیشتە و کڵیسەی خۆیاندا بە بێدەنگی دانیشتوون و خواپەرستی خۆیان دەکەن... هەرچەندە ئەوانە مسوڵمانیش نەبن و ئایینەکەیان دژی ئایینی ئێمە بێ، بەڵام ئێمە خراپەیان لەگەڵدا ناکەین، بەڵکوو بە چاکە لەگەڵیاندا دەجووڵێینەوە... داوتیان دەکەین بۆ سەر ئایینی ئیسلام... ئەگەر مسوڵمان بوون ئەوا هەردوولا پاداشتی خۆمان وەردەگرین... ئەگریش مسوڵمان نەبوون بێگومان ئێمە پاداشتی خۆمان هەر دەست دەکەوێ...

- ئای لەو بیروباوەڕە چەند جوانە قوربان...

+ ڕاستە بە خوا بیروباوەڕێکی زۆر جوانە...

❀ ❀ ❀

- قوربان دەمەوێ باسی پاشگەزبوونەوەی عەرەبم بۆ بکەی... چۆن لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) پاشگەز بوونەوە؟

+ دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) جگە لە خەڵکی شاری مەککە و مەدینە و بەحرەین، ئیتر هەموو عەرەب پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام...

- ئای خوایە گیان... وازیان لە ئیسلام هێنا و گەڕانەوە سەر بتپەرستییەکەی جاران؟

+ نا وانەبوو کوڕم...

- ئەی چۆن بوو قوربان بۆم باس بکە؟

+ هەموویـان بـە یـەک شـێواز پاشـگەز نەبووەنـەوە، بەڵکوو دوو جۆر بـوو:

یەکەم: بڕوایان بە نوێژ و ڕۆژوو ما، بەڵام وتیان: چیتر زەکات نادەین...

وتیان: کاتی خۆی پێغەمبەر(ﷺ) زیندوو بوو ئێمە زەکاتی خۆمان دەدایە دەستی ئەو، ئەویش دەیدا بە هەژاران... ئێستا ئەو وەفاتی کردووە و ئێمەش زەکاتی خۆمان نادەینە دەست هیچ کەسێکی تر...

دووەم: بە تەواوی لە ئایینی ئیسلام پاشگەز بوونەوە و بڕوایان بە دوو کەسی درۆزن هێنا کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد...

ئەو دوو کەسەش بریتی بوون لە:

یەکەم: موسەیلەمەی درۆزن...

دووەم: طولەیحەی ئەسەدی...

بە تایبەت موسەیلەمە... ئەو شوێنکەوتەی زۆر بوو...

- یانی قوربان خەڵکەکە ڕوویان نەکردەوە بتپەرستی؟

+ نە کوڕم! لەنێو دوورگەی عەرەبیدا تاکە کەسێکیش ڕووی نەکردەوە بتپەرستی...

- ئەی ئەسوەدی عەنسی کێبوو قوربان؟ مەگەر ئەویش پاشگەز نەبوویەوە؟

+ با... پاشگەز بوویەوە، بەڵام پاشگەزبوونەوەی ئەو جیاواز بوو لە پاشگەزبوونەوەی طولەیحە و موسەیلەمە...

- چۆن بوو قوربان پێمخۆشە بۆم باس بکەی...

+ هەرچی طولەیحە و موسەیلەمە بوو ئەوە لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان دەکرد، بەڵام

**ئەسوەدی عەنسی کەسێکی زۆردار و ستەمکار بوو... هات و مسوڵمان بوو، بەڵام زۆری نەبرد هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) پاشگەز بوویەوە... بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد... دەسەڵاتێکیشی بۆ خۆی پێکەوە نا... هەندێ لە خاکی دوورگەی عەرەبی داگیر کرد... پێغەمبەر(ﷺ) نامەی بۆ مسوڵمانانی یەمەن نارد تا ڕووبەڕووی ببنەوە و لەناوی ببەن... مانگێک پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵیدا جەنگان و لەناویان برد...**

- باشە قوربان تێگەیشتم، بەڵام پێم بڵێ چیت کرد بە پاشگەزبووەکان؟

+ ئەوانەی کە وتیان: زەکات نادەین... ئەوە دەستەیەکیان وەک نوێنەر نارد بۆ مەدینە بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ مندا بکەن... وتیان: بڕوامان بە خوا هەیە... شایەتی دەدەین کە محەمەد(ﷺ) پێغەمبەری خوایە، بەڵام زەکاتی خۆمان نادەین بە ئێوە...

منیش وتم: سوێند بە خوا! ئەگەر کاتی خۆی ڕەشۆیەکتان بە ناوی زەکاتەوە دابێ بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئێستا نەیدەن، لەگەڵتان دەجەنگم...

دوایی وتم: جگە لەمە هیچ قسەیەکی ترم نییە...

ئەوانیش گەرانەوە و بە گەل و هۆزی خۆیان وتبوو: ژمارەی مسوڵمانان زۆر کەم بووەوە... ئاخر ئەو دەمە سوپاکەی ئوسامەش جووڵابوو لە مەدینە دەرچووبوون...

- ئەی ڕای هاوەڵان چیبوو؟ بڕیارەکەی جەنابتیان چۆن هەڵسەنگاند؟

+ زۆربەی زۆریان ڕایان لەگەڵ ڕای مندا نەبوو... تەنانەت عومەری کوڕی خەتتاب بە منی وت: چۆن لەگەڵیان دەجەنگی؟ ئەی مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرمووە: فرمانم پێ کراوە کە

لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تا شایەتی دەدەن کە جگە لە زاتی اللە هیچ خودایەکی تر نییە... هەرکەسێ وتی: لاالە الااللە، ئیتر خوێن و ماڵی پارێزراوە مەگەر لەسەر شتێ نەبێ کە مافی ئەوەی بێ لەگەڵیاندا بجەنگم، ئیتر لەوەولایش خوا خۆی زانایەجو حەق و حیسابیان لای ئەوە؟

منیش وتم: بە خوا لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەجەنگم کە جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژ و زەکاتەوە... زەکات مافی دارایی گشتییە... بەو خوایە ئەگەر هەق بێ چتیرێک لە زەکاتدا بدەن و نەیدەن لەسەر ئەو چتیرە لەگەڵیان دەجەنگم...

- ئەی جگە لە حەزرەتی عومەر کێیتر هاوڕای تۆ نەبوو؟

+ زۆربەی هاوەڵە گەورەکان هاوڕای من نەبوون...

ئەبوعوبەیدەی جەڕاح...

سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە...

سەعدی کوڕی عوبادە...

زۆرێکی تریش دژی بڕیارەکەی من بوون...

- ئەی ئەوان چییان دەگوت... پێیان باش بوو چی بکەن؟

+ ئەوان دەیانگوت: ئا لەم بارودۆخەدا دەبی نەرمی بنوێنین... ئەوەتا ئەوەندە خەڵک پاشگەز بووەتەوە نە سەری هەیە نە سامان...

عومەری کوڕی خەتتاب هاتەوە و پێی وتم: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! نەرمی بنوێنە و لەگەڵ خەڵکدا نەرم بە...

منیش وتم: من هیوام وابوو پشتم بگری، ئێستا داوای نەرمینواندنم لێ دەکەی؟ ئەوە عومەر تۆ بۆ لە سەردەمی نەفامیدا زۆر توند و سەختگیر بووی، بەڵام ئێستا دەتەوێ سەر شۆڕ بکەی؟

تۆ بە من دەڵێی: پێغەمبەی خوا(ﷺ) فەرموویەتی: فرمانم پێ کراوە کە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تا شایەتی دەدەن کە جگە لە زاتی

**الله** هیچ خودایەکی تر نییە... هەر کەسێ وتی: لاالە الاالله، ئیتر خوێن و ماڵی پارێزراوە مەگەر لەسەر شتێ نەبێ کە مافی ئەوەی بێ لەگەڵیاندا بجەنگم، ئیتر لەوەولایش خوا خۆی زانایە و حەق و حیسابیان لای ئەوە؟

ئەی مەگەر نوێژ و زەکات مافی ئەوەیان نییە مرۆڤ لە پێناویاندا بجەنگێ؟

بە خوا ئەگەر بە تاقی تەنیاش بووە لەگەڵیاندا دەجەنگم... تازە ئیتر وەحی (سروش) نەما... ئایین کامڵ بوو... بە خوا هەر کەسێ جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکاتەوە لەگەڵیدا دەجەنگم... من زیندووبم و لە ئایین کەم بکرێتەوە؟

- ئەی دوایی چی ڕوویدا؟

+ خوای گەورە ئەوانیشی هێنایە سەر ڕا و بۆچوونەکەی من... دانیان بەوەدا نا کە هەق لای منە... بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر لەوانە خۆشبین کە زەکات نادەن، سبەی ئیتر هەر کەسێ بۆ خۆی و بە ئارەزووی خۆی شت زیاد و کەم دەکات... ئەم ئەڵێ: نوێژ ناکەم... ئەویتر دەڵێ: حەج ناکەم و بە کورتی دەبێ بە پاشاگەردانی و هەر کەس بۆ خۆی...

- بە خوا ڕاست دەفەرمووی قوربان... بە خوا خوای گەورە بەهۆی تۆوە ئەم ئایینەی پاراست... ئەوێ ڕۆژێ تۆ وەک شێر وەستایتەوە و لە پێناوی ئایینی خوای گەورەدا سڵت لە سەرکۆنەی هیچ کەسێک نەکردەوە و قسەی هەقی خۆت کرد...

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کوڕم...

- ئەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ دوای ئەوەی نوێنەرەکانی ئەوان بە دەستی پووچ لە لای من گەڕانەوە، ئیتر من دڵنیا بووم کە پاشگەزبووەکان هێرش

دەکەنە سەر شاری مەدینە... هەندێ سوارچاکم کردە پاسەوانی دەروازەکانی مەدینە کە بریتی بوون لە:

عەلی کوڕی ئەبوتالیب...

زوبەیر...

طەڵحە...

عەبدوڵلای کوڕی ئیبنومەسعود...

دوایی خەڵکی مەدینەم لە مزگەوت کۆ کردەوە و پێموتن: ئەوەتا سەرزەوی کافر بووەتەوە... ئەوانە دەزانن کە ئێمە ئەمڕۆ کەمین... ئێمەش نازانین ئەوانە بە شەو هێرش دەکەن یان بە ڕۆژ؟ نزیکە هەرە نزیکەکەیان تاقە ڕێیەک لە ئێمەوە دوورە... ئەوانە قرمیان لە ئێمە خۆش کردووە... بۆیە خۆتان ئامادە بکەن و با چەک و چۆڵ و تفاقی جەنگتان بەردەست بێ...

- ئەی قوربان دوایی چی ڕوویدا؟

+ دوای سێ شەو بە شەودا هێرشیان هێنا بۆ مەدینە... پاسەوانەکان پێیان زانین... یەکسەر پەیامیان بۆ من نارد... منیش پێموتن: لە جێگەی خۆتان بمێننەوە و مەجووڵین... خۆم و هەرچی پیاوی مەدینەیە چووین بۆ جەنگ... ئێمە جەنگێکی دەستەویەخەمان کرد و کارێکمان پێ کردن سەرما بە هەتیو و با بە دەواری شڕی نەکا... زۆرمان لێ کوشتن... ئیتر بە ناچاری و بە سەرشۆڕی گەڕانەوە...

- یانی ئەوەی لێی دەترسای ڕوویدا؟

+ نەخێر... ئەوەی من چاوەڕوانم دەکرد ڕوویدا... من لە خوا نەبێ لە هیچ کەس و لە هیچ شتێ ناترسم... ئێمە چاوەڕێی ئەوان بووین و بە یارمەتی خوای گەورە و میهرەبان سەرکەوتین بە سەریاندا...

- ئەی قوربان دواییدا چی ڕوویدا؟

+ لە دڵی خۆمدا وتم: ئێستا ئیتر ئێمە هێرش دەبەین و هێرشمان ناکرێتە سەر... من دەمزانی ئەوانە لە شوێنێکدا بە ناوی (ذي القصة) گیرساونەتەوە، زیلقەصصە شوێنێک بوو ڕۆژە ڕێیەک لە مەدینەوە دوور بوو... خەڵک کۆ کردەوە و هانم دان... شەوێک بە خشکی بۆیان ڕۆیشتین... لە کاتی بەرەبەیانیدا پێیان گەیشتین... ئاگایان لە خۆیان نەبوو تا خۆمان کرد بە ناویاندا و جەنگ دەستی پێ کرد... لەوێش بە یارمەتی خوای گەورە تێکمان شکاندن... ئیتر مسوڵمانان تەواو ورەیان پەیدا کرد و هەمووان بۆیان دەرکەوت کە ئێمە لەسەر هەقین... هەندێ لەوانەش کە دەیانگوت زەکات نادەین، هاتنەوە ڕیزی مسوڵمانان و وازیان لەو بیرۆکە بەدفەڕە هێنا... ئیتر لەوەودوا زەکاتی خۆیان نارد... منیش بەو زەکاتە سوپایەکی تۆکمە و بەهێزم ڕێک خست... بەو جۆرە خوای گەورە سۆز و بەزەیی خۆی ڕژاند بەسەر ئێمە و ئەوانەشدا کە بەرەو لای ڕاستی گەڕانەوە...

- قوربان ئەمە هەمووی پێش هاتنەوەی سوپاکەی ئوسامە ڕوویدا؟

+ بەڵێ کوڕم... پێش هاتنەوەی ئەو سوپایە ڕوویدا...

- ئای کە سەرکردەیەکی لێهاتوو و زیرەکی... ئەو پیاوەی کە ئەوەندە دڵنەرم بوو قورئانی بۆ نەدەخوێنرا ئێستا ئاوا کەڵبەی شێر لە بن دێنێ و سەفی شێران دەشکێنێ...

+ کوڕم کێ وتوویەتی ئیمان مرۆڤ لاواز و ترسنۆک دەکات؟

- قوربان استغفرالله! من مەبەستم ئەوە نییە... مەبەستم ئەوەیە خەڵک وا لە جەنابت تێگەییبوون کە کەسێکی دڵنەرم و لەسەرخۆی... ئەم هەمووە زیرەکی و جەنگاوەرییەت لە کوێرا دەست کەوت؟

+ ئەبوبەکر هەرگیز لە کاتێکدا دەبێ توندبێت، نەرم نەبووە... لە کاتێکیشدا کە دەبێ نەرم بێ، توند نەبووە... هەموو کاتێ دەبێ بە گوێرەی ئەو کاتە مامەڵەی لەگەڵدا بکەی... لە کاتی توندیدا توند بی... لە کاتی نەرمیدا نەرم... ئەو کاتانە کاتی جەنگ بوو نەک نەرمینواندن... بۆیە منیش بووم بە جەنگاوەر...

- بە خوا قوربان ڕاستە جەنگاوەر بووی ئەمما جەنگاوەر... ئەی قوربان دوای هاتنەوەی سوپاکەی ئوسامە چی ڕوویدا؟

+ ئوسامە و سوپاکەی ئوسامە گەڕانەوە... ئێمەش دەمانەویست بڕۆین بۆ (ڕەبزە)... ڕەبزە شوێنێکە نزیکەی تاقە ڕێگایەک لە مەدینەوە دوورە... بیستبوومان هەندێ لەوانەی لە ئایین پاشگەز بوونەتەوە لەوێ مۆڵیان خواردووە... منیش بە سوپاکەم وت: ئێوە ماندوون، پشوو بدەن و مەیەن... خۆم لەگەڵ سوپایەکدا بەرەو ڕەبزە دەرچووم... مسوڵمانان وتیان: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر تۆ بیێت و شتێکت لێبێ کەسێک نییە دووبارە یەکمان بخاتەوە... تۆ خۆت بمێنیتەوە ئەوە لەوە باشترە بێی بۆ جەنگ... یەکێک بکە بە سەرکردە، ئەگەر کوژرا دەتوانی کەسێکی تر دیاری بکەی...

- وەڵڵا قوربان قسەیەکی جوان بوو... ئەی جەنابت بەو قسەیە ڕازی بووی؟

+ نەوەڵڵا... دەبوو خۆم سەرکردایەتی ئەو سوپایە بکەم...

- ئای ئای قوربان... تۆ چەندێ مەزنی! ئەی دوایی چی قەوما؟

+ عەلی کوڕی ئەبوتالیب هات و بە منی وت: ئەبوبەکر! من ئەو قسەیەت پێ دەڵێم کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا پێی وتی... شمشێرەکەت بخەرە نێو کالانەوە، نەکا تووشی شتێک بی... تووشی خەم و خەفەتمان مەکە... بگەڕێوە بۆ مەدینە... بە خوا ئەگەر تۆ

**شتێکت لێبێ ئیتر هەتا هەتایە ئێمە خۆمان ناگرینەوە... ئیتر ئیسلام بێسەروبەر دەبێ و یەکێک نییە بتوانێ سەرلەنوێ ڕێکی بخاتەوە...**

**- بە خوا حەزرەتی عەلی ڕاستی فەرموو... ئەی قوربان جەنابت چیت فەرمووو؟**

+ من وتم: نا بە خوا ناگەڕێمەوە و گیانی منیش وەکو گیانی ئێوە...

ناوی خوامان هینا و هەمووان وەڕێ کەوتین... گەیشتینە ڕەبزە... لەوێ لەگەڵ ئەو پاشگەزبووانەدا ڕووبەڕووی یەک بووینەوە و کارێکمان پێ کردن هەرگیز لە بیریان نەچێ... ئەوان بە تەواوی شکان و هەڵاتن...

- بە خوا تۆ خەلیفەیەکی دادوەر و شێردڵی قوربان... بە خوا سەربازەکانیشت هەموو سەربازی چاک و پاک و دڵسۆز بوون...

+ بەڵێ کوڕم ڕاست دەڵێی... سەربازەکانم سەربازی چاک و لێهاتوو بوون...

❀ ❀ ❀

- قوربان با بێینە سەر باسی موسەیلەمەی درۆزن و یەمامە... ئەوان چییان بەسەر هات و ئێوە چیتان کرد؟

+ موسەیلەمە هەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بانگەشەی پێغەمبەردایەتی کرد... ئەو چەند کەسێکی لە هۆزەکەی خۆی (هۆزی بەنی حەنیفە) دەنارد بۆ ئەوەی گوێ لە قورئان بگرن و دوایی ئەویش لە خۆوە وشەکانی قورئانی بەکار دەهێنا و شتهایەکی دەهۆندەوە و ڕێکی دەخستن... یەکێک لە سەیروسەمەرەترین گێلییەکانی موسەیلەمە ئەوەبوو ڕۆژێک وتی: سروشم بۆ هاتووە...

ئەم قسانەی کردبوو: (یاضفدع یا ضفدعین... نقی ما تنقین، أعلاک في الماء وأسفلک في الطین، لا الشارب تمنعین، ولا الماء تکدرین)... ( واتە: هۆ بۆق هۆ دوو بۆق... پاکن گەر پاک بن... سەرت لە ئاوە و پاشت لە قوڕاو، نەدەبیە لەمپەر لە بەردەم ئاوخۆر، لە ئاو پیس دەکەی!)

پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە و مەزن... پاک و بێگەردی بۆ ئەو زاتە کە خەڵکانێک ڕێنوێنی دەکات و خەڵکانێکیش کل دەکات... خەڵکانێکی زۆر گێل هەبوون باوەڕیان بە موسەیلەمە کردبوو... هەندێ کەسیش هەر لە ڕووی دەمارگیرییەوە شوێنی کەوتبوون... پرسیاریان لە هەندێ کەسی دەمارگیر کرد: بۆچی شوێن موسەیلەمە دەکەون؟ مەگەر ئێوە نازانن کە موسەیلمە درۆزنە؟

وتبوویان: با بەرەوەڵڵا ئەزانین درۆزنە، بەڵام ئێمە درۆزنی ڕەبیعەمان لە ڕاستگۆی (مضر) پێ باشترە... مەبەستیان لە ڕاستگۆی (مضر) پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو... پەنا بە خوا، یانی ئەوەندە دەمارگیر بوون دەیانزانی موسەیلەمە درۆزنە و پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستگۆ، کەچی هەر شوێنی موسەیلەمە دەکەوتن...

- قوربان موسەیلەمە هەرگیز چاوی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوت؟

+ بەڵێ کوڕم چاوی پێی کەوت...

- چۆن و لە کوێ؟

+ ساڵی نۆیەمی کۆچی هۆزی بەنوحەنیفە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی مسوڵمان ببن... موسەیلەمەی درۆزن یەکێک بوو لەو کەسانە کە هاتبوو... موسەیلەمە دەیگوت: ئەگەر محەمەد بەڵێنم پێ بدا دوای خۆی ئەو کارە ڕادەستی من بکات، ئەوا ئیمانی پێ دەهێنم و شوێنی دەکەوم...

پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو لای موسەیلمە تەشریفی برد... تەنیا سابیتی کوڕی شەمماسی لە خزمەتدا بوو... پێغەمبەر(ﷺ) پەلی دارخورمایەکی بە دەستەوە بوو، بە موسەیلەمەی فەرموو: ئەگەر داوای ئەم پەلە دارخورمایەشم لێ بکەی پێت نادەم... ئەگەر پشت لەم ئایینە بکەیت و شوێنم نەکەوی ئەوا خوای گەورە لەناوت دەبا... ئەوە سابیتە لە جیاتی من وەڵامت دەداتەوە... من وا دەزانم تۆ هەر ئەوەی کە لە خەودا بینیم...

- قوربان مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) چیبوو کە فەرمووی: من وا دەزانم تۆ ئەوەی کە لە خەودا بینیم؟

+ ڕۆژێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئێمەی گێڕایەوە و فەرمووی: لە خەوما بینیم دوو بازنی زێڕم بە دەستەوە بوو، بە لامەوە گرنگ بوون... ئیتر سروشم بۆ هات کە فوویان لێ بکەم... منیش فووم لێ کردن و بازنەکان چوون بە حەوادا... بۆیە منیش بە دوو درۆزن لێکم دایەوە... یەکێکیان عەنسی خەڵکی صەنعا... ئەویتر موسەیلەمەی درۆزنی یەمامی...

- شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ڕاستی پێغەمبەر بووە... ئەی قوربان دوایی چی ڕوویدا؟

+ ساڵی دەیەمی کۆچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەخۆش کەوت... مەبەستم ئەو نەخۆشینەیە کە دواتر وەفاتی کرد... موسەیلەمەی درۆزن نامەیکی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نووسی، تێیدا نووسیبووی: لە موسەیلەمی پێغەمبەری خوداوە بۆ محەمەد پێغەمبەری خودا... لە پاشان ئەمە: بەڕاستی من لەم کاری پێغەمبەرایەتییەدا کراوم بە هاوبەشی تۆ... نیوەی زەوی بۆ من و نیوەیشی بۆ تۆ...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگی ئوبەیی کوڕی کەعبی کرد نامەیەکی پێ نووسی و فەرمووی بنووسە:

لە محەمەد پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆ موسەیلمەی درۆزن... لە پاش ئەمە: بەڕاستی زەوی زەوی خودایە... دەیکا بە میرات بۆ ئەو بەندانەی خۆی کە خۆی ویستی لەسەریەتی... کۆتاییش هەر بۆ خواناسانە... سڵاوی خوا لەوانەبێ کە شوێن ڕاستەقینە دەکەون.

- باشە قوربان کێ نامەکەی موسەیلمەی درۆزنی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

+ دوو پیاو بوون... یەکێکیان ناوی (ئیبنول نەواحە) بوو، ئەویترم نەدەناسی...

دوای ئەوەی نامەکەی موسەیلەمە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوێنرایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بەو دوو پیاوەی فەرموو: ئەی ئێوە چی دەڵێن؟

ئەوانیش وتیان: ئێمەش ئەوە دەڵێین کە موسەیلەمە دەیڵێ...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بە خوا عادەت نییە نوێنەر و نێردە بکوژرێ، ئەگینا لە ملی هەردووکتانم دەدا...

- ئەی قوربان کێ نامەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) برد بۆ موسەیلەمە؟

+ حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاری کە بە (ئیبنو ئوممو عەمارە) بەناوبانگ بوو، بردی... کاتێ موسەیلەمە نامەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) خوێندبوویەوە بە حەبیبی وتبوو:

تۆ شایەتی دەدەی کە محەمەد پێغەمبەری خوایە؟

حەبیب وتبووی: بەڵێ بێگومان...

موسەیلەمە وتبووی: ئەی شایەتی دەدەی کە منیش پێغەمبەرم؟

حەبیب وتبووی: من کەڕم گوێم لێ نییە...

موسەیلەمە ئەندامێکی لاشەی حەبیبی بڕیبوو... دیسان پێی وتبوویەوە:

تۆ شایەتی دەدەی کە محەمەد پێغەمبەری خوایە؟

حەبیب وتبووی: بەڵێ بێگومان...

موسەیلەمە وتبووی: ئەی شایەتی دەدەی کە منیش پێغەمبەرم؟

حەبیب وتبووی: من کەڕم گوێم لێ نییە...

بەوجۆرە هەر جارەو پرسیاری لێ دەکرد حەبیب بەو شێوەیە وەڵامی دەدایەوە و موسەیلەمەش ئەندامێکی حەبیبی دەبڕییەوە... ئەویش بەردەوام شایەتی دەدا کە محەمەد پێغەمبەری خوایە(ﷺ)... کاتێ لە بارەی خۆیەوە لێی دەپرسی، حەبیب دەیگوت: من کەڕم نابیستم... موسەیلەمە هەر بەردەوام بوو، حەبیبیش وەکو کێو خۆڕاگربوو تا بە پلەی شەهیدی شاد بوو...

- پاک و بێگەردی بۆ خوا... قوربان سەیری جیاوازی نێوان پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسەیلەمەی درۆزنی پیس...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) نێردەکانی نەکوشت، چونکە عادەت وانەبوو نێردە بکوژرێ... کەچی موسەیلەمەی درۆزن حەبیبی شەهید کرد و ڕەچاوی ئەوەی نەکرد کە نێردەیە... ڕەچاوی ئەوەی نەکرد کە خەڵکی هەموو دەزانن کە نابێ نێردە بکوژرێ...

+ بەڵێ کوڕم! خۆت زۆر بە کورتی وتت: ئەوە جیاوازی نێوان پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسەیلەمەی درۆزن...

- ئەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کارەکەی موسەیلەمە لەنێو هۆزی بەنوحەنیفەدا پەرەی سەند... زۆربەی زۆری بەنوحەنیفە شوێنی کەوتن... تەنیا (ثمامەی کوڕی أثال) و چەند کەسێکی کەم نەبێ، ئەوان خۆڕاگر بوون و لەسەر ئایینی ئیسلام مانەوە... ئەوان شایەتیی ئەوەیان دەدا کە محەمەد پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و موسەیلەمە درۆزنە...

دوای ئەوەی خالیدی کوڕی وەلید لە جەنگی (ئەسەد و غطفان و مالیکی کوڕی نووەیرە) لێبوویەوە، نامەیەکم بۆ نووسی تا ڕوو بکاتە یەمامە و لەگەڵ موسەیلەمەدا بجەنگێ...

- قوربان چیت بۆ نووسی؟

+ نووسیم:

من سوپاسی خوای تاک و تەنیا و بێ نیاز دەکەم... بڕۆ بۆ یەمامە... تەنیا لە خوای گەورە بترسە... لەگەڵ مسوڵمانانیدا نەرمونیان بە... وەک باوکیان وابە... خالید خۆت لە جۆش و خرۆش و خۆبەگەورەزانینی بەنی موغەیرە بپارێزە... من ئەوەندەی پێموتراوە: خۆت لە خالید بپارێزە! ئەوەندە پێمنەوتراوە خۆم لە هیچ شتێ بپارێزم... جوان بڕوانە بەنی حەنیفە... بە ویستی خوا ئەگەر پێیان گەیشتی تۆ هەرگیز نەگەیشتووی بە هۆزێک وەکو بەنی حەنیفە وابن... هەرهەموویان لەسەر خۆتە... ئەوانە ناوچەیەکی فراوانیان هەیە... ئەگەر ڕۆیشتی خۆت کارەکە جێبەجێ بکە... با پیاوێک لای ڕاستتەوە و پیاوێک لای چەپتەوە بێ... پیاوێکیش بخە سەر ئەسپەکەت... ڕاوێژ بکە بە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... ئیتر چ کۆچەری بن یان ئەنصاری... ڕێزیان لێ بگرە... ئەگەر گەیشتیتە هۆزی بەنوحەنیفە و خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کردبوو، تۆش پشت بە خوا تێیان بکەوە... تۆ خۆت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە کردووە... تیر بە تیر و شیر... بە باشی لەگەڵیاندا بجەنگە...

- ئای قوربان لەو نامەیە چەندێ گەورەیە... خالید هەرچەندە خۆی پیاوێکی جەنگاوەر و شارەزا بوو، کەچی جەنابت لەمەڕ جەنگەوە ئامۆژگاری زۆر گەورەت کرد... لە ئامۆژگارییەکانتەوە دەردەکەوێ کە جەنابت لە نەخشە و پلانی جەنگدا زۆر شارەزای...

+ کوڕم بە خوا خالیدی کوڕی وەلید شێرێک بوو لە شێرەکانی خوای گەورە... من بە تەواوی متمانەم پێی هەبوو، بەڵام خۆ ناکرێ لە کاتی ئاساییدا ئامۆژگاری پشتگوێ بخرێت و نەکرێ، چ جای کاتی جەنگ و توندوتیژی کە گیان لەسەر دەستەکانە...

– باشە قوربان تۆ بە خالیدت فەرموو: خالید خۆت لە جۆش و خرۆش و خۆبەگەورەزانینی بەنی موغەیرە بپارێزە... من ئەوەندەی پێموتراوە: خۆت لە خالید بپارێزە! ئەوەندە پێمنەوتراوە خۆم لە هیچ شتێ بپارێزم... مەبەستت لەوە چیبوو؟

+ لە سەردەمی نەفامیدا بەنو موغەیرە شەڕانی و پیاوی شەڕ و جەنگاوەری بەهێزبوون... هەر هەموویان زیرەک و لێهاتوو بوون... بەبێ ئەوەی بترسن و فوو لە دۆ بکەن، ڕووبەڕووی هەموو سوپایەک دەبوونەوە... خالیدیش لەو تیرە و هۆزە بوو... وەک ئەوان بوو... بگرە لە هەموویان زیاتر زیرەک و لێهاتوو بوو... هەر لەبەر ئەوە بوو کە عومەری کوڕی خەتتاب زۆر جار بە منی دەوت: خالید لابە... عومەر پێیوابوو خالید لەبەر ئەوەی زۆر زیرەک و لێهاتووە وەک شێری لێهاتووە و سڵ لە هیچ شتێ ناکاتەوە و ئیتر وادەزانێ هەموو سەربازەکانیشی وەک خۆی وان، بۆیە کاری وایان پێ دەسپێرێ و لە جەنگی وادا بەشدارییان پێ دەکات کە بەرگەی ناگرن و پێیان ناکرێ و تیادەچن...

منیش بە عومەرم دەگوت: ئەی تۆ نازانی خالید چەند جار جەنگابێت سەرکەوتووە؟

ئەویش دەیگوت: ئاخر منیش لەوە دەترسم... دەترسم خەڵکی بە خراپ تێبگەن و بڵێن: ئێمە خالید سەرمان دەخا...

بە خوا عومەر کەسێکی ئەمین و دڵسۆز بوو... ئەو ڕایەکی تایبەت بە خۆی هەبوو، منیش ڕای تایبەت بە خۆم... خوا لێی خۆشبێ...

- ئەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ هەردوو سوپاکە پێکگەیشتبوون... جەنگ لەنێوانیان ڕوویدا... سەرەتا جەنگەکە بە قازانجی سوپاکەی موسەیلەمە شکابوویەوە... هەندێ لە هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەهید بوون... لەوانە:

قەیسی کوڕی شەماس...

عەبدوڵلای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر...

ئەبودووجانە...

عەببادی کوڕی بیشر...

طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی...

- ئەی قوربان دواتر خالید چی کرد؟

+ هەر کاتێ خالید لە جەنگدا لێیدرابا زۆر بە خێرایی سوپاکەی ڕێک دەخستەوە... ورەی سەربازەکانی بەرز دەکردەوە... ئەوجارەش وایکرد... هانی سەربازەکانی دا ڕووبەڕووی سوپاکەی موسەیلەمە ببنەوە... دووبارە جەنگ دەستی پێ کردەوە... کوشت و کوشتار گەرم بوو... سوپای موسەیلەمە کشانەوە بۆ (حەدیقە)...

- حەدیقە کوێبوو قوربان؟

+ قەلایەکی بەهێز بوو موسەیلەمە دروستی کردبوو...

- ئەی قوربان سوپاکەی خالید چۆن ڕۆیشتنە ناو قەلاکە؟

+ دوای خوای گەورە، بەرائی کوڕی مالیک بوو بە هۆکار... دوای ئەوەی سوپاکەی موسەیلەمە ڕۆیشتبوونە نێو قەلاکە و دەرگا پتەو و بەهێزەکەیان داخستبوو، بەرائی کوڕی مالیک داوای کردبوو بیبەستن بە ڕمێکەوە و بیتەقێنن بۆ ناو قەلاکە تا بڕوا و دەرگاکەیان بۆ بکاتەوە...

- ئای خوایە گیان لەو خۆبەختکردنە...

+ بەڵێ بە خوا خۆبەختکردن بوو... سەرەتا کەس بە قسەکەی بەراء ڕازی نەبوو، چونکە پێیان وابوو ئەوە خۆکوژییە، بەڵام ئەو هەر مکوڕ بوو... ئەوانیش بەستبوویانەوە بە ڕمێکەوە و لە شوورەی قەڵاکە و نزیک لە دەرگاکە فڕێیان دابووە ژوورەوە... بەراء لەگەڵ پاسەوانەکان تێگیرابوو... پانزە پاسەوانی کوشتبوو... دوایی توانی دەرگاکە بکاتەوە... سوپای ئیسلام ڕژایە نێو قەڵاکەوە... دایان بەسەر سوپاکەی موسەیلەمەدا و لەناویان بردن...

- ئەی قوربان خودی موسەیلەمە چی بەسەر هات؟

+ وەحشی کوڕی حەرب بە ڕمێک لێیدا و کوشتی... هەر ڕێک بەو ڕمەی کە گەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبی پێ شەهید کرد... بۆیە هەموو جارێک وەحشی دەستێکی لە ڕمەکەی دەدا و دەیگوت: بەم ڕمە باشترین کەسم شەهید کرد، حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ)... هەر بەم ڕمە خراپترین کەسم کوشت... موسەیلەمەی درۆزن...

- پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنوێنی مرۆڤێکی ئاوا گومڕا دەکات و ڕێگای ڕاستی پێ نیشان دەدا...

+ پاک و بێگەردی بۆ خوای مەزن... بۆ ئەو خوایە کە لەگەڵ بەندەکانیدا بەسۆزە...

❀ ❀ ❀

- قوربان دەمەوێ لە بارەی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزەوە پرسیارت لێ بکەم... ئەوە چۆن بوو؟

+ پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد... ئەو دەمە قورئان کۆ نەکرابوویەوە، بەڵکوو قورئان پرش و بڵاو بوو... زۆرێک لە

هـاوەڵان قورئانیـان بـە تـەواوی لەبـەر بـوو... هەندێکیـش بڕێکـی زۆری قورئانیـان لەبـەر بـوو... هەندێکیـش قورئانیـان لەسـەر پارچـە پێستەیەک، یان هـەر شتێکی تری گونجاو بووایـە، نووسیبوویانەوە و لایان بوو... ئەو کاتە هیچ پێوستی نەدەکرد قورئان کۆ بکرێتەوە و بکرێ بـە یـەک کتێب...

دوای ئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) وەفاتی کرد و من بووم بـە خەلیفە، وەک بـۆم بـاس کـردی لەگـەڵ پاشـگەزبووەکان بـوو بـە جەنگمـان... ژمارەیەکی زۆر لـەو هاوەڵانـەی کە قورئانیان لەبەر بوو لەو جەنگانەدا شـەهید بـوون... دواتـر جەنگـی موسـەیلەمە هاتـە پێشـەوە... لەوێـش ژمارەیەکـی زۆر لـە هـاوەڵان شـەهید بـوون... لەنـاو ئـەو شـەهیدانە ژمارەیەکـی زۆر لەوانـەی تیابـوو کـە قورئانخوێنـی بەناوبانـگ بـوون و قورئانیان لەبەر بوو... لەبەر ئەوە عومەر هات و بە منی وت: با قورئـان کـۆ بکەینـەوە... بـا قورئـان تیانەچـێ... زۆرێـک لـەو هاوەڵانـە شـەهید بـوون کـە قورئانیـان لەبـەر بـوو، ئەگـەر کار ئـاوا بـڕوا و قورئـان کـۆ نەکرێتـەوە، دەترسـم بفەوتـێ و تیابچـێ...

دواتـر وتـی: ڕۆژی یەمامـە جەنگێکـی سـەخت ڕوویـدا... دەترسـم دیسـان جەنگـی تـر ڕووبـدات و هەمـوو ئەوانـە شـەهید ببـن کـە قورئانیـان لەبـەرە... بـەو جـۆرە بەشـێکی زۆری قورئـان تیابچـێ... ئەگـەر قورئـان کـۆ بکرێتـەوە ئـەو ترسـەمان نامێنـێ...

منیـش بـە عومـەرم وت: مـن چـۆن کارێـک بکـەم کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نەیکردبـێ؟

عومەر وتی: بە خوا ئەو کارە کاری خێرە...

ئیتر بـەردەوام عومـەر داوای لـێ دەکـردم قورئـان کـۆ بکەینەوە، تـا وای لێهات خـوای گـەورە ئـەو کارەی لای منیش ئاسـان کـرد و پێـی ڕازی بووم... هاتمـە سـەر ڕایەکـەی عومـەر...

ڕۆژێک عومەر لە لامدا دانیشتبوو، باس باسی کۆکردنەوەی قورئان بوو، منیش ناردم بە دوای (زەیدی کوڕی سابیت)دا، بە زەیدم وت: تۆ پیاوێکی گەنج و ڕاستگۆ و دەستپاکی... کاتی خۆی نووسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوویت و قورئانت دەنووسییەوە... ئێستا دەمانەوێ هەموو قورئان کۆ بکەیتەوە و بینووسیتەوە...

زەید وتی: ئێوە چۆن کارێکی وا دەکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیکردبێ؟

منیش وتم: بە خوا ئەو کارە کاری خێرە و چاکە...

زەید کارەکەی بە لاوە گران بوو... ئەوەندە گفتوگۆمان لەسەر کرد تا خوای گەورە لای ئەویش ئاسانی کرد و ناوی خوای لێ هێنا... هەرچی نووسراو هەبوو چی لەسەر بەرد، یان ئێسک، یان پێست، هەمووی کۆ کردەوە... پرسی بەوانە دەکرد کە قورئانیان لەبەر بوو... تا وای لێهات هەموو قورئانی کۆ کردەوە...

- ئەی خوا پاداشتی خێرت بداتەوە قوربان... خوا پاداشتی حەزرەتی عومەریش بداتەوە... خوا پاداشتی خێری زەیدیش بداتەوە... لە خوام داوایە هەتا ئەمڕۆ هەرچی قورئان خوێنراوە و تا پەسلانیش هەرچی دەخوێندرێ، خوای گەورە ئەوەندە و دەیان ئەوەندە چاکەتان بۆ بنووسێ...

+ ئامین ئامین... خوا پایەدارت بکا کوڕم...

- قوربان ئەگەر ئیزنم بدەی دەمەوێ لەمبارەوە پرسیاری شتێکیت لێ بکەم...

+ فەرموو کوڕم بپرسە...

- قوربان بۆچی بە دیاریکراوی بانگی زەیدت کرد و بابەتەکەت لە لا باس کرد؟

+ ئاخر زەید پیاوێکی گەنج، زیرەک، وریا و دەستپاک بوو...

قورئـان کۆکردنـەوە کەسێکی وەک زەیدی دەویسـت... مرۆڤی گەنج وەک پیر نییە، ئەگەر شتێک هاتە پێشەوە ئامۆژگاری وەردەگریّ و لەسەر ڕای خۆی مکوڕ نابیّ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ تەمەنێکی کرد، ئیتر کەمتر گویّ بۆ قسەی ئەم و ئەو دەگریّ... لەناو هاوەڵاندا ژیری زەید دەنگی دابوویەوە... ئیتر ئەو زۆر گونجاو بوو بۆ ئەو کارە... جگە لەوەش زەید خۆی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نووسەری تایبەتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو... قورئانی دەنووسییەوە... ئەوەندەی ئەو ئاگاداری ئەو کارە بوو، هیچ کەسێکی تر ئاگادار نەبوو... کەسێکی جیّ متمانەی هەمووانیش بوو... زۆر خۆپارێز بوو... ئاکار و ڕەفتاری زۆر جوان بوو... لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە خۆی هەموو قورئانی لەبەر بوو... لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کاتیّ بۆ دوایین جار حەزرەتی جوبرەئیل هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و پێکەوە قورئانیان خوێند، ئەو کاتە زەید قورئانی لەبەر کرد... ئەو ساڵەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، زەید دووجار قورئانی لەبەر لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) خوێندبوویەوە... بۆیە بەمجۆرە قیرائەتەی قورئان دەوتریّ: قیرائەتی زەیدی کوڕی سابیت، چونکە خۆی قورئانی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نووسییەوە و وەک وتم: بۆی خوێندەوە و تا مردنیش هەر بەو جۆرە قورئانی دەخوێندەوە...

- بە خوا قوربان بژاردەکەت بژاردەیەکی زۆر چاک بوو...

+ پایەدار بی کوڕم... من بۆیە زەیدم هەڵبژارد لەبەر ئەو هۆکارانەی کە بۆم باس کردی... خوای گەورەش یارمەتی زەیدی دا و زۆر سەرکەوتووانە کارەکەی جێبەجیّ کرد... ئەو ڕێک بەو شێوەیە بوو کە من ئومێدم پێی بوو...

- ئەی باشە قوربان چیرۆکی شایەتییەکەی خوزەیمە چۆنە؟ چۆن شایەتی ئەو خۆی بە تەنیا بە دوو شایەت وەردەگیرا؟

+ جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەسپێکی لە پیاوێکی دەشتەکی کڕی... پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشەوە بەپەلە بەرەو ماڵ هاتەوە تا پارە بێنێ و بیدا بە پیاوە دەشتەکییەکە... پیاوەکەش لە دواوە لەسەر خۆی ڕێی دەکرد... لە ڕێگا چەند پیاوێک گەیشتن بە پیاوە دەشتەکییەکە... نەیانزانیبوو ئەم دەشتەکییە ئەسپەکەی فرۆشتووە بە پێغەمبەر(ﷺ)... بۆیە مامەڵەی ئەسپەکەیان کرد... پیاوە دەشتەکیەکەیش مامەڵەی لەگەڵدا کردن و نەیوت: فرۆشتوومە...

وا ڕێکەوت ئەو پیاوانە هەندێ پارەی زیاتر لەو نرخەیان دا بە دەشتەکییەکەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێیدابوو... ئیتر پیاوەکە لە دوورەوە بانگی پێغەمبەری(ﷺ) کرد و وتی: ئەگەر ئەم ئەسپە ئەکڕی بیکڕە، ئەگینا من دەیفرۆشم بەم دوو پیاوە...

پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە فەرمووی: ئەی من ئەسپەکەم لێ نەکڕیوی؟

پیاوە دەشتەکیەکە وتی: نەوەڵلا نەتکڕیوە...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: با کڕیومە...

ئیتر خەڵکەکە داوایان لە پیاوەکە و لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد کە کۆتایی پێ بێنن...

پیاوە دەشتەکیەکە وتی: دەی ئەگەر تۆ کڕیوتە شایەتێک بێنە با شایەتیت بۆ بدا...

هەندێ هاوەڵ چوون بۆ لای پیاوە دەشتەکیەکە و پێیان وت: خوا خراپت بۆ نەکا تۆ دەزانی ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و قسەی هەق نەبێ نایکا؟

زۆری پێنەچوو خزەیمەی کوڕی سابیت هات وتی: وەڵلا من شایەتی دەدەم کە ئەسپەکەت بە پێغەمبەر(ﷺ) فرۆشتووە...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوزەیمە تۆ چۆن شایەتی بۆ من دەدەی؟ خۆ تۆ لەوێ نەبووی...

خوزەیمە وتی: قوربان من باوەڕم بە تۆ هێناوە و بڕوام بەو ئایینە هێناوە کە تۆ هێناوتە، بڕوایشم وایە کە تۆ هەرگیز قسەی ناهەق ناکەی...

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێ خوزەیمە شایەتی بۆ بدا، یان شایەتی لەسەر بدا، ئەوە ئەو شایەتییە حسێبە و وەردەگیرێ.

پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی خزەمیەی بە دوو شایەتی دەژمارد...

کاتێ زەیدی کوڕی سابیت خەریکی کۆکردنەوەی قورئان بوو، یەکێک لە مەرجەکانی ئەوە بوو کە هەر ئایەتێک دێنن دەبێ دوو کەس شایەتی بدا کە ئەو ئایەتەی لە دەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستووە... ئەگینا نەیدەنووسییەوە...

زەید خۆی ئایەتێکی لە بیر چووبوویەوە کە لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستبوو... خوزەیمە ئایەتەکەی لەبەر بوو... ئایەتەکە ئەمە بوو:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾﴾ الأحزاب: ٢٣

واتە: مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا، ڕاستیان کرد لەسەری ژیان و پابەند بوون پێوەی و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کرد و مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بە هیچ شێوەیەک گۆڕان و لاری ڕووی تێ نەکردوون.

ئیتر زەید شایەتییەکەی خوزەیمەی بە دوو شایەتی وەرگرت و ئەو ئایەتەی نووسییەوە و خستیە ناو قورئانەوە...

- ئای خوزەیمە ئەو پاکانەیەی پێغەمبەرت(ﷺ) پیرۆز بێ... خۆزگەم بە خۆت...

**+ وەڵڵا وایە کوڕم... ئەو پاکانەیە هێندە گەورەیە بۆ ئەوە دەشێ مرۆڤ خۆزگەی پێ بخوازێ...**

❀ ❀ ❀

- قوربان! ئیزنم پێ دەدەی دوور لە باسی جەنگ و غەزا، بێمە سەر باسی هەندێ پرسیار سەبارەت بە هەندێ ڕووداوی سەردەمی خەلافی جەنابت؟

+ فەرموو کوڕم پرسیاری خۆت بکە...

- قوربان وەک بیستوومە جەنابت پیاوێکی دەوڵەمەند و زەنگین بووی... ئەو ڕۆژەی لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) کۆچت کرد هەموو سەروەت و سامانەکەت لەگەڵ خۆتدا هەڵگرت و هیچت لەماڵەوە بەجێ نەهێشت... دەمەوێ بزانم کاتێ بووی بە خەلیفە سەروەت و سامانت چەند بوو؟

+ هیچم نەبوو...

- ئەی ئەو هەمووە سەروەت و سامانەت چی لێهات؟

+ دەمزانی سەروەت و سامان لەگەڵ خۆمدا نایەنە نێو گۆڕەوە، دەبێ خۆم بە دەستی خۆم پێش ئەوەی بمرم سەروەت و سامانەکەم بنێرم... بۆیە هەموو سامانەکەم لە پێناوی خوای گەورەدا بەخشی...

- ئەی قوربان کۆتا شت کە بەخشیت چیبوو؟

+ ئەو کاتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) سوپای ڕێک دەخست بۆ جیهاد و تێکۆشان... (جيش العسرة) سوپای تەنگانە... ئەو ڕۆژە هەرچیم هەبوو هەر هەموویم بەخشی بۆ ئەوەی سوپاکەی پێ تۆکمە بکەین...

- قوربان (جيش العسرة) سوپای تەنگانە چییە؟

+ ئەو سوپایە بوو کە ڕێک خرا بۆ ئەوەی بڕوا بۆ تەبووک و ڕووبەڕووی سوپای ڕۆم ببنەوە... ئەو غەزایە لە ساڵی نۆی کۆچی، لە مانگی ڕەجەب کە دەکاتە مانگی حەوتی عەرەبی، دەستی پێ کرد... هۆی سەرەکی ئەو غەزایە ئەوەبوو کە پێغەمبەر() بیستی کە پادشای ڕۆم و سەرۆکخێڵ و عەشیرەتە عەرەبە مەسیحییەکان نیازیان هەیە بێن بدەن بەسەر شاری مەدینەدا... پێغەمبەر(ﷺ) فرمانی دەرکرد سوپایەک ڕێک بخرێت... ئەو کاتە کاتێکی زۆر سەخت بوو... گەرما بوو... گرانی بوو... وشکەساڵی بوو... خەڵک زۆر هەژار و نەدار بوون... ئێمەش هەر یەکەمان لە لایەن خۆیەوە دەستی کرد بە بەخشین بۆ ئەوەی سوپاکەی پێ بەڕێ بخەین... وەڕێ کەوتین... سوپای ڕۆم سی هەزار سەربازی هەبوو... ئێمە گەیشتینە تەبووک، بەڵام تاقە کەسێکی ڕۆمیمان نەدی... تەنانەت هاوپەیمانێکی ڕۆمیشمان نەدی... لەوێ بیست شەو ماینەوە و چاوەڕێ بووین، بەڵام کەس زاتی ئەوەی نەبوو ڕووبەڕوومان بوەستێتەوە... ئێمەش بە سەربەرزی گەڕاینەوە بۆ مەدینە...

– قوربان ئەو کاتە بوو کە حەزرەتی عومەر ویستی لە بەخشیندا پێشت بکەوێ؟

+ بەڵێ ئەو کاتە بوو...

– ئەو چیرۆکە چۆنە قوربان؟ پێمخۆشە بیبیستم...

+ ئەم چیرۆکە زۆر جار خودی عومەر بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە و دەیگوت: پێغەمبەر(ﷺ) فرمانی پێ کردین بە گوێرەی توانا سەروەت و سامانی خۆمان ببەخشین بۆ ئەوەی بتوانین سوپایەکی پێ ڕێک بخەین... منیش هەندێ سەروەت و سامانم هەبوو... لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمڕۆ پێش ئەبوبەکر دەدەمەوە... بەو نیازەوە نیوەی سەروەت و سامانەکەم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عومەر چیت بۆ ماڵ و منداڵ هێشتووەتەوە؟

وتم: قوربان نیوەی سەروەت و سامانەکەم هێناوە و نیوەیشی لە ماڵە بۆ ماڵ و منداڵ...

دوای کەمێک ئەبوبەکر هەرچی هەبوو لەگەڵ خۆی هێنای... چوار هەزار دیرهەمی هێنابوو... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبوبەکر چیت بۆ ماڵ و منداڵ بەجێ هێشتووە؟

ئەبوبەکر وتی: خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ)...

ئیتر منیش وتم: بە خوا هەرگیز پێشت ناکەوم ئەبوبەکر...

- قوربان هەموو داراییەکەت بەخشی؟

+ بەڵێ کوڕم! هەموو داراییەکەم بەخشی... خۆ من پێموتی: من دەمزانی ناتوانم هیچ لەگەڵ خۆمدا ببەمە گۆڕەوە، بۆیە سەرەتا ماڵەکەم نارد بۆ ئەوەی چاوەڕێی من بێت...

- دەی خوای گەورە لێت وەربگرێ و بیکا بە پاداشت و توێشوی ڕۆژی پەسڵان... بەڕاستی جەنابت بە گیان و بە ماڵ تێکۆشەر بووی...

+ ئامین! خوایە لیمان وەربگرە...

- قوربان جگە لە ئێوە کێی تر یارمەتی ئەو سوپایەی دا؟

+ ئەو ڕۆژە هاوەڵە دەوڵەمەندەکان مێژوویەکیان تۆمار کرد لە بەخشیندا، کە هەتا هەتایە پرشنگدارە و لە بیرەوەری خەڵکدا و لە لاپەڕەکانی مێژوودا دەمێنێتەوە...

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف نیوەی سەروەت و سامانی خۆی بەخشی...

عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب پارەیەکی زۆری هێنا...

تەنانەت ژنان خشڵ و زێڕ و زیوی خۆیان دەبەخشی...

**عاصمی کوڕی عەددی حەفتا باری وشتر خورمای کرد بە خێر بۆ ئەوەی سەربازەکان بیخۆن...**

دەوڵەمەندەکان مایین و ئەسپیان دەبەخشی بۆ ئەوەی سەربازەکان پیادە نەبن و سوار بن...

بەڵام عوسمانی کوڕی عەففان لە هەموو کەسێ زیاتری بەخشی... خۆی بە تەنیا سێیەکی سوپاکەی ڕێک خست... پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندەی پێ خۆشبوو فەرمووی: لە دوای ئەمڕۆوە عوسمان هەرچی بکات زیانی پێ ناگەیەنێ...

کوڕم هەموو کەس بە گوێرەی توانای خۆی شتی بەخشی... تەنانەت هەژارەکانیش شتێکیان هەر دەبەخشی...

- باشە قوربان هەژارەکان چۆن شتیان دەبەخشی؟

+ هەژارەکان بە چاوی خۆیان بینییان کە دەوڵەمەندەکان پێشبڕکێ دەکەن و ئەم لەو زیاتر دەبەخشێ و ئەو لەم زیاتر دەبەخشێ... بۆیە ئەوانیش جۆش و خرۆشیان بۆ پەیدا بوو... هەرچییان لە دەست بهاتایە دەیانبەخشی... بۆ نموونە:

ئەبوعەقیل دوو گوێل (واتە: کیلۆیەک یان کیلۆ و نیوێ) خورمای بەخشی... هەر ئەوەندەی لە تواناداا بوو...

عولبەی کوڕی زەید ئەو هەژارە تەنانەت یەک خورمای نەبوو بیبەخشێ... بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: قوربان من هیچم نییە بیبەخشم، بەڵام لە هەموو مافێکی خۆم خۆش دەبم... هەر مافێکم لای هەرکەسێ هەیە گەردنی ئازابێ...

- ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرموو؟

+ بۆ بەیانی پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی ڕۆیشتە سەر مینبەر و فەرمووی: ئەوە کێ بوو دوێنێ لە مافەکانی خۆی خۆشبوو؟

عولبەی کوڕی زەید هەستا وتی: من بووم قوربان...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مزگێنیم بدەری خوای گەورە خێرەکەی لێ وەرگرتووی...

- یا ئەڵلا... ئای لەو گەلە پیرۆزە... ئای لەو چینە بەختەوەرە...

+ کورم! ئەوانە خوا خۆی هەڵیبژاردن بۆ ئەوەی ببن بە هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ)...

- ئای خۆزگەم بە خۆتان... پیرۆزت بێ قوربان جەنابت گەورەی ئەو چینە مرۆڤە پاکە هەڵبژاردەی...

+ خوا بتپارێزێ کورم...

- باشە قوربان با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان... کەواتە جەنابت کاتێ بووی بە خەلیفە هیچت نەبوو...

+ بەڵێ وایە هیچم نەبوو...

- ئەی قوربان چۆن ماڵ و منالت بەخێو دەکرد؟

+ کاتێ بووم بە خەلیفە، سەرەتا ڕۆژانە دەچوومە بازاڕ و بایی ئەوەندەی بتوانم ماڵ و منالی پێ بەخێو بکەم، کڕین و فرۆشتنم دەکرد... دوایی دەگەڕامەوە و کاروباری خەڵکم ڕایی دەکرد... ڕۆژێک هەندێ کەلوپەلم لەسەر شان بوو، دەمەویست بڕۆم بۆ بازاڕ و بیانفرۆشم... لە ڕێگا گەیشتم بە عومەری کوڕی خەتتاب و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح... پێیان وتم: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

وتم: دەمەوێ بچمە بازاڕ ئەم شتومەکانە بفرۆشم...

وتیان: تۆ هەم خەلیفە بی و کاروباری خەڵکی ڕایی بکەیت و هەم کڕین و فرۆشتنیش بکەی؟

وتم: دەی خۆ ماڵ و منالم نامرێنم لە برسا... ئەی چی بکەم؟

وتیان: وەرە با شتێکت بۆ دیاری بکەین...

منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتمەوە و ساڵانە بڕی دووسەدوپەنجا دیناریان وەک مووچە بۆ دیاری کردم... وشترێکیشیان پێدام بۆ ئەوەی ڕۆژێک نە ڕۆژێک ماڵ و منداڵەکانم بیدۆشن و شیرەکەی بخۆن، بەڵام ئەو مووچەیە بەشی نەدەکردم... بۆیە جار جارە دەچوومەوە بازاڕ و کڕین و فرۆشتنم دەکرد...

- ئەی قوربان دوایی چی ڕوویدا؟ بەردەوام بووی لە کڕین و فرۆشتن؟

+ ڕۆژێک عومەر هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە... دەبینێ هەندێ ژن لە بەردەرگای ماڵی ئێمەدا دانیشتوون و چاوەڕێی منن بگەڕێمەوە و کاروباریان بۆ ڕایی بکەم...

عومەر پێی وتن: کارتان چییە لێرە؟

وتیان: دەمانەوێ خەلیفە ببینین، هەندێ کارمان پێیەتی...

عومەر گەڕا بە دوای مندا... منی نەدۆزیبوویەوە... هاتە بازاڕ... لەوێ چاوی بە من کەوت... دەستی منی گرت و وتی: ئا وەرە کارم پێتە...

منیش وتم: لێمگەڕێ ئیتر خەلیفایەتی ناکەم... مووچەکەم بەشم ناکا... ماڵ و منداڵم برسین...

عومەر وتی: مووچەکەت بۆ زیاد دەکەین...

وتم: سێسەد دینار و وشترێکم دەوێ...

وتی: نەخێر... ئەو مووچەیە زۆرە...

ئا لەو کاتەدا عەلی کوڕی ئەبوتالیب پەیدا بوو... ئێمە لەسەر مووچە کێشەمان بوو... عەلی وتی: عومەر بیدەرێ بە خوا ئەو مووچەیە زۆر نییە...

عومەر بە عەلی وت: یانی تۆ پێتباشە بیکەین بە سێسەد؟

عەلی وتی: بەڵێ...

منیش وتم: کاکە ئێوە دوو کەسن... با ڕای ئەوانیتریش وەربگرم بزانم ڕازین یان نە؟

گەڕامــەوە بـۆ مزگـەوت و ڕۆیشـتمە سـەر مینبـەر... خەڵکـی لێـم کۆبوویـەوە... وتـم:

خەڵکینـە... مووچەکـەم دووسـەدوپەنجا دینـار و نیـو وشـترە... عەلی و عومـەر بۆیـان کردم بە سێسـەد دینـار و وشـترێک... ئێوە ڕازین؟

هەمووان وتیان: بەڵێ بە خوا ڕازین...

-قوربان تۆ خۆت خەلیفە بوویت و خەڵک مووچەی بۆ دیاری دەکردی؟

+ ئـەی چـۆن کـوڕم... ئـەو سـەروەت و سـامانە هـی حکومـەت و خەڵـک بـوو، خـۆ هـی مـن نەبـوو... مـن کاری ئـەوەم پـێ سـپێرابوو کە خزمەتـی خەڵـک بکـەم... بۆم نەبـوو دەسـت لـە سـامانی حکومـەت وەربـدەم... تەنیـا ئەوەنـدە نەبـێ کـە خەڵـک پێـی ڕازیبـن...

ئەگـەر تـۆ کرێکارێـک بـە کـرێ بکـری و کرێکـەی بـۆ دیـاری بکـەی، دەتوانـێ لـەوە زیاتـر ببـا؟ ئەگـەر تـۆ خـۆت زیادەیەکـت پێدا ئـەوە شـتێکی تـرە و خوایـش پێـی خۆشـە...

- ڕاسـتە قوربـان بەڵام خـۆ تـۆ خەلیفـە بووی...

+ بـا خەلیفـەش بـم... خەلیفـە بـم یـان کارمەندێکـی سـادە، تەنیـا ئـەو مووچەیـەم پـێ ڕەوایـە کـە قانـوون دیـاری دەکات...

- بـەڵام خـۆ تـۆ خـۆت دەتوانـی ئەوەنـدەی کـە خـۆت پێـی ڕازی بیـت مووچـە بـۆ خـۆت دیـاری بکـەی...

+ مـن تەنیـا داوا دەکـەم... ئیتـر ئـەوان پەسـەندی بکـەن یـان نـە ئـەوە کاری مـن نییـە... مـن هەرگیـز خـۆم مووچـە بـۆ خـۆم نابڕمـەوە...

- بـە خـوا قوربـان کارێکـت کـردووە ئەوانـەی دوای خـۆت سـەخڵەت کـردووە و هیچیـان پـێ ناکـرێ...

+ کـوڕم ئـەوە ڕاسـتییەکەیە کـە بـۆم بـاس کـردی... تـۆ دەتـەوێ لـە کۆتایـی ژیانمـدا ماڵـی خەڵـک بخـۆم و کاتـی مردنـم قـەرزاری خەڵـک بـم و خەڵکـی لێـم نـاڕازی بـن؟

**- نەوەڵڵا بە خوا قوربان مەبەستم ئەوە نەبوو... تەنیا مەبەستم ئەوە بوو کە هەموو شتێک بە دەست خۆت بوو...**

**+ ئەوەی کە بە دەستی منەوە بوو هی ئەوان بوو، نەک هی خۆم... ئەوە ئەمانەت بوو... نابێ منیش خیانەت لە ئەمانەتا بکەم...**

**- ڕاست دەفەرمووی قوربان... ئەبوبەکر چۆن خیانەت لە ئەمانەت دەکا...**

❀ ❀ ❀

- باشە قوربان دەمەوێ بزانم ئەو باسە چییە کە گوایە جەنابت ئاژەڵت بۆ خەڵکی دۆشیوە؟

+ من پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفات بکات و ببم بە خەلیفە، بەناو شاری مەدینەدا دەگەڕام و ئاژەڵم بۆ پیر و پەککەوتەی مەدینە دەدۆشی... مەبەستیشم تەنیا ڕەزامەندی خوای گەورە بوو...

کاتێ بووم بە خەلیفە پیرەژنێک وتبووی: ئیتر ئاژەڵەکانمان بۆ نادۆشێ...

منیش ئەو قسەیەم بیستەوە... وتم: سوێند بێ بە گیانی خۆم بۆیان دەدۆشم... هیوادارم ئەم بەرپرسیارەتییە نوێیە نەمگۆڕێ و وەک خۆم بمێنمەوە... لەو ڕۆژە بە دواوە وەک جاران ئاژەڵم بۆ ئەو پیر و پەککەوتانە دەدۆشی...

- باشە قوربان قەیناکە پێش ئەوەی ببی بە خەلیفە ئاژەڵت بۆ خەڵکی دەدۆشی، بەڵام دوای ئەوەی بووی بە خەلیفە، چۆن دەبێ خەلیفە ئاژەڵی خەڵک دۆشێ؟ ئەوە عەیبە نییە بۆ سەر شانی خەلیفە؟

+ کێ وتوویەتی یارمەتیدانی پیر و پەککەوتە و خەڵک بە گشتی عەیبەیە؟ نەخێر کوڕم بە پێچەوانەوە هەرکەسێ خزمەتی خەڵک

بکا بە تایبەت چینی هەژاران و پەککەوتوان و ئەوانەی کە جگە لە خوا هیچ کەسێکی تریان نییە، ئەوە نەک هەر عەیبە نییە، بەڵکوو سەربەرزییە...

- ئاخر قوربان تۆ خەلیفەی خەلیفە؟ سەرۆکی حکومەتی؟

+ دەی گوێ بگرە با پێت بڵێم: پێش ئەوەی ببم بە خەلیفە ئەو کارە لەسەر من واجب و پێویست نەبوو، بەڵکوو خۆم بۆ ئەوەی زیادە خێرێکم دەست بکەوێ ئەو کارەم دەکرد، بەلام دوای ئەوەی بووم بە خەلیفە و خەڵکم کەوتە ژێر دەست، ئەو کارە بوو بە واجبی سەرشانم و پێویستە جێبەجێی بکەم... لە پەسلاندا خوای گەورە لەسەر ئەو خەڵکە لێکۆڵینەوەم لێ دەکات... ئەی نابێ باری ئەولا سووک بکەم و خۆم تووشی ڕووزەردی نەکەم؟

- ئاخر قوربان با ئەو کارەت بە کەسێکی تر بسپاردایە...

+ زۆر سەیری کوڕم... خوای گەورە دەرگای خێری لە من کردبوویەوە، خۆم بە دەستی خۆم کلیلم لێ بدایە؟ بە خوا هەڵەی وا ناکەم...

- قوربان وا دیارە دەبێ دووبارە بڵێم: ئەوانەی دوای خۆت سەخڵەت کرد... کەس وەک جەنابتی پێ ناکرێ...

+ کوڕم... پەندێکی عەرەبی دەڵێ: (سید القوم خادمهم) واتە: گەورەی خەڵک، خزمەتکاری خەڵکە... خۆ من گەورەی خەڵکیش نیم، تاکێکم لەو خەڵکە و خزمەتکاری خەڵکم...

- باشە قوربان... ئەی گەورەم چیرۆکی پیرەژنە کوێرەکە چۆنە؟ پێمخۆشە لە زاری خۆتانەوە بیبیستم...

+ عومەری کوڕی خەتتاب هەستی بەوە کردبوو کە من بەیانیان لەگەڵ شەبەقی بەیانیدا دەچم بۆ پەڕی شاری مەدینە... خۆم دەکەم بە کۆخێکدا و کەمێک دەمێنمەوە و دواتر دێمە دەرەوە...

ئەو نەیدەزانی ئەو کوخە چی تێدایە... نەیدەزانی من بۆچی دەچمە ئەوێ... ئەو بە هەموو کارە چاکەکانی منی دەزانی، بەڵام سەری لەو کوخە دەرنەدەکرد... عومەر بڕیاری دا ڕۆژێک دوای ئەوەی من لەوێ دێمە دەرەوە، ئەو بچێتە ئەوێ بزانێ چی تێدایە و من بۆچی دەچمە ئەوێ؟

ڕۆژێک دوای ئەوەی من لە کوخەکە هاتمە دەرەوە عومەر ڕۆیشتە نێو کوخەکەوە... دەبینێ پیرەژنێکی تیایە پەکی کەوتووە و ناتوانێ لە شوێنی خۆی بجوولێ... لەگەڵ ئەوەشدا پیرەژنەکە کوێر بوو... عومەر هێندەی تر سەری سوورما... لە پیرەژنەکەی پرسی: دایە گیان ئەو پیاوە بۆچی هەموو بەیانییەک دێ بۆ ئێرە؟

پیرەژن وتبووی: کوڕم! ئەو پیاوە هەموو بەیانییەک دێ بۆ لای من و ناوماڵەکەم بۆ گسک دەدا و جلوبەرگەکانم بۆ دەشۆرێ و خواردنیشم بۆ ئامادە دەکات و دەڕوا... هەرچی لێی دەپرسم تۆ کێی؟ کەچی ئەو قسەم بۆ ناکا... بۆیە تا ئێستاش نازانم کێیە؟

لەو کاتەدا عومەر وتی: ئای ئەبوبەکر خەلیفەکانی دوای خۆت داوە لە هەتیتە... کەس وەک تۆی پێ ناکرێ...

- ئەی قوربان منیش عەرزم نەکردی ئەوانی دوای خۆت سەخڵەت کردووە و کەس وەک تۆی پێ ناکرێ؟

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کوڕم...

- باشە قوربان ئەو پیرەژنە کێ بوو؟ مەبەستم ئەوەیە خزمایەتیت لەگەڵیدا هەبوو؟

+ نەوەڵڵا کوڕم خزمم نەبوو... پیرەژنێکی کوێری پەککەوتە بوو... خوا نەبێ هیچ کەسێکی نەبوو... من زانیم کە داماوە و جگە لە خوا هیچ کەسێکی نییە، لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمە دەرگای خێرە و خوا بۆ منی کردووەتەوە و با لە دەست خۆمی دەرنەکەم...

- بە خوا لە دەست خۆتت دەرنەکرد قوربان... بەس قوربان پێم بڵێ: بۆ خۆت کارەکانت بۆ دەکرد؟ بۆ کەسێکت ڕانەسپارد لەجیاتی تۆ ئەو کارە بکات؟

+ ئەم پرسیارەت دووبارەیە کوڕم... ئەوە خێرێک بوو خوا هێنابوویە سەر ڕێگام، بۆ لە کیسی خۆمم بدایە... بۆ خۆم ئەو هەلە نەقۆزمەوە و خۆم تووشی ئەو خێرە گەورەیە نەکەم؟

- بمبوورە قوربان... باشە دێمە سەر پرسیارێکی تر...

+ باشە کوڕم! پرسیاری خۆتە بکە...

- قوربان چیرۆکی نێوان جەنابت و جابری کوڕی عەبدوڵڵا و سەروەت و سامانی بەحرەین چییە؟

+ کاتی بووم بە خەلیفە لە بەحرەینەوە هەندێ سەروەت و سامانمان بۆ هات... منیش وتم:

کێ لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەڵێنی شتێکی پێ دراوە با بێ پێی بدەم...

جابری کوڕی عەبدوڵڵا هات وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنێکی بە من داوە...

منیش وتم: چ بەڵێنێک؟

وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر سەروەت و سامانی بەحرەینمان بۆ هات ئەوەندە و ئەوەندەت پێ دەدەم... بە هەردوو دەستی ئاماژەی ئەوەی کرد کە بەڵێنی گوێلێکی پێ داوە...

منیش وتم: دەی پڕ بە هەردوو دەستەکانی خۆت هەڵگرە و بیبە...

ئەویش گوێلێکی هەڵگرت و بردیە ئەولاوە و... دوایی ژماردی پێنج سەد دینار بوو...

دووبارە بانگم کردەوە و وتم: وەرە ئەوەندەی تر ببە...

بەوجۆرە هەزار دیناری برد و ڕۆیی... دواتر پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنی هەرشتێکی بە هەر کەسێک دابوو بانگم کرد و ئەوەندەی ئەو بەڵێنەم پێ بەخشی کە پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنی پێ دابوو...

- یانی قوربان جەنابت دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنەکانی ئەوت جێبەجێ کرد؟

+ ئەی ئەگەر بەڵێنەکانی ئەو جێبەجێ نەکەم، هی کێ جێبەجێ بکەم؟

- وەڵڵا ڕاستە قوربان... بەڵێنی ئەو لە هی هەموو کەسێک شیاوترە بۆ ئەوەی جێبەجێی بکەی...

+ دەی کوڕم با بزانم پرسیارت ماوە؟

- بەڵێ قوربان هێشتا ماومە...

+ دەی پرسیاری خۆت بکە...

- باشە قوربان... ڕاستە دەڵێن: جەنابت سەربازانی غەزای بەدرت بە هیچ جۆرێک نەکردووە بە بەرپرس؟

+ ئەرەوەڵڵا ڕاستە کوڕم...

- بۆچی قوربان؟

+ ئەوانە لای من زۆر خاوەن ڕێز بوون... پڕ بە دڵ ڕێزم لێ دەگرتن... پێمخۆش نەبوو ببنە بەرپرس و ئاوێتەی کاروباری دونیایی ببن...

- مەبەستت چییە قوربان؟

+ کوڕم... زۆر جار بڕیاردان ئیجتیهاد و ڕادەربڕینە... مامەڵەکردنە لەگەڵ خەڵکدا... وەرگرتن و بەخشینە... هەڵە و پێکانە... من ئەوەندە ئەوانەم بە لاوە گەورە بوو دەمەویست لەو شتانە بەدوور بن...

- بەڵام خۆ قوربان جەنابت حەزرەتی عومەرت کرد بە کاربەدەست... خۆ حەزرەتی عومەر وەزیری جەنابت بوو...

+ دەی توخوا کێ پێویستی بە عومەر نییە؟ کورە کورم من کاتێ ئوسامە دەیەویست سوپاکەی بجووڵێنێ داوام لێ کرد عومەر نەبا و لای من بەجێی بهێڵێ بۆ ئەوەی یارمەتی من بدا... عومەر وەک هیچ کەسێکی تر نییە... کەس ناتوانێ شوێنی عومەر پڕ بکاتەوە... ئێ پەندێکی عەرەبیش دەڵێ: ما لا یتم الواجب الا بە فهو واجب... واتە: هەرشتێ بەبێ ئەو واجبێکی پێ تەواو نەبێ، ئەوا خودی ئەو شتەش دەبێ بە واجب... مەسەلی والیەتی شارەکان و باج و خەراج و کۆکردنەوەی زەکاتیش ئەوە شتێکی تر و باسێکی ترە...

- باشە قوربان تێگەیشتم... ئەی قوربان چیرۆکی ئەوە چییە کە جەنابت لە بارەی والی شاری مەککەوە پرسیارت لە خەڵکی کردبوو؟

+ یەکەم ساڵ کە بووم بە خەلیفە داوام لە عومەری کوڕی خەتتاب کرد کە ببێ بە سەرقافلی حەج... ساڵی داهاتوو خۆم بووم بە سەرقافلە... کاتێ ڕۆیشتمە ناو شاری مەککەوە لە خەڵکەکەم پرسی: هیچ کەسێ سکالایەکی هەیە بیکا؟ کەس نەهات و سکالا تۆمار نەکرا و هەمووان بە باشی باسی والی مەککەیان کرد...

- قوربان ئەو ساڵە کێ والی مەککە بوو؟

+ عەتتابی کوڕی ئوسەید والی بوو...

- قوربان هەڵبەت متمانەت پێ نەبووە؟

+ نا وانییە... ئەگەر متمانەم پێی نەبوایە نەمدەکرد بە والی...

- ئەی بۆچی لە خەڵک دەپرسی کە چۆنە و چۆن نییە؟

+ ئەوە ئەرکی سەرشانی من بوو... دەبوو لە والییەکان بپرسمەوە... دەبوو خۆم ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵکدا قسە بکەم... من بەرپرسی هەمووان بووم... ئەگەر کەسێ ستەمی لە کەسێ بکردایە چی وەڵامی خوای گەورەم بدایەتەوە؟

- ڕاست دەفەرمووی قوربان...
+ بژیت کوڕی خۆم... دەی بزانم پرسیاری ترت هەیە؟
- ئەرەوەڵڵا قوربان هەمە...
+ دەی پرسیاری خۆت بکە...
- چیرۆکی ئەو ژنەی نەزر و پێویستی کردبوو لەسەر خۆی کە بەبێ ئەوەی یەک وشەی لە دەم بێتە دەرەوە حەج بکات... ئەو چیرۆکە چۆن بوو؟
+ ئەو ژنە لە تیرەی (ئەحمەس) بوو... ناوی زەینەب بوو... لە حەج بینیم هیچ قسەی نەدەکرد... منیش پرسیم وتم: ئەوە بۆ قسە ناکەیت؟
وتی: نەزرم کردووە لەسەر خۆم کە لە حەجدا هیچ قسەیەک نەکەم...
منیش پێموت: نەزرەکەت بشکێنە و قسە بکە... ئەو نەزرەی تۆ هەر دروست نەبووە... ئەو کارە لە کاری سەردەمی نەفامی دەچێ...
ژنە هاتە قسە و لێی پرسیم: تۆ کێی؟
منیش وتم: پیاوێکی کۆچەری (موهاجری)...
وتی: کام بەشەی کۆچەرییەکان؟
وتم: قوڕەیشیم...
وتی: چ بەشێکی قوڕەیش؟
وتم: کورە تۆ بۆ ئەوەنە پرسیار دەکەی؟ من ئەبوبەکرم...
وتی: دوای نەفامی تاکەی ئێمە ئاوا بە چاکی لەسەر ئەم ئایینە پاکە دەمێنینەوە کە خوای گەورە بۆی ناردووین؟
وتم: هەتا پێشەواکانتان باش و ڕێکوپێک بن...
وتی: پێشەواکان کێن؟
وتم: باشە مەگەر گەل و هۆزەکانی ئێوە گەورە و ڕیشسپییان نییە و ئێوە بە گوێیان ناکەن؟

وتی: با...

وتم: ئێ ئەوانەم مەبەستە[1]...

- باشە قوربان بۆ هەر لە سەرەتادا ناوی خۆتت پێ نەگوت؟

+ چ پێویستی دەکرد ناوی خۆمی پێ بڵێم؟

- وەڵڵا قوربان ئیتر ئەوەندە پرسیاری لێ نەدەکردی و زوو دەیبڕییەوە...

+ من دەمەویست ئەو نەزرە باتڵ و هیچەی خۆی بشکێنێ... ئیتر مەبەستم ئەوە نەبوو خۆم هەڵکێشم و بڵێم: من خەلیفەم...

- ئەی قوربان مەبەستت چیبوو لەوەی کە فەرمووت: هەتا پێشەواکانتان باش و ڕێکوپێک بن؟

+ مەبەستم ئەوە بوو کە خەڵک شوێنکەوتەی دەسەڵاتدارانن... ئەگەر دەسەڵاتدار پابەند بێت بە شەرعی خوای گەورەوە و پێش هەموو کەسێ خۆی شەرع جێبەجێ بکات، ئەوا خەڵکەکەش جێبەجێی دەکەن... هەرکاتیش وازیان لە شەرع هێنا و دەستیان دایە ناشەرعی، ئەوا ژێردەستەکانیش چاو لەوان دەکەن و دەست دەدەنە کاری ناشەرعی... بەو جۆرە هەمووان پێکەوە لە بەرنامەی خوای گەورە دوور دەکەونەوە...

- باشە قوربان با بێمە سەر پرسیارێکی تر...

+ فەرمووو...

- قوربان جەنابت فەرمایشتێکت هەیە فەرمووتە: بە خوا ئەو تووک و نەفرەتەی کە لە خۆی دەکرد لە دزییەکەی سەختتر بوو... چیرۆکی ئەو قسەیە چییە و چۆنە؟

+ ئەوە جارێک پیاوێکی یەمەنی دەست و پێ بڕاو هات بۆ

---

[1] وادیارە ئەو ژنە زۆر باش خۆی ناسیوە بۆیە نەزری کردبوو لە حەجدا قسە نەکات. وەرگێڕ.

لای من... سکاڵای لەسەر والی یەمەن تۆمار کرد و وتی: بە دزی تاوانباری کردوم...

ئەو پیاوە بە شەودا شەونوێژی دەکرد و منیش دەمبینی... بۆیە پێموت: بە سەری باوکت ئەو شەوانەی تۆ شەوی دز نییە...

دوای ماوەیەک هەندێ خشڵی ئەسمای کچی عومەیسی ژنی من، ون بوو... زۆر گەڕاین بە دوایدا... ئەویش لەگەڵ ئێمەدا دەگەڕا و دەیگوت: خوایە ئەو کەسە بگری کە دزی لەماڵێکی ئاوا چاک دەکات...

دوایی خشڵ و زێڕەکەمان لای زێڕینگەرێک دۆزییەوە... وتمان: ئەمەت لە کوێ بوو؟

وتی: پیاوێکی دەست و پێ بڕاو هێناویە و بە منی فرۆشتووە...

منیش هەستام و پیاوەکەم برد بۆ لای زێڕینگەرەکە... کابرای زێڕینگەر یەکسەر ئەوی ناسییەوە و وتی: ئەمە خۆیەتی...

کەچی ئەو پیاوە کە لە یەمەنەوە هاتبوو سکاڵای لەسەر والی ئەوێ تۆمار کرد کە گوایە بە ستەم دزییان داوەتە پاڵی دزێکی ناپۆڵا دەرچوو...

منیش پێمگوت: بە خوا ئەو توک و نەفرەتەی کە لە خۆی دەکرد لە دزییەکەی سەختتر بوو...

- قوربان مەبەستت چیبوو؟

+ مەبەستم ئەوەبوو کە ئەو پیاوە چۆن دەیوێرا ئاوا بە کوڵ تووک و نەفرەت لە خۆی بکا؟ ئێمە ڕێزمان لێ گرت... وامانزانی ستەمی لێ کراوە... کەچی دزی لە ئێمەش کرد و خۆیشی وەک پەپوولە پیشان دەدا و دەگەڕا بە دوای خۆیدا... بە کوڵ تووک و نەفرەتی لە دزەکەش دەکرد کە خودی خۆی بوو...

- پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە... هەندێ کەس چەندە چاوقایمن... چەندێ بێشەرم و ڕوون...

+ کورە تۆ بڵێ: پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەوەندە لەسەرخۆیە...

- قوربان با بێمە سەر پرسیارێکی تر...

+ فەرموو...

- چیرۆکی (ئەوە ئێوە لەسەر سوننەتی فارس و ڕۆم دەڕۆن؟) چییە؟

+ یەکێک لە سەرکردەکانی سوپای ڕۆم ناوی (بوونان) بوو... بوونان هەرکەسێکی مسوڵمانی بگرتایە سەری دەبڕی و سەرەکەی دەنارد بۆ قەیصەری پادشای ڕۆم... ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیی... لەنێوان سوپای مسوڵمانان و سوپای ڕۆم بوو بە جەنگ... (بوونان) کوژرا... عەمری کوڕی عاص و شەرەحبیلی کوڕی حەسەنە، سەری (بوونان)یان لە لاشەی جیا کردەوە و دایان بە عوقبەی کوڕی عامر و ناردیانەوە بۆ من... کاتێ عوقبە هات و ئەو سەرە بڕاوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا تەواو تووڕە بووم...

عوقبە وتی: ئاخر قوربان ئەوانیش وا بە ئێمە دەکەن...

منیش وتم: ئەوە ئێوە لەسەر سوننەتی فارس و ڕۆم دەڕۆن؟ پێویست ناکا کارێکی ئاوا ناڕەوا و دزێو بکەن... تەنیا هەواڵتان بۆ من ناردبا بەس بوو...

- دەی قوربان خۆ ئەوان تەنیا تۆڵەیان کردبوویەوە و خۆیان ئەو کارەیان دانەهێنابوو...

+ من خۆم ئەوە دەزانم، بەلام ئێمە دەبێ بە گوێرەی ئاکار و ڕەفتاری خۆمان مامەڵە بکەین، نەک بە گوێرەی ڕەفتار و ئاکاری ئەوان... ئەگەر ئەوان هیچ ئاکارێکی مرۆڤانەیان نەبێ، دەکرێ ئێمەش خۆمان وەک ئەوان لێبکەین؟ بێگومان نەخێر...

- وەڵلا ڕاست دەفەرمووی قوربان... دەی قوربان لەمبارەوە یەک پرسیار ماوە ئەگەر ئیزنم بدەی ئەو پرسیارەشت لێ دەکەم...

**+ باشە فەرموو کوڕم...**

**- چیرۆکی ئەو پیاوە چیبوو کە هات بۆ لای جەنابت و حەزرەتی عومەر و جەنابت لێتدا؟**

+ ئەوە ڕۆژێکی هەینی من وتارم بۆ خەڵکی خوێندەوە... لە کۆتایی وتارەکەدا وتم: بۆ سبەینێ زەکاتی وشترەکانتان ئامادە بکەن با لەنێوان هەژاراندا دابەشیان بکەین... ئەو زەکاتە زەکاتێکی زۆرە و بەشی هەژاران دەکات... کەسیش نەیەت بۆ لای من و عومەر تا بە تەواوی دابەشیان دەکەین... کەچی ژنێک بە مێردەکەی وتبوو: ئەو گوریسە ببە و بڕۆ بۆ لای ئەبوبەکر، بەڵکوو ئەمە خوایە خوا بیکا بە نسیبمان و ئەبوبەکر وشترێکمان پێ بدت و بەم گوریسە بیبەستەرەوە...

ئیتر کاتێ من بەئاگا هاتم پیاوێک لامدا وەستابوو... منیش لێی تووڕە بووم و وتم: ئەوە کێ تۆی کردووەتە ژوورەوە؟

دوایی گوریسەکەم لێ سەند و بە گوریسەکەی خۆی هەندێکم لێدا، بەڵام دوای ئەوەی وشترەکانمان دابەش کرد زۆر پەشیمان بوومەوە و لەناو خەڵکدا هاوارم کرد و وتم: کوا خاوەنی ئەم گوریسە لە کوێیە؟

پیاوەکە هات گوریسەکەی هەڵگرتەوە... منیش پێموت: کاکە گیان وەرە تۆڵەی خۆتم لێ بکەرەوە... چۆن من لە تۆم دا، ڕێک تۆش ئاوا لە من بدە...

عومەر وتی: سوێند بە خوا نابێ تۆڵەت لێ بکاتەوە... مەیکە بە داب و دەستوور... کاری مەکە هەرکاتێ خەلیفە لە دەستی دەرچوو هەڵەیەکی کرد، خەڵک لێیبدەن و ئیتر خەلیفە سام و هەیبەتی نەمێنێ و ببێ بە گاڵتەجاڕی خەڵکی...

منیش بە عومەرم وت: ئەی چیبکەم بۆ ڕۆژی پەسڵانم؟

عومەر وتی: کارێکی بۆ بکە با پێی خۆشبێ و گەردنت ئازا بکات...

منیش بە خزمەتکارەکەی خۆمم وت: وشترێکی بۆ ببە... دەستێ جلوبەرگی بۆ ببە... پێنج دیناریشی بۆ ببە...

پیاوەکە ئەو شتانەی وەرگرت و گەردنی منی ئازا کرد و بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان...

- بە خوا قوربان حەزرەتی عومەر ڕاستی فەرموو، ئەوە لەوە باشتر بوو کە تۆڵەی خۆی لە جەنابت بکاتەوە...

+ بە خوا کوڕم ئەگەر بەوە ڕازی نەبووایە دەبوو تۆڵەی خۆی بکاتەوە...

- پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە... تۆ ڕازیبووی بەوەی کە کەسێکی سادە تۆڵەت لێ بکاتەوە؟

+ ئەی مەگەر من دەستپێشخەریم نەکرد و لێم نەدا؟

- با، بەڵام ئەو خۆی هەڵەی کرد بێ پرس هاتە ژوورەوە و جەنابیشت تووڕە بووی... لێتدا و دواییش پەشیمان بوویتەوە...

+ بەڵێ ڕاست دەکەی سەرەتا ئەو هەڵەی کرد و بێ پرس هاتە ژوورەوە، بەڵام ئەوە نابێ بە بیانوو بۆ ئەوەی من لێی بدەم... ئەو پیاوە ئاتاج بوو... هاتبوو شتێکی پێ بدرێ... کەسی ئاتاجیش مافی خۆیەتی داواکاری خۆی بەرز بکاتەوە... جگە لەوەش ئەگەر من لەم دونیایەدا تۆڵەم لێ بکرێتەوە زۆر لەوە باشترە بکەوێتە ئەو دونیا و لە خزمەت خوای گەورە سکاڵام لەسەر تۆمار بکرێ...

- بە خوا قوربان من خۆم وتم: کەسانی دوای خۆت سەخڵەت کردووە و ئەوان وەک تۆیان پێ ناکرێ...

❀ ❀ ❀

- قوربان ئێستا پرسیارێکم لە دڵدایە، بەڵام بە خوا زۆر شەرم دەکەم ئەو پرسیارەت لێ بکەم و زۆریش حەز دەکەم وەڵامەکەی بزانم... بۆیە تووش بووم، نازانم چی بکەم؟ چۆن ئەو پرسیارەت لێ بکەم؟

+ پێویست بە شەرم ناکات کوڕم... پرسیاری خۆت بکە...

قوربان ئاخر نازانم چۆن بیڵێم و لە کوێوە دەست پێ بکەم... هەندێ کەسی نەخۆش و چەپەڵ هەندێ قسەی نەشیاویان دەرهەق جەنابت کردووە... تۆش زۆر لەوە گەورەتر و پاکتر و چاکتری کە ئەو قسانەت دەرهەق بکرێ... دەمەوێ پرسیاری ئەو شتانەت لێ بکەم... نەک لەبەر ئەوەی گومانم بەرامبەر جەنابت بۆ دروست بووە، بەڵکوو بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوە بدەن و خەڵکی تر دڕدۆنگ نەبن بەرامبەر بە جەنابت... ئەگەر ڕوونکردنەوەکان لە دەمی جەنابتەوە ببیسترێن زۆر لەوە کاریگەرترن کە من یان کەسێکی تر ئەو ڕوونکردنەوانە باس بکەین... بۆیە دیسان عەرزت دەکەم بە شەرمەوە ئەو پرسیارانەت لێ دەکەم...

+ دەی کوڕم شەرم مەکە و چیت لە دڵدایە بیڵێ... بە یارمەتی خوای گەورە منیش وەڵامی تێروتەسەلت دەدەمەوە و کارێ دەکەم دڵت ئاو بخواتەوە... ئەوەشت لە بیر نەچێ کە هەموو کەسێکی مەزن و بەناوبانگ کۆمەڵێک کەس ئێرەییان پێ بردووە و درۆیان بە دەمەوە هەڵواسیوە و قسەی نەشیاویان بەرامبەر کردووە... کورە هەندێ کەسی چەپەڵ قسەی نەشیاویان بەرامبەری خوای گەورە کردووە... ئەوەتا وتوویانە: -پەنا بە خوا- خوا دەستی قوچاندووە و ڕەزیل و پیسکەیە... ئای خوایە تەوبە... ئای خوایە پەنات پێ دەگرم...

جگە لەوەش هەندێ کەس وتوویانە -پەنا بە خوا- خوا منالی هەیە... خوایە تەوبە... من نەمگوتبێ قسەی ئەوان بێ...

کورم تۆ خۆت دەزانی خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترە ئەو قسانەی بدەنە پاڵ... کەچی ئەو چەپەڵانە ئاوا کوفر دەکەن و قسەی نەشیاویان لە دەم دێتە دەرێ...

قسەیان بە پێغەمبەری خوا وتووە... مەگەر نەیانگوت: پێغەمبەر شێتە؟ پێغەمبەر جادووگەرە؟ پێغەمبەر شاعیرە؟ درۆزنە؟

جا مادەم ناووناتۆرەیان بۆ خوا هەڵبەستبێ و شەرم لە خوا و پێغەمبەری خوا نەکەن، ئیتر من کێم؟

با شتێکت بۆ بگێرمەوە: جارێک حەزرەتی موسا داوای کرد لە خوای گەورە فەرمووی: خوایە! دەمەوێ زاری خەڵکی لە ئاستی مندا ببەستی و قسەی نەشیاوم پێ نەڵێن و درۆ و بووختانم بۆ هەڵنەواسن...

خوای گەورە فەرمووی: موسا! من ئەوەم بۆ خۆم نەکردووە، چۆن بۆ تۆی دەکەم؟

- ئای قوربان سڵاوی خوات لێبێ... دڵی منت ئاسودە کرد... بە خوا جەنابت کەسێکی لێزان و شارەزا و ژیر و گەورە و مەزنی قوربان...

+ خوا لێت ڕازی بێت کورم... دەی کێشە نییە چ پرسیارێکت هەیە بیکە... پشت بە خوای گەورە بۆ هەموو پرسیارێک وەڵامێکی شیاوم لایە...

- قوربان هەندێ کەسی دڵ نەخۆش و پیسکە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) سوپای ئوسامەی ڕێک خست و فەرمووی: وەڕێ بکەون... پاشان فەرمووی: نەفرەتی خوا لەو کەسە بێ کە لەگەڵ ئەم سوپایەدا ناڕوا...

**دوایی دەڵێن: نە ئەبوبەکر و نە عومەر و نە عوسمان لەگەڵ سوپاکەی ئوسامەدا نەڕۆیشتن...**

**قوربان وەڵامی جەنابت چییە؟**

+ یەکەم: پێغەمبەر(ﷺ) شتی وای نەفەرمووە... ئەوە درۆیە و بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەڵواسراوە...

دووەم: وەک پێشتر بۆم باس کردی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی سوپاکەی ئوسامەی ڕێک خست، بەڵام هێشتا سوپاکە لە کەناری شاری مەدینەدا ئۆردویان خستبوو و نەجوولابوون، پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد... لەو ماوەیەشدا کە پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش بوو، فەرمانی دا من بەرنوێژی بۆ خەڵک بکەم... ئیتر چۆن پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە لایەکەوە فرمانم پێ دەکات بەرنوێژی بۆ خەڵک بکەم و لەولاشەوە لەبەر ئەوەی لەگەڵ سوپاکەی ئوسامەدا نەڕۆیشتووم، نەفرەتم لێ دەکا؟ چ کەسێکی ژیر بڕوا بەم قسەیە دەکا؟

جگە لەوەش: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی کردبێ لەو کەسانەی کە لەگەڵ سوپاکەی ئوسامەدا دەرناچن، ئیتر چۆن لە کاتی نەخۆشییەکەیدا چەند جارێک دەهاتە مزگەوت و لەگەڵ ئێمەدا نوێژی دەکرد؟

چۆن لە لایەکەوە نەفرەتمان لێ دەکات و لە لایەکیشەوە دێت و لەگەڵمان نوێژ دەکات؟ ئەمە چەندی بە چەندە؟

ئەم درۆ و بووختانهەڵواسینە پێویست بوو کەسێک ژیرانە بیری لێ بکاتەوە و پاشان هەڵیواسی، بەڵام لە خوا بەزیاد بێت ئەوانەی کە خەریکی فاتوفیت و درۆ و بووختانن ئەوەندە دڵیان پڕە لە کینە، کە نە ژیرییان دەمێنێ، نە چاویان هیچ دەبینێ...

سێیەم: من و عوسمان هەر لە سەرەتاوە لە سوپاکەی ئوسامەدا بەشداریمان پێ نەکرابوو... پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ئێمەی نەخستە ناو

سوپاکەی ئوسامەوە، بەڵکوو ئێمەی دیاری کرد کە لەناو شاردا بمێنینەوە و ئاگامان لە کاروباری ناوشاری مەدینە بێ...

لەو کەسانەی کە تۆ ناوت بردن تەنیا عومەر بەشداری سوپاکەی ئوسامەی پێ کرابوو... ئەویش خۆی نەدزییەوە و ویستی لەگەڵ سوپاکەی ئوسامەدا بڕوا، بەڵام کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و من بووم بە خەلیفە زۆر پێویستم بە عومەر بوو... بۆیە وەک پێشتریش بۆم باس کردی، خۆم بە تایبەت داوام لە ئوسامە کرد عومەر نەبات و بۆ منی بەجێ بهێڵێ، چونکە عومەر لە مەدینە زیاتری پێ دەکرا تا ئەوەی سەربازێکی سادەی ئوسامە بێ... ئەو کاتە کاتێکی ناسک بوو... منیش پێویستیم بە هێز و توانای عومەر بوو... ئەگەر من خۆم داوام نەکردایە، عومەر لەگەڵمدا بمێنێتەوە، بێگومان لەگەڵ ئوسامەدا دەڕۆیشت، بەڵام من کردم بە وەزیر و دەستەڕاستی خۆم، چونکە کەسێکی بەهێز و گورجوگۆڵ و دەم و دەست پاک بوو...

جگە لەوەش عومەر هیچ کاتێ لە هیچ غەزایەک دوا نەکەوتبوو... لە جەنگی بەدر، ئوحوود، خەیبەر، تەبووک و ڕزگارکردنی مەککەدا بەشدار بوو... ئەو جەنگانە هەموویان جەنگی پڕ مەترسی بوون و عومەر یەک چرکە دوا نەکەوت و هەرگیز سستی نەنواند...

- وەڵامێکی دەمکوتکەرە قوربان... پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەو هەمووە زانستەی پی بەخشیوی...

+ پاک و بێگەردی بۆ خوای مەزن... دەی بزانم کوڕم ئەو چەپەڵانە چیتریان وتووە؟

- قوربان وتوویانە: ئەبوبەکر فاتمەی کچی پێغەمبەری لە میراتی باخەکانی خەیبەر و فەدەک بێبەش کرد...

گوایە فاتمە بە جەنابتی وتووە: کوڕی ئەبوقوحافە! تۆ میراتی لە باوکت دەبەی، بەڵام من میراتی لە باوکم نابەم؟

دەڵێن: ئەبوبەکر بە بیانووی فەرموودەیەکەوە کە خۆی نەبێ کەسی تر ڕیوایەتی نەکردووە، فاتیمەی بێبەش کردووە، ئەبوبەکر دەڵێ: -گوایە- پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئێمەی چینی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێ، بەڵکوو هەرچیمان بەجێ هێشت دەکرێ بە خێر و صەدەقە!

کەچی قورئانی پیرۆز پێچەوانەی ئەوەی باس کردووە و خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾ النساء: ١١

واتە: خوا ڕێنوێنیتان دەکات و فەرمانتان پێ دەکات دەربارەی نەوەکانتان لە بارەی میراتگرتنەوە- ئەویش ئەوەیە کە- بۆ یەک نێرینە هەیە بە ئەندازەی بەشی دوو مێوینە.

خوای گەورە ئەم فرمانەی تایبەت نەکردووە بە گەلانی پێش ئوممەتی ئیسلام، بەڵکوو هەم بۆ ئەوانە و هەم بۆ ئێمەش... خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَوَرِثَ سُلَيۡمَٰنُ دَاوُۥدَۖ ﴾ النمل: ١٦ واتە: سولەیمان بووە میراتگری داود... باشە چۆن حەزرەتی سولەیمان میرات دەبا لە باوکی، بەڵام فاتمە میرات لە باوکی نابا؟

+ باشە کوڕم جوان گوێ بگرە با وەڵامت بدەمەوە...

یەکەم: فاتمە هەرگیز بە منی نەوتووە: کوڕی ئەبوقوحافە! تۆ میراتی لە باوکت دەبەی، بەڵام من میراتی لە باوکم نابەم؟

ڕاستی و دروستی چیرۆکەکە ئەمەیە بۆت دەگێڕمەوە...

دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فاتمە هات داوای میراتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد...

منیش پێموت: فاتمە... من خۆم گوێم لە باوکت بوو دەیفەرموو: ئێمەی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێ، هەرچیمان لێ بەجێما دەبێ بە خێر و صەدەقە...

فاتمە توورە بوو... بەو بڕیارەی من ڕازی نەبوو... منیش پێموت: من هەرگیز واز لە شتێک ناهێنم کە پێغەمبەر(ﷺ) کردبێتی... ئەو هەرچی کردبێ دەبێ منیش بیکەم، چونکە دەترسم ئەگەر وازم لە شتێک هێنا کە ئەو کردبێتی، ئەو کاتە من لە فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لامدابێ...

با وای دابنێین کە فاتمە بە منی وتبێ: کوڕی ئەبوقوحافە! تۆ میراتی لە باوکت دەبەی، بەڵام من میراتی لە باوکم نابەم؟

ئەو قسەیە نابێ بە پێوەر، باوکی من یەکێکە وەک هەموو ئەو خەڵکە و هیچ لەوان جیاواز نییە، بەڵام باوکی فاتمە جیاوازە... باوکی ئەو پێغەمبەری خوایە(ﷺ)... بە گوێرەی فەرموودەی خودی باوکی، فاتمە میراتی نەدەکەوت، چونکە ئەوەی لە پێغەمبەر(ﷺ) جێما دەبوو بە خێر و صەدەقە، نەک میرات...

جگە لەوەش، خۆ من ئەو شتانەی کە لە پێغەمبەر(ﷺ) بەجێما، نەمبرد بۆ خۆم، بەڵکوو پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرموبوو وام لێ کرد... منیش کردم بە خێر و خستمە ناو خەزێنەی گشتییەوە... بە خوا ئەگەر مافی فاتمە بووایە پێم دەدا و بەقەد سەرە دەرزییەک مافی فاتمەم نەدەخوارد... هەرچەند فاتمە لە لای من لە زۆرێک لەو خەڵکە بەڕێزتر بوو، چونکە کچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، بەڵام خۆ ناکرێ من لەبەر فاتمە خیانەت لەو هەموو خەڵکە بکەم و شتێ کە هی هەمووانە بیدەم بە فاتمە...

هەرچی لە بارەی ئایەتی: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾ النساء: ١١

واتە: خوا ڕێنوێنیتان دەکات و فەرمانتان پێ دەکات دەربارەی نەوەکانتان لە بارەی میراتگرتنەوە -ئەویش ئەوەیە کە- بۆ یەک نێرینە هەیە بە ئەندازەی بەشی دوو مێوینە.

ئەوە ئەو ئایەتە بە گوێرەی فەرموودەی خودی پێغەمبەر(ﷺ)، هەموو خەڵک دەگرێتەوە جگە لە پێغەمبەر(ﷺ)... خۆ دیارە فەرموودەی پێغەمبەریش(ﷺ) تەفسیر و ڕاڤەی قورئانی پیرۆزە... جاری وا هەیە ئایەتێک بە گشتی باس لە شتێک دەکات، کەچی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تایبەتی دەکات و ئەو مانا گشتییەی نامێنێ... ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ﴾ المائدة: ٣ واتە: مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەرازتان لێ حەرام و قەدەغە کراوە...

کەچی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:«أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ. الْمَيْتَتَانِ: الْحُوتُ وَالْجَرَادُ، وَالدَّمَانِ: الْكَبِدُ وَالطِّحَالُ»... واتە: خواردنی دوو مردارەوەبوو دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراوە... دوو مرداربووەکان بریتین لە ماسی و کوللە... دوو خوێنەکەش بریتین لە: جگەر و فاتەڕەش.

بە گوێرەی ئایەتەکە خواردنی هەموو جۆرێ مرداربوویەک و هەموو جۆرە خوێنێک حەرام و ناڕەوایە... کەچی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو مانا گشتییە ناهێڵێت و دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنی لێ جیا دەکاتەوە...

هەروەها لە هەموو قورئاندا بگەڕێی ئەوەت دەست ناکەوێ کە بەکارهێنانی زێڕ بۆ پیاو حەرام و ناڕەوا بێ، بەڵکوو بەپێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەرام کراوە... بابەتی میراتی پێغەمبەریش(ﷺ) وەک ئەوانە...

هەرچی لە بارەی ئەو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَوَرِثَ سُلَيۡمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾ النمل: ١٦ واتە: و سولەیمان بووە میراتگری داود... ئەوە ئەو میراتە بریتی بوو لە زانست و پێغەمبەرایەتی... نەک میراتی دینار و دیرهەم... ئەوەش بە بەڵگەی ئەوەی کە حەزرەتی داود جگە

لە حەزرەتی سولەیمان منالی تری هەبوو... ئیتر چۆن مەبەست لەو میراتە دیرهەم و دینار و سەروەت و سامانە؟

جگە لەوەش خۆ هەموومان دەزانین حەزرەتی داود کەسێکی زەنگین نەبوو... بە پێچەوانەوە کەسێکی هەژار بوو...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: «مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدَيْهِ وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عمل يَدَيْهِ» . رَوَاهُ الْبُخَارِيّ

واتە: هیچ کەسێک هیچ خواردنێکی نەخواردووە ئەوەندەی ئەو خواردنە باش بێ کە بە دەستی خۆی پەیدای کردووە... بەڕاستی داود پێغەمبەر -سڵاوی خوای لێبێ- لە بەرهەمی کار و دەستی خۆی دەخوارد.

هەرچی حەزرەتی سولەیمانیشە ئەوە هەم پێغەمبەر و هەم پادشا بوو... هەموو دونیای لە بەردەستا بوو...

با شتێکی تریشت بۆ زیاد بکەم و پێتبڵێم... ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێ: ئێمەی چینی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێ، بەڵکوو هەرچیمان بەجێهێشت دەکرێ بە خێر و صەدەقە! بە تەنیا من ڕیوایەتم نەکردووە، بەڵکوو هەندێ هاوەڵی تریش فەرموودەیەکی تریان ڕیوایەت کردووە کە زۆر لەم فەرموودەیە ڕاشکاوترە...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: «إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا، وَإِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ».

واتە: بەڕاستی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن... بەڕاستی پێغەمبەران دینار و دیرهەمیان لێ بەجێ نەماوە و نەبووە بە میراتیان، بەڵکوو زانست و زانیارییان لێ بەجێماوە و بووە بە میراتیان... جا هەر کەسێ لەو میراتییە ببا، ئەوە بەشێکی زۆری بردووە...

کەواتە تەفسیرکردن و لێکدانەوەی ئەو ئایەتە بەوەی کە حەزرەتی سولەیمان سەروەت و سامانی لە باوکیەوە بە میرات بردبێ، ئەوە تەفسیر و لێکدانەوەیەکی هەڵەیە و دژی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)... باشە بە چ عەقڵێک و بە چ پێوەرێک بڵێین: قورئان باسی میراتی پێغەمبەران دەکات، بەلام پێغەمبەر(ﷺ) پێچەوانەی ئەوە باس دەکات؟ باشە ئەو چەپەڵ و پیسکانەی کە ئەم درۆیەیان هەڵواسیوە لە پێغەمبەر(ﷺ) شارەزاترن؟ لەو باشتر لە قورئان تێدەگەن؟ یان ئەوەتا هەر دڵیان پڕە لە کینە و دەیانەوێ هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆمەتبار بکەن؟

- بە خوا قوربان هەر ئەوەیە ئەوانە دڵیان پڕە لە ڕق و کینە و دەیانەوێ ئێوەومانان تۆمەتبار بکەن...

+ دەی کوڕم پێمبڵێ: ئەو درۆزنانە چیتر دەڵێن؟

- وەڵڵا قوربان وتوویانە: ئەبوبەکر لە کاتی سەرەمەرگدا وتوویەتی: خۆگا دایکم منی نەبووایە... خۆزگە من دەنکە کایەک بوومایە لەناو خشتێکی قوڕدا... پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: هەموو ئەو کەسانەی کە دەکەونە ئاویلکەدان شوێنی خۆیان لە بەهەشتدا، یان لە دۆزەخدا دەبینن... بۆیە ئەبوبەکر وای وتووە، ئەوە شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دیوە...

+ بە خوا ئەوە هەمووی درۆ و بووختانە... من هەرگیز لە کاتی سەرەمەرگ و ئاویلکەدا شتی وام نەگوتووە... چیرۆکەکە ئاوایە کە بۆت دەگێرمەوە: کاتێ وەختی ئاویلکە و سەرەمەرگم نزیک بوویەوە و تینم بۆ هات و نارەحەت بووم، عایشەی کچم وتی:

بە خوا زێڕ و زیو هیچ ڕۆڵی نییە  کاتێ کە مرۆڤ وا لە ئاویلکەدا

منیش پێمگوت: وانییە کچم... وا مەڵێ، بەڵکوو بڵێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ١٩﴾ ق: ١٩ واتە: نارەحەتی و بێهۆشی

**ئاویلکەدان وا دیاری دا... هەر ئەوەشە کە تۆ نەتدەویست تووشی بی...**

**سەبارەت بە ئەوەیش کە گوایە من وتوومە: خۆزگایە دایکم منی نەبووایە... بەڵێ ئەوە ڕاستە من وام وتووە، بەڵام لە کاتی ئاویلکەدانا نا، بەڵکوو کاتێ ئەو قسەیەم کردووە کە هیچ نەخۆشییەکم نەبووە و تەواو بەهێز و گوڕ بووم... ئەو قسەیەیش تەنیا من نەمکردووە، بەڵکوو بە درێژایی مێژوو زۆرێک لە پیاوچاکان و شوێنکەوتوانی پێغەمبەران کردوویانە...**

ئەوەش لە ترسی ناخۆشی و نارەحەتی ڕۆژی پەسڵان ئەو قسەیە کراوە... وەک شەرمێک لە خوای گەورە... وەک ترسێکی مرۆڤ لەو ڕۆژە... وەک ترسێک لەوەی کە خوای گەورە بەزەیی بەو کەسەدا نەیەتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: کار و کردەوەی هیچکامتان ناتانباتە بەهەشتەوە...

وتیان: تۆش قوربان؟

فەرمووی: منیش... مەگەر خوای گەورە بمخاتە بەر سۆز و بەزەیی خۆی.

پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام (استغرالله)ی دەکرد و داوای لێبووردنی لە خوای گەورە دەکرد... دەی خۆ ناکرێ بڵێین: وەڵڵا ئەوە تاوانی زۆر بووە بۆیە زۆر داوای لێبووردنی لە خوا کردووە؟ چ مرۆڤێکی ژیر و بەویژدان قسەی وا دەکات؟

پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە... ئەو چەپەڵانە زۆر بێشەرمن و تەنانەت بەرامبەر خوای گەورە و میهرەبانیش شەرمیان نییە...

- وەڵڵا وایە قوربان... وەڵامەکەت زۆر لە جێی خۆی بوو گەورەم...

+ دەی پێمبڵێ بزانم ئەوانە چیتریان وتووە؟

- قوربان وتوویانە: پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانی خۆیدا بۆ هیچ شتێک ئەبوبەکری نەکرد بە جێگری خۆی، ئیتر چۆن دەیکا بە خەلیفە؟

+ پاک و بێگەردی بۆ خوای مەزن... ئەو قسە کۆکردنەوەیە لەنێوان نەزانی و درۆدا... خۆ هەمووان دەزانن کە لە ساڵی نۆی کۆچی دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای تەبووک گەڕایەوە، منی کرد بە سەرقافڵەی حەج... بۆ ساڵی دوایی خۆی بوو بەسەرقافڵە و ڕێنوێنی خەڵکەکەی کرد و ئەوە ئیتر کۆتا حەجی پێغەمبەر(ﷺ) بوو... ئەو حەجە بە (حەجیماڵئاوایی) ناوبانگی دەرکرد...

جگە لەوەش خۆ ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) منی نەکردووە بە والی و کاربەدەست، ئەوە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە من لای پێغەمبەر(ﷺ) نرخ و ڕێزم نەبووە... بە پێچەوانەوە... ئەوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێویستی بە من بووە... من وەک وەزیری پێغەمبەری خوا(ﷺ) وابووم... ئەمەش داب و نەریتی سەرکردە زانا و لێهاتووەکانە... سەرکردەی زانا هەمیشە ئەو کەسانە لای خۆی گل دەداتەوە کە ڕاوێژیان پێ دەکات و نایاننێرێ بۆ ئەملاولا، چونکە دەزانێ جێگەی ئەو جۆرە کەسانە بە کەسی تر پڕ نابێتەوە، بەڵام کار لەئەستۆگرتن ئەوە زۆر کەس هەن کە بتوانن وەئەستۆی بگرن...

دوای منیش کاتێ عومەر بوو بە خەلیفە، کەسانی وەک عوسمان و طەڵحە و زوبەیر و عەلی نەکرد بە وەزیر... خۆ لەبەر ئەوە نەبوو ئەوانە لێهاتوو نەبوون، بە پێچەوانەوە، عومەر ئەوانەی پێویست بوو، بۆیە ئامادە نەبوو ئەوانە لە خۆی دوور بخاتەوە...

- ڕاست دەفەرمووی قوربان...

+ دەی کوڕم پێمبڵێ: ئەو نەفامانە چیتریان وتووە؟

- دەڵێن: ئەبوبەکر وتوویەتی: ئەگەر من کارەکانم ڕاست بوون یارمەتیم بدەن، ئەگەریش خراپ بوو، ڕاستم بکەنەوە...

دەڵێن: دەبێ خەلیفە و سەرکردە ببێ بە تەواوکەری خەڵک و نەهێڵێ خەڵکی کل ببن و ڕێگای چەوت بگرنە بەر، نەک داوا لە خەڵکی بکا یارمەتی بدەن و نەهێڵن ڕێگای چەوت و لار بگرێتە بەر... دەبێ خەلیفە خۆی کامڵ بێ... ئیتر چۆن داوای ئەوە لە خەڵکی دەکا کە کاملی بکەن؟

- کورە ئەو قسەی ئەوانە پوولە سووتاویک ناهێنێ... بە خوا قسەکەی من ڕاستە... هەموو مرۆڤێک لە کاتی تووڕەییدا شەیتانێکی لەگەڵدایە دەیەوێ لە خشتەی ببا... جا هەرکاتێ زانیتان ئەو شەیتانە خەریکە بە سەرمدا زاڵ دەبێ، ئێوە خۆتانم لێ بپارێزن...

دیسان من وتم: لە هەر شتێکدا من گوێڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەرم(ﷺ) کرد، ئێوەش گوێڕایەڵی من بکەن... -خوانەخواستە- ئەگەر نافەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەرم(ﷺ) کرد، ئەوا ئێوە گوێڕایەڵی من مەکەن...

دەی بە خوا ئەم قسانە دەبێ وەک پەسنێک بۆ من باس بکرێ، نەک وەکو خوسپ...

کوڕم! من کە باسی زاڵبوونی شەیتانم کردووە، ئەوە نەک هەر من، بەڵکوو هەموو مرۆڤێک شەیتانێکی لەگەڵدایە، لە کاتی تووڕەبووندا ئەو شەیتانە دەیەوێ بەسەریدا زاڵ ببێ... من لەوە دەترسام ئەگەر تووڕە بووم، لە کاتی تووڕەییدا خۆم پێ نەگیرێ و ستەم لە کەسێک بکەم... یان قسەیەکی ناخۆش و نەشیاو بە کەسێک بڵێم... بۆیە پێموتن: لە کاتێکی ئاوادا خۆیان بپارێزن و لێم دووربکەونەوە، چونکە تووڕەیی کاری وا بە مرۆڤ دەکات، کە دوایی مرۆڤ خۆی لێی پەشیمانە... پێغەمبەری خودایش(ﷺ) فەرموویەتی: هیچ کەسێ لە کاتی تووڕەییدا لەنێوان دووکەسدا داوەری نەکات...

منیش ڕێک ئەوەم مەبەست بوو... لە کاتی تووڕەییدا داوەری لەنێوان خەڵکدا نەکەم... ئەوە من سوننەتی پێغەمبەرم(ﷺ) جێبەجێ کردووە... ئەوە من خەمی مسوڵمانانم بووە...

جگە لەوەش: هەموو مرۆڤێک شایانی ئەوەیە تووڕە ببێ... پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: خوایە من پەیمانێکم لە تۆ وەرگرتووە و نایشکێنم... بەڕاستی منیش مرۆڤم... ئەگەر ئازاری مسوڵمانێکم دا، یان جوێنم پێ دا، یان نەفرەتم لێ کرد، یان لێمدا، ئەوە بیکە بە پاکبوونەوە و گەشونمای بیروباوەڕی... بیکە بە هۆکاری نزیکبوونەوە لە خۆت... لە ڕۆژی پەسڵاندا لێت نزیک بێتەوە.

دەی ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) جارجار تووڕە بووە... ئیتر من کێم...

خوای گەورە باسی حەزرەتی موسا دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾ الأعـراف: ١٥٤

واتە: کاتێک تووڕەیی موسا هێور بووەوە، تابلۆکانی (تەورات)ی هەڵگرتەوە، کە لە توێیدا ڕێنموویی و ڕەحمەت و میهرەبانی تیادا دەدرەوشایەوە بۆ ئەوانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن و مەبەستیانە لێیان نەڕەنجێت.

ئەوەتا حەزرەتی موسا کە پێغەمبەرێکی گەورە بوو... گفتوگۆی لە خزمەت خوای گەورەدا دەکرد... تووڕە بووە... جا مادەم تووڕەبوون کەس ناناسێ و پێغەمبەرانیش تووڕەبوون، ئیتر کێشە لە چیدایە کەسێکی وەک منیش تووڕە ببێت؟ خۆ پلە و پایەی پێغەمبەرایەتی زۆر لە پلەوپایەی ئێمەمانان گەورەترە...

جاری وا هەیە شەیتان وەسوەسە بۆ مرۆڤ دروست دەکا بۆ ئەوەی کارێکی پێ بکا... ئەوە لە قورئانیشدا هەیە... ئەوەتا کاتێ

حەزرەتی موسا کابرا قیبتیەکەی کوشت فەرمووی: ﴿هَٰذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾﴾ القصص: ١٥ واتە: ئەمە کاری شەیتان بوو، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرا و گومڕا و ئاشکرایە...

کاتێکیش هاوڕێ گەنجەکەی حەزرەتی موسا لە بیری چوو باسی ماسییەکە بۆ حەزرەتی موسا بگێڕێتەوە و دواتر درەنگێ بیری کەوتەوە، چیرۆکەکەی بۆ حەزرەتی موسا گێڕایەوە و پاساوی بۆ خۆی هێنایەوەو وتی: ﴿أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ ۚ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾﴾ الكهف: ٦٣

واتە: ئەگەر لە بیرت بێت ئەو کاتەی کە چووینە سەر بەردە گەورەکە (بۆ حەوانەوە) من بیرم چوو باسی ماسیەکەت بۆ بکەم، کەسیش لە بیری نەبردمەوە شەیتان نەبێت، کە بۆتی باس بکەم، لە ڕاستیدا ئەو ماسییە (زیندوو بۆوە و) بە شێوەیەکی زۆر سەیر خۆی کرد بە ناو دەریادا.

خوای گەورە باسی حەزرەتی ئادەم و حەواش دەکات و دەفەرموێ: ﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ البقرة: ٣٦

واتە: شەیتان (فرسەتی لێ هێنان) و لە خشتەی بردن. (وای لێ کردن لە بەروبوومی درەختە قەدەغەکراوەکە بخۆن) و لەو شوێنە (خۆش و پڕ لە ناز و نیعمەتە) بە دەرکردنی دان.

جا کە وەسوەسەی شەیتان و دنەدانی شەیتان زیان لە پلە و پایەی پێغەمبەرایەتی نەدا، ئەوە بێگومان زیان لە پلە و پایەی خەلیفەش نادا، چونکە پێغەمبەران زۆر لە خەلیفەکان گەورەترن...

لە بارەی ئەوەشەوە کە من وتم: ئەگەر کاری باشم کرد یارمەتیم بدەن و ئەگەر کاری چەوتم کرد ڕێگام لێ بگرن و ڕاستم بکەنەوە...

ئەوە بە خوا ئەو قسەیە بۆنی خواپەرستی و دادگەری لێ دێ...

دەبێ هەموو بەرپرسێک چاو لە من بکات و ئەو قسەیەی من دووبارە بکاتەوە... دەبێ ئاپۆرای خەڵکیش بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ کاربەدەستدا بکەن... ئەگەر بەرپرس باش بوو یارمەتی بدەن... ئەگەریش ڕێگای ڕاستی ون کرد، پێی نیشان بدەنەوە و بیهێننەوە سەر ڕێگا...

سەبارەت بەوەش کە وتوویانە: پێشەوا و خەلیفە خۆی کامڵ بێ، چۆن داوا لە خەڵکی بکا کامڵی بکەن؟

ئەوە وەڵامی ئەمەیان لەوانی پێشووتر ئاسانترە... وەڵامەکەش چەند لقێکی لێ دەبێتەوە...

یەکەم: مانای وایە دەبێ خەلیفە و پێشەوا بە هاوکاری ئاپۆرای خەڵک خەریکی کاری خێر و چاکە بن... ببنە یارمەتیدەری یەکتر... کەوابوو دەبێ لە خێر و چاکەدا یارمەتی یەکتر بدەن، نەک بۆ کاری خراپە و تاوان... ئەم ئایینەش پێغەمبەر(ﷺ) تەواوی کردووە و کامڵ بووە، ئیتر شتێک نەماوەتەوە کە خەلیفە بیهێنێ و ئایینی پێ تەواو کامڵ بکات، بەڵام دەبێ لە بارەی هەندێ شتی نوێ و پێشهاتی تازەوە خەلیفە ئیجتیهاد بکات و ڕای خۆی دەرببڕێ... جا ئەگەر شتەکە ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەوا خەلیفە حوکمی پێ دەکات... ئەگەریش لای ئەو ڕوون و ئاشکرا بوو، بەڵام لای خەڵکی ڕوون و ئاشکرا نەبوو، ئەو کاتە دەبێ خەلیفە بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە... خۆ ئەگەر کارەکە لای خەلیفە و لای خەڵکیش ناڕوون بوو، ئەوا خەلیفە بە هاوکاری خەڵک کارەکە ڕوون دەکەنەوە و حوکمی پێ دەکەن...

جا ئەگەر کەسێکی ئاسایی پێش هەمووان ڕێگاچارەی دۆزییەوە دەبێ بڕوا بۆ لای خەلیفە و کاربەدەست و بۆی ڕوون بکاتەوە... ئیتر بەوجۆرە خەڵکی کارەکانی خەلیفە و کاربەدەست کامڵ دەکەن...

دووەم: هەموو دروستکراوێکی خوای گەورە بە دروستکراوێکی تر تەواو دەبێ... وەک مامۆستا و قوتابی... دوو کەس کە پرس و ڕاوێژ بە یەک دەکەن... دوو کەسی شەریک لە کاروباری دونیایی... کەوابوو خەڵکی هەموویان تەواکەری یەکترن...

سێیەم: زۆر جار قوتابی شتێک بیری مامۆستا دێنێتەوە و ئاگاداری دەکاتەوە... مامۆستاش سوود لەوە وەردەگرێ... خۆ دیاریشە قوتابی زانستەکەی لە مامۆستا وەرگرتووە، بەڵام کارەکە بەو جۆرەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾﴾ یوسف: ٧٦ واتە: لە سەرووی هەموو زانا و شارەزایەکەوە، زاناتر و شارەزاتر هەیە...

چوارەم: حەزرەتی موسا لە سێ جێگادا سوودی لە خضر وەرگرت، خۆ ئەوە بە مانای ئەوە نایەت کە موسا کامل نەبووە و پێغەمبەرایەتییەکەی ناتەواوی تیا بووە...

ئەوەش دەزانین کە پەپووسلێمانە بە حەزرەتی سولەیمانی وت: ﴿أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾﴾ النمل: ٢٢ واتە: ئەوەی من پێمزانیوە تۆ پێتنەزانیوە، من لە وڵاتی سەبەئەوە هەواڵێکی ڕاست و دروستم بۆ هێناویت!

خۆ ئەوە مانای وا نییە کە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی سولەیمان ناتەواو بێت و نوقسانی تیابێ...

پێغەمبەریش(ﷺ) پرس و ڕاوێژی بە هاوەڵان دەکرد... ڕای وەردەگرتن... جاری وا هەبوو وازی لە ڕا و بۆچوونی خۆی دەهێنا و ڕا و بۆچوونی کەسێکی تری وەردەگرت و کاری پێ دەکرد... وەک لە غەزای بەدردا شتێکی ئاوا ڕوویدا... حوبابی کوڕی مونزیر بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم شوێنە کە جەنابت کردوتە بە مزڵگا ئەوە خوای گەورە فرمانی پێ کردوی

کە ئێرە بکەی بە مەنزڵگا، ئەگەر وایە ئەوە ئێمە بۆمان نییە قسە بکەین، یان هەر بیروڕای خۆتە و خۆت پەسەندت کردووە و نەخشە و پلانی جەنگییە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر فرمانی خوا نییە و ڕا و بۆچوون و نەخشە و پلانی خۆمە...

حوباب وتی: دەی قوربان ئێرە بۆ ئەوەی ناشێ لێی دابنیشین...

دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ڕایەکەی حوبابی پەسەند کرد و ئێمەی گواستەوە بۆ ئەو جێگایەی کە حوباب دەستنیشانی کردبوو... دەی خۆ ئەوە نەبوو بە عەیبە بۆ پێغەمبەردایەتی پێغەمبەر(ﷺ)...

- ڕاست دەفەرمووی قوربان... بەڕاستی وەڵامەکانت وەڵامی دەمکوتکەر و جوان و ڕێکوپێک بوون... پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەو وەڵامە جوانانە دەخاتە سەر زمان و دەیکا بە بەڵگەی تۆکمە و بەهێز...

+ خوا ڕاوەستاوت بکا کوڕم... پێم بڵێ قسە و قسەلۆکی ئەوانە تەواو بوو، یان دیسان درۆی تریان هەڵواسیوە و قسەیان ماوە؟

- وەڵڵا قوربان بەداخەوەم... هەمتر ماوە...

+ دەی بزانم چی ماوە، با بە یارمەتی خوای گەورە وەڵامت بدەمەوە...

- قوربان ئەوانە دەڵێن: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا ﴾ التوبة: ٤٠ واتە: ئەگەر ئێوە پشتگیری پێغەمبەر(ﷺ) نەکەن و یارمەتی نەدەن، ئەوە بەڕاستی خوا پشتگیری کرد و سەری خست، کاتێک ئەوانەی بێباوەڕ بوون دەریان کرد لە شاری مەککە و یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک

هەردووکیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون (کاتێک بێباوەڕەکان گەشتبوونە دەوروبەری ئەشکەوتەکە ئەبوبەکری هاوەڵی خەمی لێهات) پێغەمبەریش(ﷺ) دڵی دایەوە و پێی وت: خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە، ئەوسا ئیتر خوا ئاسوودەیی و ئارامی خۆی دابەزاندە سەری و پشتگیری و بەهێزی کرد بە سەربازانێک کە ئێوە نەتاندەبینین.

ئەوان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئیمانی ئەبوبەکر و متمانەنەبوونی بە خوای گەورە و ڕازینەبوونی بە یەکسانی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)... یانی جەنابت ڕازی نەبووی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بمری... بە قەزا و قەدەری خوا ڕازی نەبووی...

+ ئەی خوا خەجاڵەتیان بکا بۆ ئەو درۆ گەورەیە... ئەی خوا موو لە زمانیان دەربکا... چ بووختانێکی گەورەیان بۆ من کردووە! کورە ڕۆڵە وەڵامدانەوەی ئەو درۆ و بووختانە زۆر ئاسانە... گوێ بگرە با پێتبڵێم:

یەکەم: ئایەتەکە هیچ بەڵگە نییە بۆ ئەو قسانەی ئەوان، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەو ئایەتە خۆشەویستترین ئایەتی قورئانە بە لای منەوە... قورئانە قورئان! هەتا ڕۆژی پەسڵان دەمێنێ و دەخوێندرێتەوە... ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە من هاوڕێی پێغەمبەر(ﷺ) بووم... ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە من دەڵم دەکەوتە خەتەرە و پێغەمبەر(ﷺ) دڵنەوایی منی دەدایەوە و دەیفەرموو: مەترسە خوامان لەگەڵە... بە خوا بە درێژایی مێژوو ئەوە خۆشترین و باشترین قسەیە کە هاوڕێیەک بۆ هاوڕێیەکی خۆی کردبێ...

دووەم: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە من خەمی پێغەمبەرم(ﷺ) بوو... خەمی ئەوەم بوو پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی

لێبێ و ئیتر ئەم ئایینە کۆتایی پێ بێت... من ئاواتم ئەوە بوو ئەو ڕۆژە خۆم بکەم بە قوربانی پێغەمبەر(ﷺ) و تیابچم، بەڵام ئەو شتێکی لێ نەیەت... بۆیە پێش ئەوەی بگەینە ئەشکەوتەکە من تاوێک لە پێشەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێم دەکرد... تاوێک لە دواوە... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بۆ وا دەکەی؟

منیش وتم: قوربان دەترسم یەکێک لە پێشەوە تیریکت پێوە بنێ، بۆیە دێم و پێشت لێ دەگرم... دوایی دەترسم یەکێک لە دواوە ڕمێکت تێ بگرێ، بۆیە دوا دەکەوم...

کاتێ گەیشتینە ئەشکەوتەکەش، پێش ئەوەی پێکەوە بچینە ژوورەوە، من بە پێغەمبەرم(ﷺ) وت: قوربان با سەرەتا من بچمە ژوورەوە، با ئەگەر ماری، دووپشکی، گەزەندەیەکی تیابوو من دەری‌بکەم و ئازارت پێ نەگەیەنن...

ئەو درۆیەش کە گوایە من لە مردن دەترسام و دەمەویست لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) نەمرم... ئەوە من بە هیچ شێوەیەک بووە ڕازی نەبووم کە پێغەمبەر(ﷺ) شەهید بکرێ و من بژیم، بەڵکوو من خۆم و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانم دەکرد بە قوربانی چرکەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)... ئەوە واجب و پێویستی سەرشانی هەموو تاکێکی مسوڵمانانە، چ جای من کە هاوڕێی و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووم...

هەرچی خەم و خەفەتەکەشم بوو، ئەوە بە خوا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بوو... نەک بۆ خۆم... ئەوە دەبێ وەک پەسن باس بکرێ، نەک وەکو خوسپ... ئەگەر ئەو ڕۆژە خەم و خەفەتم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نەخواردایە، بە خوا گومانم لە ئیمانی خۆم دەبوو...

سێیەم: ئەوەش کە وتوویانە گوایە من کەم حەوسەڵە و نائارام بووم، ئەوە قسەیەکی پووچ و بێ بنەمایە... دەقی قورئانی پیرۆز

و فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە بە مسوڵمانان ڕادەگەیەنن کە پشوودرێژ و بەحەوسەڵە بن... من چۆن پێچەوانەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەجوولێمەوە... ئەو خەم و خەفەتەش پێچەوانەی حەوسەلە و پشوودرێژی نییە... ئەوە دوو شتی لە یەک جیاوازن...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خوای گەورە لەبەر فرمێسک و خەم و خەفەتی نێو دڵ سزای هیچ کەسێک نادات، بەڵکوو لەبەر ئائەمە سزای خەڵک دەدا... پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بە زمان دا... کەواتە: خەم و خەفەت دژی پشوودریژی و حەوسەڵە نییە...

چوارەم: ئەو بووختانەی کە بۆ منیان کردووە، کە گوایە من متمانەم بە خوای گەورە نییە، بە خوا ئەوە تەنیا درۆ و بووختان زیاتر هیچیتر نییە... خۆ هەموومان دەزانین پێغەمبەرانیش -سڵاوی خوایان لێبێ- خەمباری ڕووی تێکردوون! خۆ ئەو خەمبارییە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەوان متمانەیان بە خوای گەورە نەبێ!

بۆ نموونە: حەزرەتی یەعقوب(ﷺ) لە دووری حەزرەتی یوسف(ﷺ) زۆر خەم و خەفەتی خوارد...

پێغەمبەری ئیسلامیش(ﷺ) دوای ئەوەی ئیبراهیمی کوڕی مرد، خەفەتی زۆری خوارد... چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک و فەرمووی: بەڕاستی چاوەکان فرمێسک دەرێژن و دڵ خەمبار دەبێ، بەڵام ئێمە قسەیەک ناکەین کە خوای گەورە پێی ڕازی نەبێ... سوێند بە خوا ئیبراهیم ئێمە لە دووری تۆ خەفەتبارین...

پێنجەم: ئەو بوختانەی کە کردویانە کە گوایە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی من بە قەزا و قەدەری خوای گەورە ڕازی نیم، بەو خوایە ئەوە درۆیەکی گەورەیە... من هەرگیز بۆ یەک چرکەش لە قەزا و قەدەری خوا ناڕازی نەبووم... من لە پێناوی خوای گەورە

لـە لایـەن کافرانـی قورەیشـەوە ڕووبـەڕووی زۆر ڕۆژی سـەخت و دژوار بوومـەوە... کاری وایان بـە مـن کـرد کـە کێو بەرگـەی ناگرێ، بەڵام بە خوا من خۆڕاگربووم و بۆ چرکەیەکیش لە قەزا و قـەدەر نـاڕازی نەبووم...

جگـە لـەوەش، خـۆ مـن خـۆم داوام لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـرد بمکا بە هاوڕێی خۆی و پێکەوە کۆچ بکەیـن... پێغەمبەریش(ﷺ) بە گەورەیی خۆی داواکەی منی پەسـەند کـرد و ئـەو شـانازییەی بە من بەخشی لەگەڵ ئەودا کۆچ بکەم...

خۆ من خۆم دەمزانی ئەو کۆچە چەندێ پڕ مەترسییە... دەمزانی ڕێگا چەندێ ناخۆشـە... دەمزانـی کـە ئەگـەر بگیرێـم و دەربـاز نەبـم سـزاکەم لـە کوشـتن و سـێدارە کەمتر نییە...

خـۆ شـتەکە ئـەوە نییـە بڵێـی لـە پـڕدا شـتێکم لـە دەسـت داوە... یـان کوڕێکـم مـردووە... مـن خـۆم بـە ڕەزامەنـدی خـۆم بـەرەو قـەزا و قـەدەری خـوا هەنـگاوم نـا... بـەو قـەزا و قـەدەرە ڕازی بـووم و شانازیشـم پێـوە دەکـرد...

- قوربان وەک هەموو جارانی تر وەڵامێکی دەمکوتکەر...

+ باشـە ڕۆڵـە... پیمبڵێ ئەو چەپەڵ و دڵپڕلەقینانـە بووختانی تریان کردووە؟

- بەڵێ قوربان... بەداخەوەم دیسان بووختان ماوە...

+ دەی پێم بڵێ بزانم چیتریان وتووە؟

- قوربـان دەڵێـن: ئەبوبەکـر بـە هەڵـە و تـاوان پێـش کـەوت بـۆ پێشـنوێژی، چونکـە کاتـێ بیـلال بانگـی فەرمـوو، عایشـە بـە نـاوی پێغەمبـەرەوە بـە کەسـێکی وتـووە: بـا ئەبوبەکـر پێشـنوێژی بـکات... دوای ئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) هۆشـی هاتووەتـەوە و گوێـی لـە دەنگـی ئەبوبەکـر بـووە، فەرموویەتـی: ئـەوە کـێ بەرنوێـژی دەکا؟ پێیـان

وتووە: ئەبوبەکر... فەرموویەتی: بمبەن بۆ مزگەوت... ئیتر عەلی و عەبباس ڕۆیشتوونەتە ژێر باڵیەوە و بردویانە بۆ لای میحراب و ئەبوبەکری لابردووە و خۆی بەرنوێژییەکەی کردووە...

+ پاک و بێگەردی بۆ خوای مەزن... ئەو درۆیە چەند درۆیەکی گەورەیە... چەندێ نەزانییەکی گەورەیە...

درۆکەیان ڕێک پێچەوانەی ڕووداوە ڕاستەقینەکەیە... کارەکە هیچ پەیوەندییەکی بە عایشەوە نەبوو... بە پێچەوانەوە عایشە هەر پێی خۆش نەبوو من بەرنوێژی بکەم... کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆن بە ئەبوبەکر بڵێن با بەرنوێژی بکات، عایشە بە پێغەمبەری وتبوو: ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە و ئەگەر پێشنوێژی بکا خۆی پی ناگیرێ و دەست بە گریان دەکات و ناتوانێ قورئان بخوێنێ...

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووبووی: بڕۆن بە ئەبوبەکر بڵێن با بەرنوێژی بکا بۆ خەڵک...

ئەمجارە عایشە بە حەفصەی وتبوو داوا لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات و خۆی چیی بە پێغەمبەر وت، حەفصەش هەمان شتی پێ بڵێ... دوای ئەوەی حەفصەش هەمان قسەکانی عایشەی دووبارە کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێوە دەڵێی ژنەکانی لای یوسف پێغەمبەرن(ﷺ)... بڕۆن بە ئەبوبەکر بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵک بکات...

نەزانینەکەشیان نەزانییەکی زۆر ناشیرینە... ئەوانە وا دەزانن من تەنیا بۆ یەک نوێژ بەرنوێژیم کردووە؟ نەخێر وانەبوو، بەڵکوو بە درێژایی نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر من بەرنوێژیم بۆ خەڵکی دەکرد... هەتا ئەو ڕۆژەش پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد هەر من بەرنوێژیم کرد...

- قوربان ئەم وەڵامەشت هەر وەکو ئەوانیتر دەمکوتکەر بوو...

+ بیوەی بی کورم... هیچیتر ماوە؟

- بەداخەوەم هێشتا ماوە قوربان...

+ دەی بیڵێ بزانم چییە؟

- دەڵێن: ئەگەر ئەبوبەکر بەخشندە بووایە، ئەوا خوای گەورە لە قورئاندا وەک حەزرەتی عەلی باسێکی ئەویشی دەکرد... ئەوەتا لە سورەتی (الانسان)دا خوای گەورە باسی بەخششی حەزرەتی عەلی دەکات، بەڵام لە هیچ ئایەتێکدا باسی لە بەخششی ئەبوبەکر نەکردووە...

+ دیسان درۆ و نەزانی پێکەوە گرێ دراون...

جارێ با باسی نەزانینەکەیان بکەم: ئەوانەی کە دەڵێن: خوای گەورە لە سورەتی (الانسان)دا باسی بەخششی عەلی دەکات، ئەوانە هیچ لە تەفسیر و ڕاڤەی قورئان نازانن و زۆر لێی بێئاگان، چونکە سورەتی (الانسان) سورەتێکی مەککییە... واتە لە شاری مەککە دابەزیوە. پێش کۆچ دابەزیوە... پێش ئەوەی عەلی ببێ بە زاوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و فاتمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) مارە بکات...

عەلی هەرچەندە پیاوێکی زۆر دلێر و بەئیمان و خۆشڕەفتار و زانا بوو، بەڵام خوای گەورە لە قورئاندا هەرگیز باسی بەخشندەیی عەلی نەکردووە، چونکە عەلی پیاوێکی زۆر هەژار بوو... ئەوەندەی نەبوو بتوانێ لێی ببەخشێ... کاتێکیش فاتمەی کچی پێغەمبەری (مارە کرد هیچی نەبوو بیکا بە مارەیی... تەنیا قەڵغانێکی جەنگی هەبوو لە ناچاریدا ئەو قەڵغانەی کردە مارەیی... دەی توخوا کەسی ئەوەندە هەژار بێ چۆن دەتوانێ ببەخشێ؟ چی ببەخشێ؟)

با بێمە سەر باسی درۆکەشیان: ئەو درۆیە گەورەترین درۆیە، چونکە بەدرۆخستنەوەی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)... جارێک لەنێوان من و عومەردا ناکۆکییەک ڕوویدا... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە منی نارد بۆ لای ئێوە

ئێوە وتتان: درۆ دەکەی...

ئەبوبەکر وتی: ڕاست دەکەی...

ئەبوبەکر بە ڕۆح و گیان و سەروەت و سامانەوە لە خزمەتمدا بوو...

ئێستا ئێوە دەتانەوێ واز لەم هاوڕێمە بێنن و وازی لێ بێنم؟

دەی توخوا چۆن پێغەمبەر(ﷺ) شایەتییەکی ئاوا مەزن بۆ من دەدات و ئەوان دەوێرن درۆیەکی ئاوا شاخدار دروست دەکەن؟

جگە لەوەش ئەی مەگەر من نەبووم لە مەککە بیلالم کڕییەوە و ئازادم کرد؟ مەگەر من نەبووم لە مەککە جگە لە بیلال چەند کۆیلەیەکی داماو و بێکەسی مسوڵمانبووم کڕییەوە و ئازادم کردن؟

مەگەر من نەبووم لە کاتی بەڕێخستنی سوپاکەی (جیش العسرة) هەموو سەروەت و سامانی خۆم بردە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و یەک دیرهەمم لە ماڵدا نەهێشتەوە؟

مەگەر ئەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) بە منی نەفەرموو: ئەبوبەکر چیت بۆ ماڵ و منالەکانت بەجێ هێشتووە؟

منیش وتم: خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

- خوا پاداشتت بداتەوە گەورەم... وەڵامەکەت دیسان دەمکوتکەرە...

+ ئادەی کوڕم بزانم ئەو درۆزنانە دیسان درۆی تریان کردووە، یان تەواو بوو؟

وەڵلا هێشتا ماوە قوربان...

+ دەی بیڵێ بزانم چییە؟

- قوربان دەڵێن: لە سەردەمی نەفامیدا ئەبوبەکر مامۆستای منالە وردە بوو... لە کاتی ئیسلامیشدا بەرگدروو بوو... کاتێکیش بوو بە خەلیفە زۆربەی مسوڵمانان پێیان ناخۆش بوو...

+ ئای لەو درۆیە ... ئەگەر ڕاستیش بووایە هیچ عەیبەیەکی تیا نەبوو... من لە سەردەمی نەفامیدا بازرگان بووم... لە سەردەمی ئیسلامیشدا هەر بازرگان بووم... با وای دابنێین من لە سەردەمی نەفامیدا مامۆستای منداڵەوردە بووم، ئەوە چ عەیبەیەکی تیایە؟ با وای دابنێین من لە سەردەمی ئیسلامدا بەرگدروو بووم، ئەوە چ عەیبەیەکی تیایە؟

بەڵام ئەوانە ئەوەندە دڵیان پڕە لە کینە کە بیر لە سەروبەری درۆکەی خۆیان ناکەنەوە... وا دەزانن پیشەگەری عەیبە و تاوانە... ئیتر نازانن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: زەکەریا پێغەمبەر(ﷺ) دارتاش بوو...

خۆ دارتاشی نەبووە عەیبە و لە شان و شکۆی ئەوی کەم نەکردەوە...

دەی ئەگەر منیش مامۆستای منداڵان بم هیچ لە شان و شکۆم کەم ناکاتەوە...

جگە لەوەش پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: داود پێغەمبەر(ﷺ) بەرهەمی کاری دەستی خۆی دەخوارد...

حەزرەتی داود زرێی دروست دەکرد و دەیفرۆشت...

خوای گەورەش لە قورئاندا باسی دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ ﴿٨٠﴾﴾ الأنبياء: ٨٠

واتە: هەروەها ئێمە داودمان فێری دروستکردنی زری و قەڵغان کرد، تا لە توندوتیژی کاتی شەڕ بتانپارێزێت، ئایا (لە بەرامبەر ئەم هەموو ناز و نیعمەتاندا) ئێوە سوپاسگوزار دەبن؟

بۆیە ئەگەر منیش بەرگدروو بوومایە ئەوە هیچ لە شان و شکۆی من دانابەزێنێ و کارکردن خێرە و خوای گەورەش پێی خۆشە...

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە من بازرگان بووم... کاتێکیش بووم بە خەلیفە ویستم دەست لە بازرگانی هەڵنەگرم بۆ ئەوەی بتوانم ماڵ و منداڵی خۆم بەخێو بکەم، بەڵام وەک پێشتریش بۆم باس کردی، ڕای هەندێ لە هاوەڵان وابوو کە واز لە بازرگانی بێنم و خۆم یەکلا بکەمەوە بۆ کاروباری خەڵکی و بۆ ئەوەیشی بتوانم ماڵ و منداڵم بەخێو بکەم، مووچەیەکم بۆ دیاری بکرێت... دەی ئەمە چ عەیبەیەکی تیایە؟

- بە خوا قوربان هیچ عەیبەی تیا نییە، بەڵام ئەوانەی ڕقلەدڵن لە دڵی ڕەشی خۆیانەوە دەڕواننە دەوروبەر...

+ ڕاست دەڵێی کوڕم... دەی ئێستا پیمبڵێ هیچیتر ماوە یان نە؟

- نا قوربان من هەر ئەوەندەم بیستووە... لەوە زیاترم نەبیستووە...

+ دەی باشە کوڕم... من ئەوانە هەواڵەی لای خوا دەکەم و لە ڕۆژی پەسلاندا لای خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) سکاڵایان لەسەر تۆمار دەکەم...

❀ ❀ ❀

- قوربان ئێستا لە ماڵئاواییکردن نزیک بووینەتەوە... گەیشتن بە جەنابت ئەوەندە شیرینە مرۆڤ تێری لێ ناخوا... قسەکانت هێندە خۆشن مرۆڤ حەز بە تەواوبوونیان ناکات، بەڵام وا خەریکە خۆر ئاوا دەبێ... هەموو شتێکیش کۆتاییەکی هەیە... تەنانەت ژیانیش کۆتایی هەیە...

+ ڕاستە کوڕم وایە... ئەوە سوننەتی خوای گەورەیە و دەبێ وابێ... دوای هەموو ساغی و سەلامەتییەک نەخۆشی هەیە...

دوای هەموو پێکگەیشتنێک فیراق و لێکدابڕان هەیە... دوای هەموو ژیانێکیش مردن هەیە...

- دەی قوربان با بێمە سەر باسی مردن و کۆتایی ژیانی جەنابت... سەرەتای بارگەوبنە پێچانەوەت و گەڕانەوەت بۆ خزمەت خوای گەورە چۆن بوو؟ من زۆر شتی دژ بە یەکم بیستووە... بۆیە پێمخۆشە لە زاری خۆتەوە بیبیستم...

+ چیت بیستووە کوڕم؟ ئادەی پێم بڵێ...

- قوربان سێ شتم بیستووە...

یەکەم: دەڵێن: جەنابت لەگەڵ پزیشکی بەناوبانگی عەرەب حارسی کوڕی کلدە پێکەوە حەڵوا و ئارد و ڕۆنتان خواردووە... لە کاتی حەڵواخواردندا حارس بە تۆی وتووە: قوربان دەست هەڵگرە و ئیتر مەخۆ... ئەم حەڵوایە ژەهری ساڵی تیایە... من و تۆ هەردووکمان لە کۆتا ڕۆژی ئەمساڵدا وەفات دەکەین و دەمرین...

دووەم: دەڵێن: سەرەتای نەخۆشی جەنابت لەوێوە دەستی پێ کرد کە جەنابت ڕۆژی دووشەممە حەوتی مانگی شەش خۆتت شۆردووە و ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سارد بووە، ئیتر جەنابت تووشی (تا) بووی... پانزە ڕۆژ (تا و لەرز)ت هەبووە، نەخۆشییەکەت ئەوەندە سەخت بووە نەتتوانیوە بەرنوێژی بکەی... فرمانت کردووە حەزرەتی عومەر بەرنوێژی کردووە... ئیتر هەتا جەنابت مردووی هەر حەزرەتی عومەر بەرنوێژی کردووە...

سێیەم: هۆکاری مردنت خەم و خەفەتخواردن بووە بۆ دووری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)... هەر بەو هۆیەوە جەنابت تووشی نەخۆشی (سیل) بووی... دوای ئەوەی خالیدی کوڕەی وەلید هاتووە بۆ عێراق ئیتر تۆ نەخۆش کەوتوی... لەو خانووەدا ماویتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دیاری کردبووی... دراوسێی ماڵی حەزرەتی عوسمانی کوڕی

عەففان بووی... بۆیە حەزرەتی عوسمان خزمەتێکی باشی جەنابتی کردووە، تۆش ماوەیەک ماویتەوە و ئیتر لە کۆتاییدا کۆچی دواییت کردووە و بۆ لای پەروەردگار گەڕاویتەوە...

+ باشە کوڕم با وەڵامت بدەمە...

یەکەم: هەرچی پەیوەندی بە حارسی کوڕی کلدەوە هەیە زۆر دوورە لە ڕاستییەوە...چونکە حارس زۆر ژیاوە... ئەو لە سەردەمی حوکمڕانی موعاویەدا کۆچی دوایی کردووە... یانی نزیکەی سی ساڵێک دوای من...

هەرچی پەیوەندی بە خەم و خەفەت خواردن لە دووری پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەیە، ئەوە تەنیا من خەم و خەفەتم بۆ نەخواردوە، بەڵکوو هەموو تاکێکی هاوەڵان ئەو خەم و خەفەتەیان هەبوو، بەڵام پێم ناڵێی: پەیوەندی چییە لەنێوان خەم و خەفەت و نەخۆشی سیل؟

من هەرگیز تووشی نەخۆشی سیل نەبووم...

قسەی ڕاست ئەوەیە کە من ڕۆژێکی زۆر سارد خۆمم شۆری... بۆیە تووشی نەخۆشی (تا و لەرز) بووم... پانزە ڕۆژ نەخۆش بووم... ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشییەکەم سەختتر دەبوو... لە کۆتاییدا بەو نەخۆشییە کۆچی دواییم کرد...

هەرچی لە بارەی عوسمانیشەوە بیستووتە ئەوە ڕاستە... ئەو لە هەموو کەس زیاتر خزمەتی کردم، چونکە دراوسێ بووین و ماڵمان نزیک ماڵی یەکتر بوو...

- قوربان دەمەوێ لە بارەی ئەوەوە پرسیارت لێ بکەم، لە پاش جەنابت چۆن حەزرەتی عومەر بوو بە خەلیفە؟

+ دوای ئەوەی نەخۆشی زۆری بۆ هێنام و زانیم مردن لێم نزیک بووەتەوە، خەڵکەم کۆ کردەوە و پێموتن: خۆ دەبینن چیم

بەسەر هاتووە... من وا دەزانم مردن لێم نزیک بووەتەوە هاکا مردم... ئیتر خوای گەورە لەو گفت و بەڵێنەی کە ئێوە بە منتان داوە و من پێمداون ڕزگارم دەکات... خۆتان کێتان پێخۆشە بیکەن بە خەلیفە بۆ خۆتان... ئێستا خۆم زیندوو بم و کەسێک هەڵبژێرن و لەسەری ڕێک بکەون، لەوە باشترە من بمرم و دوای من ناکۆک بن...

- بە خوا قوربان ڕایەکی جوانت هەبوو... هەڵبژاردنت هەواڵەی خۆیان کرد... دەی قوربان دوایی چی ڕوویدا؟

+ منیان بەجێهێشت و ڕۆیشتن، بەڵام ڕێنەکەوتن لەسەر ئەوەی کەسێک هەڵبژێرن... بۆیە گەڕانەوە بۆ لای من و وتیان: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێمان باشە تۆ خۆت کارەکە یەکلایی بکەیتەوە و کەسێک دیاری بکەی...

منیش وتم: دەی مۆڵەتم پێ بدەن تا بیرێکی لێ دەکەمەوە...

- ئەی قوربان دوایی چیت کرد؟

+ بانگی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفم کرد. لێمپرسی وتم: لە بارەی عومەری کوڕی خەتتابەوە چی دەزانی پێم بڵێ...

عەبدولڕەحمان وتی: دەی قوربان خۆ لە بارەی هەر شتێکی عومەرەوە لە من بپرسی خۆت لە من باشتر وەڵامەکەی دەزانی...

منیش وتم: با واشبێ، من پێم خۆشە لە زاری کەسێکی ترەوە بیبیستم...

عەبدولڕەحمان وتی: بە خوا عومەر لەوە باشترە جەنابت بیری لێ دەکەیتەوە...

دوایی بانگی عوسمانی کوڕی عەففانم کرد... پێموت: لە بارەی عومەرەوە چی دەزانی پێم بڵێ...

عوسمان وتی: جا خۆ قوربان خۆت لە من باشتر دەیناسی...

منیش وتم: دەزانم، بەڵام دەمەوێ لە زاری تۆوە بیبیستم...

عوسمان وتی: من هەر ئەوەندەی لێ دەزانم کە دیوی شاراوەی عومەر لە دیوی ئاشکرای عومەر چاکتر و باشترە... ئێمە کەسێکمان تێدا نییە وەک عومەر بێ...

منیش وتم: ئای ڕەحمەتی خوات لێبێ...

- ئەی قوربان دوایی چی ڕوویدا؟

+ دوای ئەوە ڕاوێژم بە چەند کەسێک کرد... لەوانە:

سەعیدی کوڕی زەید...

ئوسەیدی کوڕی حوزەیر...

جگە لەو دوانە ڕاوێژم بە چەند کەسێکی کۆچەری و چەند کەسێکی ئەنصاریش کرد...

ئوسەیدی کوڕی حوزەیر وتی: بە خوا دوای تۆ کەس لەو باشتر نییە... بە ڕەزای خوا ڕازییە... لەو شتانە تووڕەیە کە خوا لێی تووڕەیە... دیوی شاراوەی لە دیوی ئاشکرای جوانتر و باشترە... بە خوا هیچ کەسێ ئەم کارە ناگرێتە دەست لەو بەهێزتر و باشتر بێ...

- قوربان هەمووان ڕازی بوون کە جەنابت حەزرەتی عومەر بکەی بە جێگری خۆت، یان دەنگی ناڕازیش هەبوو؟

+ هەندێ لە هاوەڵان زانیبوویان کە من بانگی عەبدولڕەحمان و عوسمان و چەند کەسێکی ترم کردووە، بۆیە ئەوانیش هاتن بۆ لام... طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا وتی: باشە ئەگەر سبەی خوا لێی پرسیت: بۆ عومەرت کردە جێگری خۆت؟ چۆن وەڵامی خوای گەورە دەدەیتەوە؟ خۆ تۆ خۆت دەزانی عومەر چەندێ توندوتیژە... ئەگەر ببێ بە خەلیفە ئەوەندەیتر توندوتیژ دەبێ...

- ئەی قوربان تۆ چۆن وەڵامی طەڵحەت دایەوە؟

+ ئەو کاتە طەڵحە ئەو قسانەی کرد من لەسەر جێ کەوتبووم... وتم: ئا ڕاستم بکەنەوە... ڕاستیان کردمەوە... بە ئامادەبووانم وت: ئەوە ئێوە دەمترسێنن؟ کەسێ بترسێنن کە ستەمتان لێ بکات... ئەگەر سبەی خوای گەورە لێی پرسیم، منیش وەڵامی خوای گەورە دەدەمەوە و دەڵێم: خوایە بە خوا من باشترین کەسم کرد بە خەلیفە... خوایە ئەوە عەرزی تۆم کرد بە ئەوانیتری بگەیەنە...

- دەی قوربان ئەوانەی کە ناڕازی بوون، بۆچی ناڕازی بوون؟

+ عومەر لە چاو مندا زۆر توندوتیژ بوو... ئەو دەیزانی من نەرمونیانم بۆیە ئەو توندوتیژ بوو... مەبەستیشی ئەوەبوو بەو توندوتیژییەی خۆی نەرمونیانییەکەی من ڕێک بکاتەوە... ئەوان دەترسان ئەگەر ببێ بە خەلیفە ئەوەندەی تر توندوتیژ ببێ... منیش باش دەمزانی عومەر توندە، بەڵام ستەمکار نەبوو... نەرم بوو، بەڵام لاواز نەبوو... منیش بەرچاوڕوونییەکم هەبوو بەرامبەر بە عومەر، بەرچاوڕوونییەکەیشم لە جێی خۆی بوو... بە خوا عومەر یەکێکە لە باشترین خەلیفەکانی سەر زەوی، نەک هەر ئەو دەمە، بەڵکوو بە درێژایی مێژوو... خوای گەورە بە هۆی عومەرەوە ئەم ئایینەی بەهێز کرد... شیرک و بتپەرستی لاواز کرد...

- بە خوا ڕاستە قوربان وایە کە جەنابت دەیڵێی... بە خوا حەزرەتی عومەر چاکترین جێگرەوەی کەسانی پێش خۆی بوو... ئەو بوو بە تەواوکەری خەلیفایەتیەکەی جەنابت... ئەو وەکو گوڵاوێکی سەربەمۆری خەلیفایەتیەکەی جەنابت بوو...

+ ڕاست دەڵێی کوڕم وابوو...

- دەی قوربان دواتر چی ڕوویدا؟

+ بانگی عوسمانی کوڕی عەففانم کرد و وتم: عوسمان بنووسە: بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان... ئەمە ئەو شتەیە کە ئەبوبەکری

کوڕی ئەبوقوحافە لە کاتی بەجێهێشتنی دونیا و سەرەتای ڕۆیشتن بۆ پەسڵان دەیەوێت... ئەو دەمەی کە کافرانیش بڕوا بە هەموو شتێک دەکەن... خراپەکاران دەیانەوێ باش ببن... درۆزنەکان ڕاستگۆ دەبن... من عومەرم کرد بە خەلیفە و سەرۆکتان...

پێش ئەوەی من ناوی عومەر بێنم، بوورامەوە و هۆشم بە خۆمەوە نەما... عوسمان خۆی نووسیی: من دوای خۆم عومەری کوڕی خەتتاب دەکەم بە خەلیفە و سەرۆکتان...

دوای ئەوەی هۆشم هاتەوە، بە عوسمانم وت: چیت نووسیوە بۆم بخوێنەوە...

عوسمان بۆ منی خوێندەوە، کە گوێم لە ناوی عومەر بوو وتم: الله اکبر...

دوایی پێموت: وابزانم ترسای من بمرم بۆیە بەپەلە ناوی عومەرت نووسی بۆ ئەوەی دوای من کێشە و ئاژاوە دروست نەبێ؟ خوا پاداشتت بداتەوە... بە خوا شایانی ئەوە بووی ئەو نووسینەت پێ بسپێرم...

دوایی وتم: ئادەی با تەواوی بکەین... بنووسە:

گوێڕایەڵی عومەر بن و لە ڕای دەرمەچن... بە خوا من بەرامبەر خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) و ئایینی ئیسلام و خۆم و ئێوەیش کەمتەرخەمیم نەنواند... ئەگەر عومەر دادگەر بوو، هەر واش دەبێ و دادگەرە، ئەوە باش... ئەگەریش وانەبوو ئەوە تاوانی هەرکەسێ لە ئەستۆی خۆیەتی... من جگە لە خێر و چاکە هیچم نەویستووە و ئاگام لە غەیب و بەرپیوارانیش نییە... ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ الشعراء: ٢٢٧ ناهەقانیش زۆری پێ ناچێ لەوە دەگەن کە سەرەنجام کێوە دەچن... سڵاو و ڕەحمەتی خوای گەورە لەسەر هەموو لایەک...

**دوایی فرمانم کرد نووسراوەکەی داخست... بە داخراوی بردی بۆ لای خەڵک... بە خەڵکەکەی وت:**

**خەڵکینە... ئێوە پەیمان دەدەن بەو کەسەی کە ناوی لەم نووسراوەدا هاتووە؟**

هەمووان وتیان: بەڵێ...

ئەویش بۆ هەمووانی خوێندەوە و هەمووان ڕازی بوون و پەیمانیان بە عومەر دا...

- ئەی قوربان دوایی چیت کرد؟

+ دەستەکانم بەرز کردەوە و دەستم کرد بە نزا و پاڕانەوە و وتم: پەروەردگارا... تەنیا مەبەستی من چاکسازییە... دەترسام تووشی دووبەرەکی و شەڕ و ئاژاوە ببن... بۆیە ئەو کارەم کرد کە تۆ خۆت باشتر لە من لێی دەزانی... ڕا و بۆچوونی خۆمم بەکار هێنا... باشترین و بەهێزترین کەسیانم کرد بە خەلیفە... ئەوەتا ئەوەی کە ویستی تۆی لەسەرە بەرۆکی گرتووم... خوایە لە باتی من کەسێکی تر دابنێ... ئەوانەش هەموویان بەندەی خۆتن... کاروباریان بە دەست خۆتە... خوایە سەرکردەکەیان چاک و باش بکە... بیکە بە یەکێک لە خەلیفە باشە کاردروستەکان... خوایە خەڵکەکەش بۆ خەلیفە گوێڕایەڵ بکە...

- ئەی قوربان هیچ ئامۆژگارییەکت بۆ حەزرەتی عومەر هەبوو؟

+ بێگومان هەمبوو...

- چ ئامۆژگارییەکت کرد؟

+ پێمگوت: عومەر لێم نزیک ببەرەوە... کاتێ نزیک بوویەوە وتم: عومەر! من تۆم کردووە بە خەلیفە... ئامۆژگاریت دەکەم کە هەمیشە ترسی خوای گەورەت لە دڵدا بێ... عومەر! ئەوەش بزانە خوای گەورە هەندێ داوای لە شەودا هەیە لە ڕۆژدا وەریناگرێ و هەندێ

داوای لە ڕۆژدا هەیە لە شەودا وەریناگرێ، جا بزانە هیچ کارێکی سوننەتت لێ وەرناگیرێ تا فەرزەکانت بە تەواوی بەجێ نەهێنابێت، ئەو کەسانەی کە لە قیامەتدا تای ترازووی چاکەیان قورس ئەبێ ئەوە بە شوێنکەوتنی ڕاستی قورس بووە، ئەو تای ترازووەی کە تەنها ڕاستی پێ ئەکێشرێ مافی خۆیەتی کە قورس بێ، ئەو کەسانەشی کە لە قیامەتدا تای ترازوویان سووکە ئەوە بەهۆی شوێنکەوتنی لارە ڕێ و ناڕەواوە سووک بووە، ئەو تای ترازووەش کە تەنها ناڕەوایەتی پێ ئەکێشرێ مافی خۆیەتی کە سووک بێ، خوای گەورە بۆیە باسی بەهەشتییەکان بە چاکە ئەکات، چونکە چاک بوون، (تای ترازووی چاکەیان قورستر بووە) ئیتر ئەویش چاوپۆشی لە خراپەکانیان ئەکا، هەرکات باسی ئەو بەهەشتیانەت کرد بڵێ: زۆر ئەترسم من یەکێک نەبم لەو کەسانە! خوای گەورە لە هەندێ ئایەتدا باسی سۆز و بەزەیی خۆی ئەکا و لە هەندێ ئایەتی تردا باسی سزا و خەشمی خۆی ئەکا، ئەوەش لەبەر ئەوەی بەندەکانی هەم لێی بترسین و هەم هیواشیان پێی هەبێ، لە هەق زیاتر هیچی تر لە خوا چاوەڕوان ناکرێ، کەس بە دەستی خوای گەورە ناخریتە نێو فەتەرات و بەلاوە، ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانەی منت وەرگرت ئەوا هیچ بەرپیوار و نادیاریکت هێندەی مردن خۆش ناوێ و هەرگیز ناتوانی مردن بێهێز و دەسەڵات بکەی.

- بە خوا قوربان ئەم ئامۆژگاریانە ئامۆژگاری کەسێکە کە بیەوێ ماڵئاوایی بکات... ڕاستترین قسەی مرۆڤیش لەو کاتەدایە کە خەریکە ئەم دونیایە بەجێ دێڵێ و بەرەو دونیای هەرمان مللی ڕێگا دەگریتە بەر... قوربان جەنابت لە دونیادا ڕاستگۆ بووی... ئیتر چۆن لە کاتی ماڵئاواییدا ڕاستگۆ نابی؟ بەڵام قوربان دەکرێ هەندێ پرسیارت لە بارەی ئەو ئامۆژگارییەوە لێ بکەم؟

+ بۆ نا؟ فەرموو چ پرسیاریکت هەیە بیکە...

– بۆچی وەسیەتەکەت بە (ئەی عومەر ئامۆژگاریت ئەکەم هەمیشە ترسی خوات لە دڵدا بێت) دەست پێ کرد؟

+ چونکە ئەمزانی دەسەڵاتوەرگرتن تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەختە، زۆربەی خەڵک لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرناچن، کابرای دەسەڵاتدار هێز و پارەی لە بەردەستایە، خەڵک بەرامبەر دەسەڵاتدار لاواز و بێهێزن، زۆر کەمن ئەو کەسانەی کە پارە و هێزیان هەبێ و نەبنە تاغوت، من ویستم بە بیری بێنمەوە کە خوای گەورە ئاگاداری هەموو کارەکانیەتی و لێی ئەپرسێ بزانێ لە کاتێکدا لە لووتکەی دەسەڵاتایە چی ئەکا؟ ئەو پارە و سامانەی لە بەردەستیایە چۆنی بەکار دێنێ و خەرجی ئەکا؟ چۆن لە تەک ئەو خەڵکەی کە لەژێر دەستیایە ئەجووڵێتەوە؟ دەسەڵاتدار شیاوترین کەسە کە بیترسێنی و خوای وەبیر بهێنیتەوە، چونکە جگە لە خوا کەس لە دەسەڵاتدار مەزنتر نییە، خەڵک بۆیە لە دەسەڵاتدار ئەترسێ، چونکە هێزی هەیە، بۆیە خۆی لە دەسەڵاتدار نزیک ئەکاتەوە، چونکە سەروەت و سامانی هەیە، بەڵام خودی دەسەڵاتدار هیچ کەسێکی لەو مەزنتر نییە تا لێی بترسێ، هیچ سەروەت و سامانێک بە ئەندازەی ئەو سەروەت و سامانە نابێ کە لەژێر دەستی ئەودایە تا خۆی لێ نزیک بکاتەوە، بۆیە ویستم هەمیشە خودای لە بیر بێت و لێی بترسێ و لە هەموو کار و وتارێکیدا وا بزانێ خوا ئەیبینێ.

– ئەی مەبەستت لە (خوای گەورە هەندێ داوای لە شەودا هەیە لە ڕۆژدا وەریناگرێ، و هەندێ داوای لە ڕۆژدا هەیە لە شەودا وەریناگرێ) چی بوو؟

+ ویستم پێی بڵێم: نەکەی بە گوێرەی ڕەفتار و کرداری خەڵک هەڵسوکەوت بکەیت و دینی خۆتت لە بیر بچێ، تۆش بەندەیەکی

لە بەندەکانی خوا، خوای گەورە هەندێ کار و پەرستشی لە سەرت فەرز کردووە، نەکەی لەبەر کاروباری خەلافەت ئەو فەرزانە لە بیر بکەی، ویستم پێی بڵێم: ئاگاداری نوێژ و ڕۆژووەکانت بە، خەڵک لەسەر ئایینی دەسەڵاتدارە، ئەگەر دەسەڵاتدار چاک و پاک و لەخواترس بوو، خەڵکیش وا ئەبن...

ئەگەر تێکۆشەر و خەباتکار بێت، خەڵکیش تێکۆشەر و خەباتکار ئەبن...

ئەگەر هەمیشە بیری قیامەتی لە دڵدا بێ، ئەوانیش بیری قیامەتیان لە دڵدا ئەبێ... ئەگەریش گەندەڵ و فەسادکار بێت، زۆربەی ئەوانیش گەندەڵ و فەسادکار ئەبن... سەرکردە ناوی خۆی بە خۆیەوەیە وەک سەری گەل وایە، گەلیش وەک جەستە وان، سەرکردە بەرەو هەرکوێ و هەرچۆن بڕوات جەستەش بەرەو ئەو شوێنە و بەو جۆرە ئەڕوات.

- ئەی مەبەستت لە (هیچ کارێکی سوننەتت لێ وەرناگیری تا فەرزەکانت بە تەواوی بەجێ نەهێنابێ) چی بوو؟

- ویستم پێی بڵێم: لای خوا هیچ کار و کردەوەیەک بە ئەندازەی ئەو کار و کردەوانە خۆشەویست نین کە خۆی لەسەر بەندەکانی فەرز کردووە، هەر بەندەیەک سوننەتەکان بکات و فەرزەکان پشتگوێ بخا، ئەوە تەنیا خۆماندوکردنی بۆ ئەمێنێتەوە، خۆ ئەگەر فەرزیش و سوننەتیشی ئەنجام دا ئەوە نووری عەلا نوورە و هەرچی خێر هەیە هەمووی دەستگیر بووە، ئەگەر کەسێک بە قەستی ڕۆژێک ڕۆژووی ڕەمەزانی خوارد و نەیگرت یانزە مانگ بەڕۆژوو بێ، جێگەی ئەو یەک ڕۆژە ڕۆژووەی ڕەمەزان پڕ ناکاتەوە... ئەگەر نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکا خێری لە شەونوێژی سەرتاسەری شەو زیاترە... ئەگەر هەزار سەدەقە بدات بە ئەندازەی زەکاتێک

**خێری نییە هەرچەندە سەدەقەکانیش زۆر لەو زەکاتە زیاتر بێت، چونکە سەدەقە سوننەتە، بەڵام زەکات فەرزە...**

**- ویستم پێی بڵێم: کە خوای گەورە هەندێ شتی لەسەر سەرکردە فەرز کردووە ئەگەر ئەو شتانە نەکا هەر شتێکی تر بکا بێسوودە، ئەگەر سەد جار لە فەرزەکە زیاتریش بێ... خوای گەورە فرمانی کردووە کە داهات بە یەکسانی لەنێوان خەڵکدا بەش بکرێت، ئەگەر سەرکردە ئەو داهاتەی بۆ خۆی برد و دوایی زۆر لەوە زیاتری کردە خێر، بێسوودە و تاوان و گوناه نەبێ هیچی تری گیر نابێ، چونکە مافی بە خاوەن ماف نەداوە، ئەوە وەک ئەوە وایە مافی خەڵکی بخوات و دوایی بەخشندەیی بکا!**

- ئەی قوربان مەبەستت لە (خوای گەورە لە هەندێ ئایەتدا باسی سۆز و بەزەیی خۆی ئەکا و لە هەندێ ئایەتی تردا باسی سزا و خەشمی خۆی ئەکا ئەوەش لەبەر ئەوەی بەندەکانی هەم لێی بترسین و هەم هیواشیان پێی هەبێ، لە هەق زیاتر هیچی تر لە خوا چاوەڕوان ناکرێ، کەس بە دەستی خوای گەورە ناخرێتە نێو فەتەرات و بەلاوە) چی بوو؟

+ مەبەستم ئەوە بوو کە: قورئان ئەوەندەی یەک ترس و هیوا، ئەڤین و خۆفی باس کردووە، چونکە ئەگەر هەر باسی ترسی کردبا، دڵی باوەڕداران لە ترسا ئەتۆقی و زەندەقیان ئەچوو، ئیتر ئەو کاتە خواپەرستی وەک بێگاری ئاغایەکی زاڵمی لێ ئەهات... ئەگەریش تەنیا باسی هیوا و ئەڤینی کردبا خواپەرستی وەک کاری ئەو کۆیلەیەی لێ ئەهات کە خاوەنەکەی ئەونە بەسۆزە کۆیلەکەی ئیستیغلالی ئەو سۆزەی کردووە و گوێ بە فرمانەکانی نادا، خوا دەیەوێ بەندەکانی لێی بترسن و خۆشیشیان بوێ، لێی بترسن و چاوەڕوانی پاداشتیشی لێ بکەن، خوا دەسەڵاتی هەموو جۆرە

سزادانێکی هەیە کەچی باسی لێبووردەیی و سۆزی خۆیشی ئەکا، لەگەڵ ئەوەی کە زۆردارە خاوەن سۆزیشە، ئەو ئەیەوێ بەدەم ترس و خۆشەویستییەوە بەندایەتی بۆ بکەین، خوا پێی خۆشە لێی بترسین، پێی خۆشە خۆشمان بووێ.

- بە خوا قوربان ئامۆژگارییەکەت ئامۆژگارییەکی گەلێک مەزن بوو...

+ دوور لە بەڵا بیت کورم...

- خوای گەورە لێت ببوورێ و پلە و پایەت بەرزتر بکاتەوە قوربان... قوربان ئێستا پێم بڵێ: هیچ وەسیەت و ئامۆژگاریت بۆ ماڵ و منداڵەکانی خۆت هەبوو؟

+ بێگومان کورم... بۆ دەبێ ئامۆژگاری خەڵک و خەلیفەکەی دوای خۆم بکەم و ماڵ و منداڵی خۆم لە بیر بچێ؟

- قوربان چ ئامۆژگارییەکی ئەوانت کرد؟

+ هەموو منداڵەکانم بانگ کرد و پێموتن: من چەندێ لەسەر دەسەڵات بووم، نە دینارێ، نە دیرهەمی کەسێکم نەخوارد... لەو ماوەدا زبرتین جلوبەرگمان لەبەر کردووە... ناخۆشترین خواردنمان خواردووە... دوای مردنم سەروەت و سامانەکەم بژمێرن، بزانن دوای ئەوەی دەسەڵاتم گرتە دەست تا ئێستا چ شتێکم زیادی کردووە، هەموو ئەو زیادەیە ببەن و بیدەن بە دەست خەلیفەی دوای من، بۆ ئەوەی لە کۆڵ من ببێتەوە...

- دەی قوربان ئەوان چییان کرد؟

+ دوای مردنم ماڵ و منداڵەکانم هەموو سەروەت و سامانەکەی منیان ژمارد... کۆیلەیەکی هاوبەشم بوو، هی من و پیاوێکی تر بوو، شەریک بووین، بۆ ئەوەی ئەو کۆیلەیە لەو ڕۆژانە کە سەرەی منە بێ بۆ لام و خزمەتم بکا... وشترێکیشم بوو سواری دەبووم

و کاروباری خەڵکیم پێ بەڕێ دەکرد... چۆشاکێکی قەیفەیشم بوو لەبەرم دەکرد... ئەوانە ئەو شتانە بوون کە زیادیان کردبوو... هەموویان نارد بۆ لای عومەر... کاتێ شتەکانیان بۆ بردبوو چاوی پێیان کەوتبوو، دەستی کردبوو بە گریان... ئەوەندە گریابوو فرمێسک بە ڕیشیدا چۆڕابوو، وتبووی: خوا ڕەحمەت پێ بکا ئەبوبەکر! بە خوا کەسانی دوای خۆت سەخڵەت کردووە و ئێمە وەک تۆمان پێ ناکرێ...

دوایی بە خزمەتکارەکەی وتبوو: هەموویان بخەرە سەر خەزێنەی دەوڵەت...

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتبووی: پاک و بێگەردی بۆ خوا! ئەوە نیوە کۆیلەیەک و وشترێک و دەستێ جلوبەرگ کە پێنج دیرهەم زیاتر ناهێنێ، لە ماڵ و منداڵەکەی ئەبوبەکر وەردەگریتەوە؟

عومەر وتبووی: ئەی تۆ دەڵێی چی لێ بکەم؟

عەبدودولڕەحمان وتبووی: بیگەڕێنەوە بۆ ماڵ و منداڵەکەی ئەبوبەکر...

عومەر پێی وتبوو: بەو خوایەی موحەممەدی کرد بە پێغەمبەر و ناردی بۆ ئێمە، هەرگیز شتی وا لە سەردەمی دەسەڵاتی مندا ڕوونادا... ئەبوبەکر لە کاتی سەرەمەرگدا ئەو شتانە لە ماڵ و منداڵی دوور بخاتەوە و من بۆیان بنێرمەوە؟

- باشە قوربان دوای ئەوەی کە وەفاتت کرد و ماڵئاواییت کرد، بە چی جەنابتیان کفن کرد؟

+ لە عایشەم پرسی: پێغەمبەرتان(ﷺ) بە چەند پارچە کفن کرد...

وتی: سێ پارچەی سپی یەمانی... نە کراسی تیابوو، نە مێزەر...

پێمگوت: دەی ئەگەر من مردم ئەم دەستە جلەی خۆم بشۆن و بیکەن بە کفن بۆم...

عایشە وتی: باوکە گیان! خوای گەورە بایی ئەوەندەی پێداوین کفنی نوێ و تازەت بۆ بکڕین...

منیش وتم: کچم! زیندووەکان پێویستیان بە جلوبەرگی نوێیە... مردوو جلوبەرگی نوێی بۆ چییە؟ مردوو خۆی دەبێ بە خاک و نامێنێ...

- یانی قوربان پێت خەسار و حەیف بوو قوماشی نوێ بکڕن و بیکەن بە کفنت؟

+ کوڕم! نە کفنی نوێ سوودی بۆم دەبوو، نە کفنی کۆن زیانی بۆم دەبوو... مرۆڤ بە کار و کردەوەی خۆی بە خزمەت خوای گەورە دەکات، نەک بە کفنی تازە یان کۆنە...

- ئەی قوربان چ کەسێک تۆی شۆری؟

+ وەسیەتم کرد ئەسمای کچی عومەیس کە ژنم بوو، بمشوا...

- ئەی لە بارەی شوێنی ناشتنەوە چی قوربان؟

+ وەسیەتم کرد و داوام لە عایشە کرد لە ژوورەکەی خۆیدا لە تەنیشت پێغەمبەردا(ﷺ) بمنێژن...

- دەک پیرۆزت بێ قوربان... هەم لە دونیادا هاوەڵی یەکتر بوون، هەم لە گۆڕیشدا... خۆزگەم بە خۆت... خۆزگەم بەو شوێنەت...

+ خوات لێ ڕازی بێ کوڕم... من دەبێ بڕۆم... هیچت پێویستە یان نە؟

- کورە قوربان نەک هەر من، بە خوا هەموو ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێویستمان بە جەنابتە...

+ کوڕم ئەوەندەم بەسە لە ژیانی دونیا... خوای گەورە خۆی چاودیری بەندەکانی دەکا... ئەم ئوممەتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا پەسڵان مرۆڤی چاک و کاری چاکی لێ نابڕێ...

دەی سڵاو و ڕەحمەتی خوای گەورەت لێبێ... وا من ڕۆیشتم...

- سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای گەورە وەک بارانی بەهار بە خوڕ بڕژێ بەسەر تۆیشدا گەورەم... بە خوا دڵم پڕ بووە... فرمێسک لە چاوەکانمدا قەتیس بووە... خەم و خەفەتی دووری لە جەنابت خەریکە دەمخنکێنێ...

چۆن هات هەر بەو جۆرەش ڕۆیی...

بۆن و بەرامەی بارانی سەرەتای پاییزی دەدا...

عەرەبێکی پاک و پوخت بوو...

ڕەقەکارێکی باڵابەرز... دەتگوت لاسکی گوڵەگەنمە...

لاقەکانی باریک و ڕێک... دەتگوت لاقی پیاوی خێرا و کۆڵنەدەرە...

بەڵام هەستت بەوە دەکرد ئەم پیاوە هێندە خێرایە، کەس ناتوانێ لێی پێشکەوێ...

دەموچاوی خڕ و سپی... دەتگوت مانگی شەوی چواردەی نیوەشەوی دەشت و سەحرا و بیابانە...

پشتی کەمێک چەماوە بوو... دەتگوت بە درێژایی ژیانی کۆڵێکی قورسی پێبووە...

لە نیگایڕا وا دەردەکەوت هیچ کەسێک ئەو کۆڵەی ئەوی پێ نابزوێ...

١٣- ٢٠٢٠/٩/٢٠

